# كِتَابُ السُّنَّةِ

مِنْ مَسَائِل

## حَرْبِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ الحَنظَلِيِّ الكِرْمَانِيِّ

(٢٨٠ هـ) رَحِمَهُ الله

وەرگێڕانی: هلال عبدالله عمر

# پێڕست

# پێشەکی



ئەم کتێبە ئیمامی حرب لە زانایانی وەکو [ئیمامی احمد بن حنبل، إسحاق بن راهويه، عبدالله بن الزبير الحميدي، سعيد بن منصور ...هتد] وە جگە لەوانەش، بیستویەتی و گێڕاویەتەوە .

وە دەربارەی عەقیدەیە هەربۆیە ناونراوە (السنة)، چونکە سەلەف بابەتەکانی تەوحید و عەقیدە ناویان دەنا (السنة) .

ئەم کتێبە پێکدێت لە **٣٩** باب .

وە ملحقەکەش پێکدێت لە **٢٢** باب .

هەریەکێک لەم باب ەنە تایبەت کراون بە بابەتێکی عەقیدەیی .

لە یەکەم باب وە لە یەکەم ئەثەر حرب ئاماژە بەوە دەکات کە ئەمە مەزهەبی زانایانی ئەهلی سوننەیە لە عیراق و حجاز و شام و وڵاتانی تریش، پاشان دەڵێت : هەرکەسێک پێچەوانەی ئەم عەقیدەیە بکات یان تانەی لێبدات یان تانە

له خاوەنەكەی بدات، ئەوا بیدعەچی و گومڕایە، وە لایداوە لە ڕێگا و مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعە .

وە دواتر باسی یەك بە یەكی عەقیدەی ئەهلی سوننە دەكات .

یەكێك لە بابەتە عقیدەیەكەیان باسكردنی گرووپە گومڕاكانە وەكو [جەهمی - مورجیئە - خەواریج - قەدەری - شیعە - الواقفة - ئەهلی ڕەئی - ڕافیزە - الخشبية - الزيدية - المنصورية - السبائية - اللفظية - البكرية - الشعوبية ...] .

كە ئایە لەچیدا پێچەوانەی ئەهلی سوننە بوون؟

وە ئەهلی سوننە هەڵوێستیان بەرامبەریان چۆن بوو؟

وە ئایە گەر وەكو ئەهلی سوننە نەكەیت بەرامبەریان ئەوا چیت پێ دەوترێ؟

بۆیە زۆر جەخت دەكرێتەوە لەسەر گرووپە گومڕاكان و ناسینیان بۆ ئەوەی وەكو ئەوان نەڵێیت و نەكەیت .

جا هەرچی لەم كتێبە هاتووە ئیجماعی ئەهلی سوننەی لەسەرە لەسەردەمی هاوەڵانەوە تاوەكو سەردەمی حرب، واتە هەر ئەثرێك كە حرب باسی دەكات ئیجماعی هەموو ئەو زانایانەی لەسەرە كە ناوی هێناون .

بۆیە ئاگاداربە کە عەقیدەکەت پێچەوانەی ئەهلی سوننە نەبێت، وە هەر خاڵێک پێچەوانەی عەقیدەکەت بوو ئەوا ڕێگاکەت بدۆزەوە چونکە بەڕاستی وەرگرتنی ئەثەرەکانی ئەم کتێبە پێویست بە مناقشە و مجادلە ناکات .

زۆرجار دەبینین لەو کتێبانەی سوننە یان هەر کتێبێکی تری سەلەف لە پێشەکیەکەیدا باس لە چاککردنی هەندێ دەستەواژە و لاپەڕە دەکات، کە لەچاپی پێشوودا هەڵەی لێکرابوو، سەرباری ئەوەی کە بەشێکی زۆریشی لێ فرۆشراون، بگرە هی ئەوان بە سەدان و زیاتر لێ دەفرۆشرێ، تەبعەن مەبەستم چاپە عربیەکەیەتی .

ئینجا بۆیە گەر ئەمە لە کتێبە کوردیەکانیشدا کە وەرگێڕاون ڕوودات، شتێکی ئاساییە، گرینگ چاککردنەکەیە .

إن شاء الله تعالى ئەو هەڵانەی کە دامانناوە لەکناڵ و ئاگادارمان کردوونەتەوە، وە بەدەسکاری و ڕێکخستنی تریشەوە، دووبارە کتێبی سوونەی ئیمامی حرب الكرماني رحمه الله دانراوەتەوە، ڕوونکردنەوەی بۆی زیادکراوە و بەشێکی دەسکاری کراوە .

## كورتەیەک لە ژیانی ئەم ئیمامە بەڕێزە :

ناوی : حرب ی كوڕی إسماعیل ی كوڕی خلف الحنظلي السيرجياني الكرماني يه، لە نزیک ساڵانی (١٩٠ هـ) ی هیجری لەدایک بووە .

وە لە ساڵی (٢٨٠ هـ) ی هیجری وەفاتی كردووە .

## مامۆستاكانی :

١ - أبو داود الطيالسي (٢٠٤ هـ) .

٢ - أبو بكر الحميدي عبد الله بن الزبير (٢١٩ هـ) .

٣ - سليمان بن حرب (٢٢٤ هـ) .

٤ - أبو عبيد القاسم بن سلام (٢٢٤ هـ) .

٥ - سعيد بن منصور (٢٢٧ هـ) .

٦ - علي بن المديني (٢٣٤ هـ) .

٧ - إسحاق بن راهويه (٢٣٨ هـ) .

٨ - وأبو ثور (٢٤٠ هـ) .

٩ - وعباس ابن عبد العظيم العنبري (٢٤٠ ﻫ) .

١٠ - وأحمد بن حنبل (٢٤١ ﻫ) .

١١ - وأحمد ابن نصر النيسابوري (٢٤٥ ﻫ) .

١٢ - وأبو داود السجستاني (٢٧٥ ﻫ) .

١٣ - وأبو حاتم الرازي (٢٧٧ ﻫ) .

١٤ - وأبو زرعة الدمشقي (٢٨١ ﻫ) رحمهم الله تعالى، وه جگه لهمانيش .

## قوتابييه كانى بريتين له :

١ - الخلال أحمد بن محمد بن هارون (٣١١ ﻫ)، خاوهن كتابى [**السنة**] .

٢ - أبو محمد ابن أبي حاتم المروزي (٣٢٧ ﻫ)، خاوهن كتابى [**الجرح والتعديل**] .

٣ - القاسم بن محمد الكرماني .

٤ - عيسى بن محمد بن سعيد .

٥ - عبد الله بن إسحاق النهاوندي .

٦ - عبد الله بن يعقوب الكرماني .

٧ - عمر بن الحسين بن عبد الله بن أحمد أبو القاسم الخرقي رحمهم الله تعالى، وه جگه لهمانهش .

## باب : (١)

## باب القول بالمذهب

## دەربارەی قسەکردن بە مذهب



قال أبو القاسم : حدثنا أبو محمد حرب بن إسماعيل، قال :

١ - هذا مذهبُ أئمّةِ العلمِ، وأصحاب الأثرِ، وأهلِ السُّنَّةِ المعروفين بها، المُقتدَى بهم فيها، [مِن لدُن أصحاب النبيِّ إلى يومنا هذا] .

وأدركتُ مَن أدركتُ مِن عُلماءِ أهلِ العراقِ، والحِجازِ، والشَّامِ وغيرهم عليها .

فمن خالف شيئًا مِن هذه المذاهبِ، أو طعنَ فيها، أو عابَ قائلها، فهو مُخالِفٌ مُبتدعٌ، خارجٌ مِن الجماعةِ، زائلٌ عن منهجِ السُّنَّةِ وسبيلِ الحقِّ .

وهو مذهبُ : أحمدَ، وإسحاقَ بن إبراهيم بن مخلد، وعبد الله بن الزُّبير الحُميدي، وسعيد بن منصور، وغيرهم ممن جالسنا، وأخذنا عنهم العلمَ، فكان مِن قولِهم :

أبو القاسم وتی : أبو محمد حرب بن إسماعيل بۆی گێڕاينەوه ووتی :

١ - ئەمە ڕێباز و بیروباوەڕی پێشەوایانی ئەهلی عیلم و خاوەن أثر و ئەهلی سوننەیە کە پێی ناسراون، ئەوانەی کەوا چاویان لێدەکرێت و دەکرێنە پێشەنگ تیایدا، لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان .

وە گەیشتم بەوانەی پێیان گەیشتم لە زانایانی خەڵکی عێراق و حیجاز و شام و جگە لەوانەش گشتیان کە پێیان گەیشتم و لێیانم وەرگرت لەسەر ئەو بیروباوەڕە بوون - واتە ئەو قسانەی کە دەیکەم لە لاپەڕەکانی داهاتوو گشتیان بیروباوەڕی ئەم زانایانەیە کە پێیان گەیشتووم لە عێراق و حیجاز و شام و جگە لەوانەش - .

بۆیە هەر کەسێک شتێک بکات پێچەوانەی ئەم ڕێبازانە، یان تانەیان لێ بدات، یان عەیبێک بگرێت لە بێژەرەکەی، ئەوا ئەو کەسە پێچەوانیکارە، مبتدع ە - واتە کەسێکی داهێنەرە و شتێکی نوێی لە دین داهێناوە - ، ئەوا چووەتە دەرەوەی لە کۆمەڵەی مسوڵمانان، لاچووە لەسەر ڕێباز و مەنهەجی ئەهلی سوننە و ڕێگەی حەق .

ئەمەش ڕێبازی أحمد بن حنبل و إسحاق بن إبراهيم مخلد و عبد الله بن زبير الحميدي و سعيد بن منصور ە، وە جگە لەوانەی کە لەگەڵیان دانیشتووین و زانستمان لێیانەوە وەرگرتووە، لە وتەکانیان ئەوە بووە کە :

٢ - الإيمانُ : قولٌ، وعملٌ، ونِيّةٌ، وتمسُّكٌ بالسُّنَّةِ .

٢ - ئیمان وتە و کردەوە و نیەت و دەستگرتنە بە سوننەت .

وتە ئەبێتە دوو جۆر :

١ - وتەی دڵ : کە بریتیە لەوەی دانی پێدابنێ بەو بیروباوەڕەی کە لەدڵیدایە .

٢ - وتەی زوبان : کە بریتییە لەوەی بەڕاشکاوی ئەو بیروباوەڕە بەزوبان دەرببڕێت .

کردەوە ئەبێتە دوو جۆر :

١ - کردەوەی دڵ : واتە ئەو بیروباوەڕەی لەدڵیدایە دووپاتی بکاتەوە،

وەکو : پشت بەستن بەاللە، خۆ زەلیل کردن، ترسان لەسزاکانی اللە، ئومێدبوون بەاللە، ...هتد .

٢ - کردەوەی لاشە : واتە بەلاشە ئەو بیروباوەڕە دەربخەیت .

وەکو : ئەنجامدانی پێنج نوێژە فەرزەکە، وە ڕۆژوو گرتن، جیهاد کردن، حەج کردن، ...هتد .

نیەت : لەکارەکاندا نیەت زۆر گرینگە چونکە هیچ کارێکی چاک بەبێ نیەتێکی پاک وەرناگیرێ .

دەست گرتن بەسوننەت : واتە ئەو کارانەی ئەنجامی دەدەیت ئەبێت لەگەڵ سوننەتدا موافەق بێت، ئەگینا ئەبێتە داهێنراو [بیدعە]، وە کارەکان بۆئەوەی قبوڵ بێت لای اللە دەبێت دوو مەرجی تێدابێت :

١ - الإخلاص : واتە ئەبێت تەنیا لەپێناو اللە ئەنجامی بدەیت بەدڵسۆزیەوە .

٢ - شوێنکەوتەی سوننەت بێت : واتە ئەبێت موافقەی سوننەت بێت، لە سوننەت باس کرابێ

٣ - والإيمانُ يزيدُ وينقُصُ .

٣ - وە ئیمان زیاد و کەم دەکات .

: پێچەوانەی گرووپی مورجیئەکان کە ئەمە ڕەت دەکەنەوە .

٤ - ويُستثنى في الإيمانِ غير أن يكون الاستثناءُ شكًّا، إنَّما هي سُنَّةٌ ماضِيةٌ عن العُلماءِ .

٤ - وە إستثناء ئەکرێ لە ئیماندا - واتە ئیمانت بگەڕێنێتەوە بۆ لای اللە، هەر وەکو چۆن بەهەشتی و دۆزەخی بوونت ئەگەڕێنیتەوە بۆلای اللە،

بەڵام ئەمە جیایە لە وتنی : من مسوڵمانم، چونکە دەکرێت گەر کەسێک لێت بپرسێت ئایا مسوڵمانیت؟ تۆش بڵێیت : بەڵێ - ، جگە لەوەی نابێ إستثناء ەکە بەگومانەوە بێت، بەڕاستی ئەمە سوننەتێکی تێپەڕیوە لە زانایانەوە - واتە لەهەر زووەوە زانایان ئەمە سوننەتیان بووە کە ئیمانەکەیان بۆ لای اللە بگەڕێننەوە بەبێ ئەوەی بەگومانەوە بیلێن - .

٥ - وإذا سُئِلَ الرَّجلُ : أمؤمنٌ أنت؟ فإنه يقول :

أ - أنا مؤمنٌ إن شاء الله .

ب - أو مؤمنٌ أرجو .

ج - أو يقولُ : آمنتُ بالله، وملائكته، وكتبه، ورُسُلِهِ .

٥ - ئەگەر کەسێک پرسیاری لێکرا، ئایا تۆ ئیمانداری؟ ئەوا دەڵێت :

أ - من بڕوادارم إن شاء الله .

ب - یاخود ئومێدەوارم ئیماندارېم .

ج - یاخود دەڵێت : بڕوام هێناوە بە الله، و فریشتەکانی، و کتێبەکانی و نێردراوەکانی .

٦ - ومَن زعمَ أنَّ الإيمانَ قولٌ بلا عملٍ فهو مُرجئ .

٦ - هەر کەسێک پێی وابێت کەوا ئیمان وتەیە بەبێ کردەوە، ئەوا ئەو کەسە مورجیئەیە .

٧ - ومَن زعمَ أنَّ الإيمان هو القولُ، والأعمالُ شرائع فهو مُرجئ .

٧ - وە هەر کەسێک پێی وابێت کەوا ئیمان وتەیە، و کردارەکان تەواوکەری ئیمان ن، ئەوا ئەو کەسە مورجیئەیە .

٨ - وإن زعمَ أنَّ الإيمان لا يزيدُ ولا ينقصُ، فهو مُرجئ .

٨ - وه هەر كەسێك پێی وابێت كەوا ئیمان زیاد ناكات وه كەمیش ناكات، ئەوا ئەو كەسە مورجیئەیه .

٩ - وإن قال : إنَّ الإيمان يزيدُ ولا ينقُصُ فقد قال بقولِ المُرجِئة .

٩ - وه ئەگەر ووتی : ئیمان زیاد دەكات بەڵام كەم ناكات، ئەوا بە وتەی مورجیئە قسەی كردووه - واتە هەمان قسەی مورجیئەی كردووه - .

١٠ - ومَن لم يرَ الاستثناءَ في الإيمانِ فهو مُرجئ .

١٠ - وه هەر كەسێك إستثناء لە ئیمان دا بە درووست نەزانێت، ئەوا مورجیئەیه .

١١ - ومَن زعمَ أنَّ إيمانهُ كإيمان جبريل أو الملائكة فهو مُرجئ، وأخبثُ مِن المُرجئ فهو كاذِب .

١١ - وه هەر كەسێك پێی وابێت كەوا ئیمان ی وەك ئیمان ی جبریلە یان وەك فریشتەكانە، ئەوا ئەو كەسە مورجیئەیە بەڵكو خراپترە لە مورجیئە، ئەوا

كەسێكی درۆزنە - چونكە مورجیئەكان ئیمانیان وەكو ئیمانی فریشتەكان هەژمار دەكەن . -

١٢ - ومَن زعمَ أنَّ النَّاسَ لا يتفاضلون في الإيمانِ فقد كذب .

١٢ - وە هەر كەسێك بیروباوەڕی وابێت كەوا خەڵكی لە ئیمان ـدا هەندێكیان فەزڵیان بەسەر ئەوانی تردا نییە، ئەوا ئەو كەسە درۆزنە .

---

: بۆیە درۆزنە چونكە هیچ كەسێك ئیمانی وەكو ئەویتر نییە بەڵكو بەرز و نزمی لەنێو بەندەكاندا هەیە لە ئیماندا، هەندێكیان فەزڵیان زیاترە بەسەر هەندێكیان .

١٣ - ومن زعمَ أن المعرفةَ تنفعُ في القلبِ، وإن لم يَتكلَّم بها فهو جهميٌّ .

١٣ - وە هەر كەسێك پێی وابێت كەوا تەنها ناسینی ئیمان بە الله عزوجل و ئیسلام لە دڵیدا بێت سوودی پێدەگەیەنێت ئەگەرچی دەریشینەبڕێت بە زوبان، ئەوا ئەو كەسە جەهمییە .

١٤ - ومَن زعمَ أنَّه مؤمنٌ عند الله مُستكملُ الإيمانِ، فهذا مَن أشنع قول المُرجئة وأقبحه .

**١٤** - وه هەر کەسێک پێی وابێت کەوا لای الله ئیمانداره، ئیمانێکی تەواوی هەیە، ئەمە لە ناپەسەندترین قسەی مورجیئەیە و لە ناشرینترینیانە .

**١٥** - والقدرُ خيرُه وشرُّه، وقليلهُ وكثيرُه، وظاهرُه وباطنُه، وحلوه ومرُّه، ومحبوبُه ومكروهُه، وحسنُه وسيئُه، وأوَّلُه وآخِرُه :

مِن الله تبارك وتعالى، قضاءٌ قضاه على عبادِهِ، وقدرٌ قدَّرَه عليهم، لا يعدو أحدٌ منهم مشيئةَ الله عزوجل ولا يجاوزُ قضاءه : بل هم كلُّهم صائرون إلى ما خلقهم له، وواقعون فيما قدَّرَ عليهم لا محالةَ، وهو عدلٌ منه، عزَّ ربُّنا وجلَّ .

والزِّنا، والسَّرِقةُ، وشربُ الخمرِ، وقتلُ النَّفسِ، وأكلُ المالِ الحرامِ، والشِّركُ بالله، والذُّنوبُ والمعاصي كُلُّها بقضاءٍ وقدرٍ مِن الله، من غيرِ أن يكونَ لأحدٍ مِن الخلقِ على الله حُجَّةٌ، بل لله الحُجَّةُ البالغةُ على خلقِهِ، ﴿**لَا يُسْئَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْئَلُونَ**﴾ [**الأنبياء : ٢٣**] .

**١٥** - قەدەریش خێرەکەی و شەڕەکەی، وە کەمەکەی و زۆرەکەی، دیار و شاراوەکەی، شیرینەکەی و تاڵەکەی، خۆشویستراوەکەی و بێزراوەکەی، باشەکەی و خراپەکەی، سەرەتا و کۆتاییەکەی :

لە الله تبارک وتعالی وەیە، الله فرمانی کردووە ڕوودەن لەسەر بەندەکانی، و قەدەرەکانی خۆی ئەندازەگیر کردووە لەسەریان، هیچ کەسێک لە ویستی الله

عزوجل ناتوانێ بچێته دەرەوە، وە ئەو فرمان و حوكمەی الله بۆی داناوە ناتوانێ لێی لابدات :

بەڵكو گشتیان دەڕۆن بەرەو ئەوەی كە بۆی درووست كردوون، وە دەكەونە ناو ئەوانەشەوە كە بۆی ئەندازەگیر كردوون و كردوویەتیە قەدەریان، وە ئەمەش دادپەروەرییە لە پەروەردگارمانەوە عزَّ ربُّنا وجلَّ .

وە زینا، و دزین، و عەرەق خواردنەوە، و كوشتنی نەفس، و خواردنی ماڵی حەرام، و هاوەڵ بڕیاڕدان بۆ الله، و تاوان و سەرپێچییەكان گشتی بە قەزا و قەدەر لە الله وە ڕوودەدەن، بێ ئەوەی هیچ درووستكراوێك حوجە و بەڵگەیەكی هەبێ لەسەر الله عَزَّوَجَل، بەڵكو بەڵگەی بەقووەت و تێر و تەواو هەر هی الله یە لەسەر درووستكراوەكانی، ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ [الأنبيَاء : ٢٣]

واتە : پرسیار ناكرێت لەوەی الله تعالى ئەیكات، بەڵكو ئەوان - واتە بەندەكان - پرسیاریان لێدەكرێت و موحاسبە دەكرێن لەوەی كردوویانە و وتویانە.

**١٦** - وعِلمُ الله ماضٍ في خلقِهِ بمشيئةٍ منه، قد عَلِمَ من إبليسَ ومِن غيرِهِ ممن عصاهُ مِن لدُن أن عُصيَ رَبُّنا تبارك وتعالى إلى أن تقوم السَّاعةُ المعصيةَ، وخلقهم لها .

وعلِمَ الطَّاعةَ مِن أهلِ طاعتِهِ، وخلقَهُم لها .

فكُلٌّ يعملُ لما خُلِقَ له، وصائرٌ إلى ما قُضيَ عليه، وعُلِمَ منه، لا يعدُو أحدٌ منهم قدرَ الله ومشيئتَهُ، واللهُ الفعَّالُ لما يُريدُ .

١٦ - وە الله زانستی بەهەموو شتەکان هەبووە پێش ئەوەی ڕووبدات بە ویستی خۆی، وە زانستی هەبووە بە إبلیس و جگە لە إبلیس یش لەوانەی سەرپێچییان کردووە، پێش ئەوەش الله تبارک وتعالى دەیزانی کەوا کێ سەرپێچی دەکات تاوەکو قیامەت هەڵدەستێ، وە ئەو کەسانەش بۆ ئەوە درووستکراون کەوا سەرپێچی الله تعالى بکەن .

وە زانستی هەبووە بە گوێڕایەڵی کردنی ئەهلی گوێڕایەڵی کردن بۆ ئەمەش درووستی کردوون - واتە ئەوانەی گوێڕایەڵی الله تعالى دەکەن ئەوا الله زانستی بەوە هەبووە کە گوێڕایەڵی دەکەن، وە الله بۆ گوێڕایەڵی درووستی کردوون - .

هەر یەکێکیان بۆ ئەوە کار دەکات کە بۆی درووستکراوە، وە بۆ ئەو شتە دەڕوات کە بۆی بڕیاردراوە لە لایەن الله عزوجل، وە لە لای ئەوەوە زانراوە، هیچ یەکێک لەوان ناتوانێت لە قەدەر و ویستی الله لابدات، الله ش هەرچ کارێک ویستی لێی هەبێ دەیکات .

---

: کەواتە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە هەر کەسێک سەرپێچی بکات یاخود گوێڕایەڵی الله تعالى بکات پێش ئەوەی ڕووبدەن الله عیلمی پێی هەبووە و لای ئەو زانراو بووە، بەندەکانیش بەرەو ئەو شتە دەڕۆن کە لە لایەن الله وە بۆیان بڕیاردراوە بێ ئەوەی کەس بتوانێت بیگۆڕێت یاخود دەستکاری بکات والله اعلم بالصواب .

١٧ - فمن زعمَ أنَّ الله تبارك وتعالى شاء لعبادِهِ الذين عصوه الخيرَ والطَّاعةَ، وأنَّ العِبادَ شاءوا لأنفُسِهم الشَّرَّ والمعصيةَ، فعمِلوا على مشيئتِهِم، فقد زعمَ أن مشيئةَ العبادِ أغلبُ مِن مشيئةِ الله تبارك وتعالى ذكره، فأيُّ افتراءٍ على الله أكثرُ مِن هذا؟!

١٧ - بۆیه هەر کەسێک پێی وابێت ئەو کەسانەی سەرپێچی الله تبارک وتعالی یان کردووه الله ویستی خێر و گوێڕایەڵی بۆیان هەبووە، بەڵام بەندەکان خۆیان ویستی تاوان و سەرپێچییان هەبووه بۆ خۆیان، بۆیە لەسەر ویستی خۆیان کاریان کردووه، ئەوا ئەو کەسە وا گومانی بردووه کە ویستی بەندەکان زاڵترە لە ویستی الله تبارک وتعالی، چ بوختانێک بۆ الله گەورەترە لەمە؟!

---

: واته بۆ نموونه :

الله ویستی چاکە و خێری بۆ بەندەیەک ویستووه بەڵام بەندەکە خۆی ویستی تاوان و سەرپێچی هەبووه و کردوویەتی .

ئەمە مانای ئەوەیە کە ویستی بەندەکە زاڵبووە بەسەر ویستی الله والعیاذ بالله، بۆیە ئەبێت خۆمانی لێ بپارێزین، چونکە هیچ ویستیک ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر ویستی الله تبارک وتعالی .

١٨ - ومَن زعمَ أنَّ أحدًا مِن الخلقِ صائِرٌ إلى غير ما خُلِقَ له، فقد أنفى قُدرة الله عن خلقِهِ، وهذا إفكٌ على الله، وكذِبٌ عليه .

١٨ - هەر کەسێک پێی وابێت یەکێک لە درووستکراوەکانی دەڕوات بەرەو جگە لەوەی بۆی نوسراوە لە چارەنوسیان، ئەوا ئەو کات ئەو کەسە نەفی

دەسەڵات و توانای الله ی کردووە لەسەر بەندەکانی، ئەمەش بوختانێکی گەورەیە، و درۆیە لەسەری .

---

: واتە بۆنموونە بڵێت : فلانە کەس چاکە و خێری لە چارەنوسی نوسراوە بەڵام ئەوا خۆیەتی کە تاوان ئەنجام دەدات .

ئەمە نابێت بوترێت هەرگیز چونکە نەفی دەسەڵاتی الله دەکرێ بەسەر بەندەکانی بەوتنی ئەمە .

**١٩** - ومَن زعمَ أن الزِّنا ليس بقدرٍ، قيل له :

أرأيتَ هذه المرأة التي حملت مِن الزِّنا، وجاءت بولدٍ، هل شاء الله عزوجل أن يُخلقَ هذا الولد؟ وهل مضى هذا في سابقِ علمِهِ؟

فإن قال : لا . فقد زعم أن مع الله خالقًا، وهذا قولٌ يُضارع الشِّرك، بل هو الشِّرك

.

**١٩** - وە هەر کەسێک پێی وابێت زینا بە قەدەر ڕوونادات، پێی دەوترێت :

سەیری ئەم ئافرەتە بکە کە سکی پەیابووە لە زیناکە، و منداڵێک پەیابوو، ئایا الله عزوجل ویستی لەسەر هەبووە ئەم منداڵە درووست ببێت؟ وە ئایا ئەمە لە علم ی پێشووی الله تعالى دا هەبووە؟

ئەگەر ووتی : نەخێر، ئەوا ئەو کەسە پێی وایە کە خالقێکی تر بوونی هەیە جگە لە الله، ئەم قسەیەش منافەسە دەکات لەگەڵ شرک و هاوەڵدانان بۆ الله تعالى، بەڵکو شرک و هاوەڵ بڕیاردانە بۆ الله تعالى .

**٢٠** - ومَن زعمَ أن السَّرِقةَ، وشُرب الخمرِ، وأكل المال الحرام ليس بقضاءٍ وقدرٍ مِن اللّه، فقد زعمَ أن هذا الإنسانَ قادرٌ على أن يأكلَ رِزقَ غيرِهِ .

وهذا القولُ يُضارعُ قولَ المجوسيَّةِ والنَّصرانيَّةِ .

بل أكلَ رِزقَهُ، وقضى اللّهُ له أن يأكَلَهُ مِن الوجه الذي أكلَهُ .

**٢٠** - هەر کەسێک پێی وابێت کەوا دزی، و خواردنەوەی عەڕەق، و خواردنی ماڵی حەرام، لە قەزا و قەدەری الله ـەوە نییە، ئەوا ئەو کەسە پێی وایە ئەم مرۆڤە توانای هەیە ڕزقی جگە لە خۆی بخوات .

وە ئەم قسەیەش موونافسە ئەکات لەگەڵ قسەی ئاگرپەرست و نەصرانییەکان .

بەڵکو ڕزقی خۆی دەخوات، وە الله لەسەری نوسیوە کە بیخوات و لەو ڕووەشەوە کە خواردوویەتی .

---

: واتە هەموو کەس ئەو ڕزقە دەخوات کەوا الله تعالى بۆی بڕیار داوە و بۆی نوسیوە لە چارەنوسی .

**٢١** - ومَن زعمَ أن قتلَ النَّفس ليس بقدرٍ مِن الله عزوجل، فقد زعمَ أنَّ المقتولَ ماتَ بغيرِ أَجلِهِ، فأيُّ كُفرٍ بالله أوضح مِن هذا؟!

بل ذلك كُلُّه بقضاءٍ مِن الله عزوجل وقدرٍ، وكلُّ ذلك بمشيئتِهِ في خلقِهِ، وتدبيرِهِ فيهم، وما جرى في سَابقِ علمهِ لهم وهو العدلُ الحقُّ، الذي يفعلُ ما يريد.

**٢١** - وە هەر کەسێک پێی وابێت کەوا کوشتنی نەفس لە قەزا و قەدەری الله عزوجل ـدا نییە، ئەوا پێی وابووە کە ئەو کەسەی کوژراوە بەبێ ئەجەل و ئەو کاتەی بۆی دانراوە کوژراوە - واتە بەبێ ئەوەی کاتی دیاریکراوی مردنی هاتبێت کوژراوە، کە ئەمەش قسەیەکی ناڕەوایە چونکە کەسی کوژراویش پێش ئەوکات لە چارەنوسی نوسراوە کە بەوشێوەیە بمرێت - ، چ کوفرێک لەوە ڕوونترە؟

بەڵکو هەموو ئەمانە بە قەزا و قەدەری الله عزوجل یە، وە هەموو ئەمانە بەپێی ویستی الله تعالى یە لە دروستکراوەکانی، وە الله بەڕێوەیان دەبات، هەرچی ڕوودەدات الله پێش ئەوکات عیلمی پێیان هەبووە، وە الله تعالى دادپەروەری حەقە، ئەو الله یەی کە ویستی لەهەر شتێك بێت بیکات ئەنجامی دەدات.

**٢٢** - ومن أقرَّ بالعلم، لزِمَهُ الإقرارُ بالقدرِ والمشيئةِ على الصِّغَر والقَمَاءَةِ، والله الضَّارُّ النَّافعُ، المضِلُّ الهادي، فتباركَ اللّهُ أحسنُ الخالقين.

**٢٢** - هەر کەسێک دان بنێت بە عیلم ی الله - واتە پێی وابێت هەموو ئەو شتانەی ڕوودەدەن بەویستی الله یەو پێش ئەوەی ڕووبدەن الله زانستی پێیان هەبووە - ، پێویستە لەسەری دان بنێت بە قەدەر و ویستی الله بەوپەڕی زەلیلی و بچووکییەوە، وە الله زیان پێگەیەنەرە

و سوود پێگەیەنەرە، گومڕاکەر و هیدایەتدەرە، پاک و بێگەردی بۆ الله ی باشترین بەدیهێنەرەکان .

**٢٣** - ولا نشهدُ على أحدٍ مِن أهلِ القبلةِ أنَّه في النَّارِ لذنبٍ عَمِلَهُ، ولكبيرةٍ أتى بها، إلَّا أن يكون في ذلك حدِيثٌ، فيُروى الحديثُ كما جاء على ما رُوي، ويصدِّقُ به ويقبلُ، ويعلمُ أنَّه كما جاء، ولا ينصب الشَّهادة .

**٢٣** - وە شایەتی نادەین بۆ هیچ کەسێک لە أهلی قیبلە کەوا لە ئاگردایە بەهۆی گوناهێک کە کردوویەتی، یان بەهۆی تاوانێکی گەورە، ئیللا مەگەر حدیث ێک هەبێ لەبارەیەوە، حدیث ەکە دەگێڕدرێتەوە بەو جۆرەی کە هاتووە، وە بەو جۆرەی کە ڕیوایەت کراوە، وە بەڕاست دادەنرێ و قبوڵ دەکرێ و دەزانرێ بەو جۆرەی کە هاتووە، جگە لەوە شاهێدی لەسەر هیچ کەسێکی تر نادەین .

**٢٤** - ولا يشهدُ على أحدٍ أنَّه في الجنَّةِ لصلاحِ عملِهِ، أو لخيرٍ أتى بِهِ، إلَّا أن يكون في ذلك حديثٌ، فيروى الحديثُ كما جاء على ما رُوي يُصدِّقُ به، ويقبلُ، ويعلمُ أنه كما جاء، ولا ينصب الشَّهادة .

**٢٤** - وە شایەتی نادەین لەسەر هیچ کەسێک لەبەهەشتدایە بەهۆی چاکی کردەوەکانی، یان بەهۆی خێرێکەوە کە کردوویەتی، ئیللا مەگەر لەوەدا حدیث ێک هاتبێ، ئەوا حدیث ەکە دەگێڕدرێتەوە بەو جۆرەی کە هاتووە، وە بەو جۆرەی

كە ڕیوایەت كراوە، وە بەڕاست دادەنرێ و قبوڵ دەكرێ و دەزانرێ بەو جۆرەی هاتووە، جگە لەوە شاهێدی لەسەر هیچ كەسێكی تر نادەین .

---

: واتە گەر حەدیسێك هەبێت دەربارەی ئەوەی كە فلانە كردەوە بەرەو دۆزەخت دەبات یان بەرەو بەهەشت ئەوا وەكو خۆی حەدیسەكە دەگێڕدرێتەوە و بەڕاست دادەنرێت .

**٢٥** - والخِلافةُ في قُريشٍ ما بقي مِن النَّاسِ اثنان .

ليس لأحدٍ مِن النَّاسِ أن يُنازِعَهُم فيها، ولا يخرُجَ عليهم، ولا يُقرَّ لغيرِهِم بها إلى قيامِ السَّاعة .

**٢٥** - وە خیلافەت لەهۆزی قورەیشدایە و هەر بۆ ئەوان بەردەوام دەبێت هەتاوەكو دوو كەس مابێت لەسەر زەوی .

هیچ كەسێك بۆی نییە ململانێیان لەگەڵ بكات لەسەر ئەوە، وە هیچ كەسێك لەسەر ئەوانەوە دەرناچێت، وە دانیشی پێیدا نانرێت بۆ جگە لەوان هەتاوەكو هەڵسانی قیامەت .

**٢٦** - والجِهادُ ماضٍ قائمٌ مع الأئمَّةِ، برُّوا أو فجروا، ولا يُبطِلُهُ جَورُ جائرٍ، ولا عدلُ عادِلٍ .

**٢٦** - وه جیهادیش بەردەوامە و بەرپا دەکرێ لەگەڵ سەرکردە و پێشەوا مسوڵمانەکان، چاکەکاری بکەن یان خراپەکاریی، وە پوچەڵی ناکاتەوە ستەمی ستەمکارێک یان دادپەروەریی دادپەروەرێک .

**٢٧** - والجمعةُ، والعيدانِ، والحجُّ مع السُّلطانِ، وإن لم يكونوا بررَةً عُدولًا، ولا أتقياء .

**٢٧** - وه ئەنجامدانی نوێژی جومعە و هەردوو جەژنەکە و حەج کردن لەگەڵ دەسەڵاتداری مسوڵمان دەکرێت، ئەگەرچی چاکەکار و زۆر دادپەروەر و موتتەقی و پارێزکار نەبن

---

: واتە هەر چەندە کەسانێکی زۆر تەقوادار نەبن بەڵام هەر دەبێت نوێژەکانیان لەگەڵ ئەنجام بدەیت چونکە مسوڵمانن .

**٢٨** - ودفعُ الخراجِ، والصَّدقاتِ والأعشارِ، والفَيءِ، والغنيمة إلى الأُمراءِ، عدلوا فيها أم جارُوا .

**٢٨** - وه پێدانی ئەو پارانەی وەک - جزية - و زەکات و فيء و غنيمة، بە پێشەوا و دەسەڵاتدارەکان، جا دادپەروەر بن یاخود ستەمکار .

---

: واتە هەر چەندە ستەمکاریش بێت پێشەوای مسوڵمانان ئەوا هەر دەبێت جزیە و غەنیمە و فیئ پێ بدرێت .

الفيء : ئەو دەسکەوتەی بەبێ ڕوودانی جەنگ دەستی مسوڵمانان دەکەوێت .

الغنيمة : ئەو دەسکەوتەیە بەڕوودانی جەنگ دەستی مسوڵمانان دەکەوێت .

**٢٩** - والانقيادُ لِمَن ولَّاهُ اللّهُ أمرك، لا تَنزع يدك مِن طاعةٍ، ولا تخرج عليهِ بسيفك حتَّى يجعل الله لك فرجًا و مخرجًا .

**٢٩** - وە ملکەچ بوون بۆ ئەو کەسەی الله تعالى کردوویەتیە فەرمانڕەوا بەسەرتەوە، دەست ناگێڕیتەوە لە گوێڕایەڵی کردنی، وە لەسەری دەرناچیت بەشمشێر و چەکەکەت تاوەکو الله تعالى ڕزگاربوون و دەرچەیەکت بۆ فەراهەم دەکات لەم دەسەڵاتدارە .

**٣٠** - وأن لا تخرج على السُّلطانِ، وتسمعُ وتُطيع، ولا تنكُثُ بيعةً، فمن فعل ذلك فهو مُبتدعٌ مُخارقٌ مفارِقٌ للجماعةِ .

**٣٠** - وە دەرنەچیت لەسەر دەسەڵاتدار، گوێ دەگریت و گوێڕایەڵ دەبیت، وە بەیعەت پێدانەکەت پێی هەڵناوەشێنیتەوە، هەر کەسێک ئەوە بکات ئەوا بیدعەچی و سەرپێچیکارە و جیابۆتەوە لە کۆمەڵی مسوڵمانان .

**٣١** - وإن أمركَ السُّلطانُ بأمرٍ هو لله مَعصيةٌ، فليس لك أن تُطيعَهُ البتَّةَ، وليس لك أن تَخرجَ عليه، ولا تَمنعَهُ حَقَّهُ .

**٣١** - وە ئەگەر فەرمانڕەواکەت فەرمانی پێ کردیت بەشتێك کە سەرپێچی اللە یە، بۆت هەیە کە هەرگیز بەگوێی نەکەی، و بۆت نییە دەربچی لەسەری و ڕێگریی مافەکانی لێ بکەیت .

---

: واتە بۆ نموونە بڵێیت : مادام فەرمانم پێدەکات بەخراپە ئەوا دەردەچم لەژێر دەسەڵاتی و چیتر گوێڕایەڵی ناکەم .

نەخێر ئەمە فیتنە درووست دەکات، بەڵکو لەو کارانەی سەرپێچین نابێت گوێڕایەڵی بکرێت.

**٣٢** - والإمساكُ في الفِتنةِ سُنَّةٌ ماضيةٌ، واجبٌ لزُومُها .

فإن ابتُليتَ : فقدِّم نفسَك، ومالك دون دِينِك .

ولا تُعِن على الفِتنةِ بيدٍ ولا لسانٍ، ولكن اكفُف يدك، ولسانَكَ، وهواك، والله المُفتِن .

**٣٢** - وە خۆگرتنەوە لەکاتی بەرپابوونی فیتەنەدا سوننەتێکی تێپەڕیوە - واتە لە لایەن صحابە و تابعین و سلف ەوە هاتووە بەوانەدا تێپەڕیوە تاوەکو کاتی ئێستە - ، واجبە ئەنجامی بدەیت .

ئەگەر تووشی تاقی کردنەوە بوویت : ئەوا نەفست، وە ماڵت بەخت بکە و پێشی بخە، جگە لەدینەکەت .

هاوکار مەبە بۆ گەورەکردن و نانەوەی فیتنە نە بەدەست نە بەزوبان، بەڵکو دەستت، زوبانت، ئارەزووەکانت بگرەوە، اللہ خۆی بەندەکانی تاقی دەکاتەوە .

**٣٣** - والكفُّ عن أهلِ القبلةِ، ولا تُكفِّر أحدًا منهم بذنبٍ، ولا تُخرجه من الإسلامِ بعملٍ، إلَّا أن يكون في ذلك حديثٌ، فيُروى الحديثُ كما جاء، وكما رُوي، وتُصدِّقُ به، وتقبلُهُ، وتعلمُ أنّه كما رُوي، نحو: تركِ الصَّلاةِ، وشُربِ الخمرِ، وما أشبه ذلك، أو يبتدعُ بدعةً يُنسَبُ صاحِبُها إلى الكُفرِ والخروجِ مِن الإسلامِ، واتَّبعِ الأثرَ في ذلك، ولا تُجاوِزه .

**٣٣** - وە خۆگرتنەوە لە ئەهلی قیبلە و هیچ یەکێکیان کافر ناکەیت بەهۆی تاوانێکەوە، وە دەریان ناکەیت لە ئیسلام بەهۆی کردەوەیەکیانەوە، ئیللا مەگەر حدیث ێک هەبێت لەبارەیەوە، حدیث ەکە دەگێڕدرێتەوە بەو جۆرەی کە هاتووە، وە بەو جۆرەی کە ڕیوایەت کراوە، وە بەڕاست دادەنرێ و قبوڵ دەکرێ و دەزانرێ بەو جۆرەی کە هاتووە، وەک وازهێنان لە نوێژ و خواردنەوەی ئارەق، وە هاوشێوەی ئەوە، یان بیدعەیەک داهێنێت کە خاوەنەکەی پاڵبدات بۆ لای کوفر و دەرچوون لە ئیسلام، بۆیە شوێن أثر بکەوە لەمەدا و لێی لامەدە .

---

: ڕوونکردنەوە :

ئەهلی قیبلە : ئەوانەن کە ئەهلی تەوحیدن و یەکخواپەرستن، وە نوێژ دەکەن . هەروەکو لە ئیمامی أحمد رحمە الله لە کتابی (**السنة لخلال : ١٤١**) هاتووە .

الإمام إسحاق بن راهويه (**٢٣٨ هـ**) رحمە الله دەڵێت : بە صحیحی هاتووە لە رسول الله ﷺ کە ئەوکەسەی واز لەنوێژ دێنێت کافرە، بەهەمان شێوە ئەمە بیروبۆچوونی ئەهلی عیلمە ئەوانەی لەدوای پێغەمبەر ﷺ بوون تاوەکو ئەو ڕۆژەمان : کە ئەوکەسەی واز لە نوێژ دێنێت بە ئەنقەست بەبێ هیچ عوزرێک تاوەکو کاتەکەی دەڕوات ئەوا کافر .[**تعظيم قدر الصلاة : ٩٩٠**] .

الحسن البصري رحمە الله دەڵێت : پێم گەیشتووە کەوا هاوەڵانی محمد ﷺ دەڵێن : لەنێوان بەندە و ئەوکەسەی شیرک ئەنجام دەدات و پێی کافر دەبێت، وازهێنانە لە نوێژ بەبێ هیچ عوزرێک . [**الإبانة الكبرى لإبن بطة : ٨٨٨**] .

أيوب السختياني (**١٣١ هـ**) رحمە الله کە یەکێکە لە گەورەی تابعینەکان، کە بە ئیجماع دەربارەی ئەمە دەڵێت : وازهێنان لە نوێژ کوفرێکە هیچ ڕاجیایەکی تێدا نییە . [**تعظيم قدر الصلاة ـ ٩٧٨**] .

ئیجماع هەیە لەسەر ئەوەی کە هەرکەسێ واز لەنوێژ بێنێت بەبێ هیچ عوزرێک ئەوا کافرە، جا بە ئەنقەست بێت، یان بە تەمبەڵی .

چونکە کە باسی تارک الصلاة یان کردووە، هیچ جیاوازیان نەکردووە لە نێوان کەسی تەمبەڵ و ئەوەی ئینکاری دەکات، والله اعلم .

وە دەربارەی ئارەق خواردنەوە چەند ئەثەرێک هاتوون :

عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما دەفەرموێت : زینا بکەم لام خۆشترە لەوەی ئارەق بخۆمەوە، ئەگەر من ئارەق بخۆمەوە واز لەنوێژیش دێنم - بەهۆی بێ هۆشیەوە - ، وە ئەوەی واز لە نوێژ بێنێت دینی نییە . [**رواه أحمد في (الإيمان) : ٢٣٣**] .

وە عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما دەفەرموێت : هەرکەسێک ئێوارە ئارەق بیخواتەوە ئەوا بەیانی بە موشریکی دەکاتەوە، وە هەرکەسێک بەیانی بیخواتەوە ئەوا ئێوارە بە موشریکی دەکاتەوە .

إبراهيم النخعي پێی وتی : ئەمە چۆنە؟

وتی : چونکە واز لە نوێژ دێنێت [**مجموع الفتاوى : ٣٠٣/٧**] .

مسروق رحمه الله دەڵێت : هەرکەسێ ئارەق بخواتەوە ئەوا کوفری کردووە، کوفرەکەشی ئەوەیە کە نوێژ ناکات، یاخود لەوکاتە بێ هۆشیەدا بۆی نییە نوێژ بکات [**سنن النسائي : ٥٦٦٥**] .

زۆربەی ئەهلی عیلم مەسئەلەی خواردنەوەی ئارەق دەگەڕێننەوە بۆ مەسئەلەی وازهێنان لەنوێژ، چونکە ئەوەی ئارەق بخواتەوە واز لەنوێژیش دێنێ، ئەوەی واز لەنوێژ بێنێ ئەوا کوفری کردووە .

**٣٤** - ولا أُحِبُّ الصَّلاةَ خلفَ أهلِ البدعِ، ولا الصَّلاةَ على من ماتَ مِنهُم .

**٣٤** - وە حەزناکەم - پێم خۆش نییە - بە نوێژکردن لەپشت کەسی بیدعەچی، و نە نوێژکردنیش لەسەر ئەو کەسەی دەمرێت لێیان .

---

واتە کاتێک بیدعەچیەک کەسێکیان لێ دەمرێت، ئیمام ئەڵێت : حەزناکەم نوێژی مردووشی لەسەر بکەن.

مەبەستی ئیمام لێرەدا بریتییە لە بیدعەچیەکی مسوڵمان، واتە هەرچەندە بیدعەچیەکە مسوڵمان بێ ئەوا هەر حەزناکات نوێژی مردووی لەسەر بکرێت .

ئەگینا بیدعەچی کافر بە کۆدەنگی زانایان نابێت نوێژی لەسەر بکرێت .

**٣٥** - والأعورُ [الدَّجَّالُ] خارجٌ لا شكَّ في ذلك، ولا ارتيابَ، وهو أكذبُ الكاذِبين .

**٣٥** - وه دەجالی كوێر دەردەچێ گومان لەوەدا نییە، نە دوودڵیش، وە درۆزنترینی درۆزنەكانە .

**٣٦** - وعذابُ القبرِ حقٌّ، يُسألُ العبدُ عن ربِّه، وعن نبيِّهِ، وعن دينِهِ، ويُرى مقعَدَهُ مِن الجنَّةِ أو النَّارِ .

**٣٦** - وە سزای ناو گۆڕ حەق و ڕاستە، پرسیار دەكرێت لە بەندە دەربارەی پەروەردگاری، وە پێغەمبەرەكەی، وە دینەكەی، وە شوێنی خۆی پێ نیشان دەدرێت كە لە بەهەشتە یاخود ئاگر .

**٣٧** - ومُنكرٌ ونَكيرٌ حقٌّ، وهما فتَّانا القبورِ، نسألُ اللهُ الثَّباتَ .

**٣٧** - منكر و نكير حەقن، وە ئەم دووانەی ناو گۆڕ كە تاقی دەكرێیتەوە پێیان، داوای دامەزراوی تەواو لە الله دەكەین .

---

: منكر و نكير : دوو فریشتەن تاقیكردنەوەی كەسانی ناو گۆڕ دەكەن .

**٣٨** - وحوضُ محمدٍ ﷺ حقٌّ، حوضٌ تَرِدُ عليه أُمّتُهُ، وله آنيةٌ يشربون بها منه .

**٣٨** - وه حەوزی پێغەمبەر ﷺ حەقە، ئوممەتەكەی ئاوی لێ دەخۆنەوە، وە جامی لێیە كە پێی دەخۆنەوە .

**٣٩** - والصِّراطُ حقٌّ، يُوضعُ في سَوَاءِ جهنَّمَ، فيمرُّ النَّاسُ عليه، والجنَّةُ مِن وراءِ ذلك . نسألُ الله السَّلامة والجواز .

**٣٩** - وه پردی صیراط حەقە، لەسەر جەهەننەم دادەنرێت، وە خەڵكی بەسەریدا تێدەپەڕن، وە بەهەشتیش لەدوای پردەكەوەیە، داواكارین لە الله سەلامەتمان بكات .

**٤٠** - والمِيزانُ حقٌّ، تُوزنُ بهِ الحسناتُ والسِّئاتُ، كما شاء الله أن تُوزنَ به .

**٤٠** - وه تەرازوو حەقە، كە چاكە و خراپەی بەندەكان دەپێوێت، بەو شێوەیەی الله بیەوێت دەیپێوێت .

---

: ئەم تەرازووە دوو تای هەیە، وە هەرگیز نابێت لەچۆنیەتی پێوانی ئەم تەرازووە بپرسین چونكە بەوشێوەیەیە كە الله دەیەوێت .

**٤١** - والصُّورُ حقٌّ، يَنفخُ فيه إسرافيلُ، فيموتُ الخلقُ، ثم ينفُخُ فيه الأُخرى، فيقومون لرَبِّ العالمين للحِسابِ والقضاءِ، والثوابِ والعقابِ، والجنَّةِ والنَّارِ .

**٤١** - وه صور حەقە و ڕاستە، کە إسرافيل فووی پێدا دەکات، درووستکراوەکان دەمرن، پاشان فوویەکی تری پێدا دەکات هەڵدەستن بۆ بەردەم پەروەردگاری جیهانیان، بۆ لێپرسینەوە و حوکم کردن، و پاداشت و سزا، و بەهەشت و دۆزەخ .

---

: واتە لەجاری یەکەم إسرافيل فووی پێدا دەکات گشتیان دەمرن، لەجاری دووەم کە فووی پێدا دەکات هەڵدەستن بۆ ئامادەبوونیان لەبەردەم الله تعالى تاوەکو لێیان بپرسێتەوە و حوکمیان بکات، لەسەر کردەوەکان، لەکۆتاییش بەپێی ڕەحم و دادپەروەری الله تعالى جێگایان یان بەهەشتە یان دۆزەخ، والله المستعان .

**٤٢** - واللوحُ المحفوظُ حقٌّ، تستنسخُ منه أعمالُ العبادِ، لما سبقت فيه مِن المقاديرِ والقضاءِ .

**٤٢** - وه لەوحی محفوظ حەقە، کە کردەوەکانی بەندەکان گشتی تێدا نوسراوە، هەموو ئەو شتانەی پێش ئەوەی ڕووبدەن لە قەزاو قەدەر تیایدا نوسراوە .

**٤٣** - والقلمُ حقٌّ، كتبَ الله بهِ مقادِيرَ كلِّ شيءٍ، وأحصاهُ في الذِّكرِ، فتبارك ربنا وتعالى .

**٤٣** - وە قەڵەم حەقە، کە الله تعالى ئەندازە و چارەنوسى هەموو شتێکى پێ نوسيوە، وە هەموويان کۆکراونەتەوە لە لەوحى محفوظ، فتبارک ربنا وتعالى .

**٤٤** - والشّفاعةُ يوم القيامةِ حقٌّ، يشفعُ قومٌ في قومٍ فلا يصِيرون إلي النَّار .

ويخرجُ قومٌ مِن النَّارِ بعدما دخلُوها بشفاعةِ الشَّافعين .

ويخرجُ قومٌ مِن النَّارِ برحمةِ الله بعدما يُلبِثُهم فيها ما شاء الله .

**٤٤** - وە شەفاعەت لەڕۆژى قيامەتدا حەقە، قەومانێک لە بڕواداران شەفاعەت دەکەن بۆ قەومانێک کە ڕاپێچ دەکرێن بۆ دۆزەخ بەهۆى ئەم شەفاعەتەوە نايانبەن بۆ دۆزەخ .

وە قەومانێک دێنە دەرەوە لە ئاگر دواى ئەوەى خرابوونە ناويەوە بەهۆى شەفاعەتى شەفاعەتکاران .

وە کۆمەڵەيەک دێنە دەرەوە لە ئاگر بەڕەحمەتى الله تعالى لەدواى ئەو ماوەيەى لە دۆزەخ ماونەتەوە، ئەوەندەى کەوا الله تعالى ويستى لێبێت .

: واته بەپێی ئەو ماوەیەی الله تعالی دایدەنێت بەندەکە دەمێنێتەوە لەئاگری دۆزەخ، دوای ئەو ماوەیە بەڕەحمی الله دێتە دەرەوە، بێگومان ئەمەش تەنیا بۆ مسوڵمانە تاوانبارەکانە چونکە کەسی کافر هەرگیز ناچێتە بەهەشت و شەفاعەتیشی بۆ ناکرێت .

**٤٥** - وقومٌ يُخلَّدُون في النَّارِ أبدًا، وهم أهلُ الشِّركِ، والتَّكذيبِ، والجُحودِ، والكُفرِ بالله .

**٤٥** - وە قەومانێک بۆ تاهەتایە لەئاگر دەمێننەوە، کە ئەوانیش ئەهلی شیرکن، وە بەدرۆخەرەوە، و نکۆڵیکەر، و کوفرکردن بە الله تعالی ن .

---

: ئەهلی شیرک : واتە هاوبەش بۆ الله بڕیار دەدەن، والعیاذ بالله .

بەدرۆخەرەوە : واتە ئەوانەی دینی الله تعالی یان بەدرۆخستۆتەوە .

نکۆڵیکەر : واتە ئەوانەی ئینکاری لە حەقیەتی و ڕاستیەتی ئەم دینە دەکەن .

کوفرکردن بە الله تعالی : واتە ئەوانەی کە ئەسڵەن باوەڕیان بەبوونی الله نییە و کافرن پێی .

**٤٦** - ويُذْبَحُ الموتُ يوم القيامة بين الجنَّةِ والنَّار .

**٤٦** - وە مردن سەردەبڕدرێت لە ڕۆژی قیامەتدا لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا .

**٤٧** - وقد خُلقتِ الجنَّةُ وما فيها، وخُلقت النَّارُ وما فيها، خلقهما الله عزوجل، ثم خلقَ الخلقَ لهما، لا ينفيانِ، ولا يفنى ما فيهما أبدًا .

**٤٧** - بەهەشت و ئەوەی تێیدایە درووستكراوە، وە ئاگر و ئەوەی تێیدایە درووستكراوە، الله تعالى درووستی كردوون، پاشان بوونەوەری بۆ درووستكردن، لەناو ناچن بۆ هەمیشە دەمێننەوە، وە ئەوانەشی تێیدان .

---

: واتە ئەوانەشی تێیدان لەناو ناچن و بۆ هەمیشە دەمێننەوە .

**٤٨** - فإن احتجَّ مُبتدعٌ أو زِنديقٌ بقولِ الله تبارك وتعالى : ﴿**كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ**﴾ [**القصص** : ٨٨]، وبنحو هذا مِن مُتشابه القرآن .

فقل له : كُلُّ شيءٍ مما كتبَ الله عليه الفناءَ والهلاكَ هَالِكٌ، والجنَّةُ والنَّارُ خُلِقتا للبقاءِ لا للفناءِ، ولا للهلاكِ، وهما مِن الآخرةِ لا مِن الدُّنيا .

والحورُ العينُ لا يمُتنَ عند قيامِ السَّاعةِ، ولا عند النَّفخةِ، ولا أبدًا، لأنَّ الله تبارك وتعالى خلقهُنَّ للبقاءِ لا للفناءِ، ولم يَكتُب عليهنَّ الموتَ، فمن قال بخلافِ ذلك .

فهو مُبتدعٌ مُخالفٌ، وقد ضلَّ عن سواءِ السَّبيل .

**٤٨** - ئەگەر بیدعەچییەك و زەندیق یێك ئەم وتەی الله تعالى ی كردە بەڵگە ﴿**كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ**﴾ وە بەهاوشێوەی ئەوە لە ئایەتە لێكچووەكانی قورئان .

ئەوا پێی بڵێ : هەموو شتێک کە الله تعالى نەمان و لەناوچوونی لەسەری نووسیبن لەناودەچن، بەهەشت و جەهەننەمیش بۆ مانەوە درووستکراون نەوەک بۆ نەمان و لەناوچوون، وە ئەوان لەقیامەتن نەوەک لە دونیا .

وە حۆرییەکانیش نامرن لە کاتی هەڵسانی قیامەت، نە لەکاتی فووکردنیش بە سووردا، وە نە هەرگیز، چونکە الله تعالى درووستیکردوون بۆ مانەوە نەوەک بۆ لەناوچوون، وە مردنی لەسەر نەنوسیوون، بۆیە هەر کەسێک پێچەوانەی ئەوەی ووت :

ئەوا ئەو کەسە بیدعەچی و پێچەوانیکارە، وە وون بووە لە ڕێگە ڕاستەکە .

**٤٩** - وخلقَ الله سبعَ سماواتٍ بعضُها فوق بعضٍ، وسبعَ أرضين بعضُها أسفلَ مِن بعضٍ، وبين الأرضِ العُليا والسَّماءِ الدُّنيا : مَسيرة خمسُمائةِ عامٍ، وبين كُلِّ سماءٍ إلى سَماء مَسيرة خمسمائةِ عامٍ .

**٤٩** - وە الله تعالى حەوت ئاسمانەکەی درووست کردووە کە هەندێکیان لەسەر هەندێکیانەوەیە، وە حەوت زەویەکەی درووستکردووە کە هەندێکیان لەخوارووی هەندێکیانەوەیە، وە لەنێوان زەوی سەرەوە تاوەکو ئاسمانی دونیا :

ڕێگەی پێنج سەد ساڵ ە، وە لەنێوان هەر ئاسمانێک بۆ ئاسمانێک ڕێگەی پێنج سەد ساڵ ە .

**٥٠** - والماءُ فوقَ السَّماءِ العُليا السَّابعة، وعرشُ الرَّحمنِ عزوجل فوقَ الماءِ، والله تبارك وتعالى على العرشِ .

**٥٠** - وه ئاو لەسەرووی ئاسمانی بەرزی حەوتەمە، وە عەرشی الرحمن عزوجل لەسەر ئاوەکەیە، وە الله ی پاک و بڵند لەسەر عەرشەکەیە .

**٥١** - والكُرسيُّ موضِعُ قدَميهِ .

**٥١** - وه کورسی شوێنی پێی موبارەکی الله تعالى یە .

**٥٢** - وهو يَعلمُ ما في السَّماواتِ السَّبعِ، وما في الأرضين السَّبعِ، وما بينَهُنَّ، وما تحتهُنَّ، وما تحت الثَّرى، وما في قعرِ البحارِ، ومَنبتَ كُلِّ شعرةٍ، وكُلِّ شجرةٍ، وكُلِّ زرعٍ، وكُلِّ نبتٍ، ومسقطَ كلِّ ورَقةٍ، وعددَ ذلك كُلِّهِ، وعددَ الحصى، والرَّملِ، والتُّرابِ، ومثاقيلَ الجِبالِ، وقطرَ الأمطار، وأعمالَ العبادِ، وآثارَهُم، وكلامَهُم، وأنفاسَهُم، وتمتمتَهُم، وما توسوِسُ به صُدورهم، ويعلمُ كلَّ شيءٍ، لا يخفى عليهِ شيءٌ مِن ذلك .

**٥٢** - وه ئەو - واته الله تعالى - ، دەزانێت بە هەرچی ئەوەی لە حەوت ئاسمانەکەدایە، وە هەموو ئەوەشی لە حەوت زەوییەکەدایە، وە ئەوەی لەنێوانیاندایە، وە ئەوەی لە ژێریاندایە، وە ئەوەی لەژێر خاکە، وە ئەوەی لەناخی دەریادایە، وە شوێنی ڕووانی هەر تاڵە موویەک، وە هەر درەختێک، وە هەر ڕووەکێک، وە هەر سەوزەیەک، وە شوێن و کاتی وەرینی هەر گەڵایەک، وە

ژمارەی هەموو ئەوانە، وە ژمارەی دەنکە خۆڵەکان و لم و خاک، وە قورسایی شاخەکان، وە دڵۆپی بارانەکان، وە کردەوەی بەندەکان، وە ئەوەی پێشیان خستووە، وە وتەکانیان، وە هەناسەکانیان، وە چپەکردنیان، وە ئەوەی لە سینەکانیان وەسوەسەی پێ دەکات، وە هەموو شتێک دەزانێت، هیچ شتێک لەوانە لێی شاراوە نابێت .

**٥٣** - وهو على العرشِ فوقَ السَّماءِ السَّابعةِ، ودُونَهُ حُجبٌ : مِن نارٍ ونُورٍ وظُلمةٍ، وما هو أعلمُ بها .

**٥٣** - وە الله تعالی لەسەر عەرشە لەسەرووی ئاسمانی حەوتەم، وە لەنێوان خۆی و درووستکراوەکانیدا پەردەیەکی داناوە، لە ئاگر، ڕووناکی، تاریکی، وە خۆی بەوە زاناترە .

**٥٤** - فإن احتجَّ مُبتدعٌ أو مُخالِفٌ أو زِنديقٌ بقول الله تبارك وتعالى اسمه : ﴿**وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ**﴾ [ق : ١٦] .

وبقوله : ﴿**وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ**﴾ [**الحديد** : ٤] .

وبقوله : ﴿**مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ**﴾ [**المجادلة** : ٧]، إلى قوله : ﴿**هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُواْ**﴾ [**المجادلة** : ٧]، ونحو هذا مِن مُتشابه القرآن .

فقل : إنَّما يعني بذلك العلم، لأنَّ الله تبارك وتعالى على العرشِ فوقَ السَّماءِ السَّابعةِ العُليا، يعلمُ ذلك كُلَّهُ، وهو بائنٌ مِن خلقِهِ، لا يخلو من عِلمِهِ مكان .

**٥٤** - وە ئەگەر بیدعەچییەک یان پێچەوانیکارێک یان زەندیقێک بەڵگەی هێنایەوە بەم وتەی الله ی پاک و بڵند ﴿**وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ**﴾ [ق : ١٦]

یاخود ئەو وتەیەی الله تعالی :﴿**وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ**﴾ [**الحَديد** : ٤] .

وە ئەم ئایەتە ﴿**مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ**﴾ تاوەکو ﴿**هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا**﴾ [**المجَادلة** : ٧]، وە هاوشێوەی ئەوە لە ئایەتە لێکچووەکان لە قورئاندا.

بڵێ : لەمەدا مەبەستی زانست ە، لەبەرئەوەی الله تبارک و تعالی لەسەر عەرشە لەسەر ئاسمانی بەرزی حەوتەم، زانستی هەیە بەهەموو ئەوانەی ڕوودەدەن، و جیابۆتەوە لە درووستکراوەکانی، و زانستی لەهەموو شوێنێکە و هیچ شوێنێک خاڵی نییە لە زانستی الله.

**٥٥** - ولله عزوجل عرشٌ، وللعرشِ حملةٌ يَحملونَهُ .

**٥٥** - وە الله تعالی خاوەنی عەڕشە، و عەڕشیش هەڵگرِی هەیە .

**٥٦** - وله حَدٌّ، الله أعلم بحدِّهِ .

**٥٦** - وه الله سنووری هه‌يه، الله خۆی زاناتره به‌و ئه‌ندازه‌ی سنووره .

---

: واته له‌نێوان الله و به‌نده‌كانيدا سنوور هه‌يه كه‌وا جيايان ده‌كاته‌وه، وه تێكه‌ڵی به‌نده‌كانی نابێت، الله خۆی زانايه به‌ئه‌ندازه‌ی ئه‌و سنووره كه چۆنه .

**٥٧** - والله على عرشه عزَّ ذكرُهُ، وتعالى جدُّهُ، ولا إله غيرُهُ .

**٥٧** - وه الله تعالى له‌سه‌ر عه‌رشه يادكردن و باسكردنی به‌ڕێز و به‌هێزه، وه پێگه‌ی به‌رز و بڵنده، وه هيچ په‌رستراوێك نييه به‌حه‌ق كه شايه‌نی په‌رستن بێت جگه له الله.

**٥٨** - والله تبارك سَميعٌ لا يشُكُّ، بصيرٌ لا يرتابُ، عيلمٌ لا يجهلُ، جوادٌ لا يبخلُ، حليمٌ لا يَعجلُ، حفيظٌ لا ينسى، يقظانٌ لا يسهو، رَقيبٌ لا يغفلُ، يتكلَّمُ، ويتحرَّكُ، ويسمعُ، ويُبصرُ، وينظرُ، ويَقبضُ، ويَسبط، ويَضحَكُ، ويَفرَحُ، ويُحبُّ، ويَكرَهُ، ويُبغِضُ، ويَرضى، ويَسخَطُ، ويَغضبُ، ويَرحمُ، ويَعفُو، ويَغفِرُ، ويُعطِي، ويَمنعُ، ويَنزلُ كُلَّ ليلةٍ إلى السَّماءِ الدُّنيا، كيف شاءَ، وكما شاءَ . ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ **[الشورى : ١١]** .

٥٨ - وه الله تعالى بيسەره هيچ گومانێک ڕووی تێناکات - واته لەوەی بیستویەتی به تەواوی دەیبیستێ و گومان نییه لەوەی بیستویەتی - ، بینەره هیچ گومانێک ڕووی تێناکات، زانایه و نەزان نییه، بەخشندەیه و ڕەزیل نییه، بەبەزەییه و پەلە ناکات لە کردارەکانیدا، پارێزەره و هیچ شتێک لەیاد ناکات، به ئاگایه و هەڵه ناکات - واته بەئاگایه و ناخەوێت، وه لەکردارەکانیدا هەڵه ناکات - ، چاودێره و بێ ئاگا نییه - واته چاودێر و ئاگاداره بەهەموو شتێک، هیچ شتێک نییه کە ئەو لێی بێ ئاگا بێت - ، قسە دەکات، وه دەجوڵێت - وەک دابەزینی الله تعالى بۆ ئاسمانی دونیا - ، وه دەبیستێت و دەبینێت و سەیر دەکات، وه سیفەتی گرتن و کرانەوەی هەیه - واته دەستەکانی الله جلَّ شأنه - ، وه پێدەکەنێت و سیفەتی خۆشحاڵ بوونی هەیه، وه سیفەتی خۆشویستنی هەیه، وه سیفەتی خۆشنەویستنی هەیه، وه ڕقی لێدەبێتەوه و ڕازی دەبێت و توڕه دەبێت، وه بەزەیی و لێخۆشبوونی هەیه و ڕزق و ڕۆزی دەبەخشێت و دەیگرێتەوه، وه دادەبەزێت لە هەموو شەوێک بۆ ئاسمانی دونیا، چۆنی بوێت و بەوشێوەیەی کە خۆی بیەوێت، ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ [الشورى : ١١]

واته : هیچ شت و کەسێک لە الله تعالى ناچێت، وه الله تعالى بیسەره به ووتەکانتان، وه بینەره به کردەوەکانتان - لەم ئەثەرەدا کۆمەڵێک ناو و صیفاتی الله تعالى باس دەکات و جێگیریان دەکات - .

٥٩ - وقلوبُ العبادِ بين أصبعين من أَصابعِ الرحمن يُقلِّبُها كيف يشاءُ، ويُوعِيها ما أراد .

**٥٩** - وە دڵی بەندەکان لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الرحمن دایە، چۆنی بوێت، وە بەرەو ئەو شتە دەیبات کە ویستی لێیەتی .

---

: واتە هیدایەتدان بەویستی خۆیەتی، بۆ هەر کەسێک بیەوێت هیدایەتی دەدات بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت، وە بەرەو ئەو شتەیان دەبات کە ویستی لێیەتی بێگومان بە دادپەروەری .

**٦٠** - وخلقَ آدمَ بيدِهِ على صُورتِهِ .

**٦٠** - وە الله تعالی ئادەمی بەدەستی خۆی درووست کردووە لەسەر شێوەی خۆی .

**٦١** - والسَّماواتُ والأرضونَ يومَ القيامةِ في كَفِّهِ وقبضتِهِ .

**٦١** - وە ئاسمانەکان و زەوییەکان لەڕۆژی دواییدا لەناو لەپی دەستی دایە و دەیانگرێت - واتە ناو لەپی دەستی الله تعالی - .

**٦٢** - ويضعُ قدمَهُ في جهنَّمَ فتُزوى .

**٦٢** - وە پێی دەخاتە ناو دۆزەخەوە و دۆزەخ پڕ دەبێت .

**٦٣** - ويُخرِجُ قومًا مِن النَّار بيدِهِ .

**٦٣** - وه کۆمه‌ڵێک ده‌رده‌هێنێت له ئاگر به‌ده‌ستی خۆی .

**٦٤** - وينظرُ أهلُ الجنَّةِ إلى وجهِهِ، ويزورونه، فيُكرِمُهُم، ويَتجلَّى لهم، فيُعطيهم .

**٦٤** - وه ئه‌هلی به‌هه‌شت سه‌یری ڕووی الله تعالى ده‌که‌ن، سه‌ردانی ده‌که‌ن، ئه‌ویش ڕێزیان لێ ده‌گرێت، وه خۆی بۆیان ده‌رده‌خات و پێیان ده‌به‌خشێت .

**٦٥** - ويُعرَضُ عليه العبادُ يومَ الفصلِ والدِّينِ، فيتَولَّى حِسابَهُم بنفسِهِ، لا يُولِّي ذلك غيرَهُ .

عزَّ رَبُّنا وجلَّ وهو على ما يشاءُ قدير .

**٦٥** - له ڕۆژی لێپرسینه‌وه‌دا به‌نده‌کان ڕاده‌وه‌ستن، الله تعالى خۆی لێپرسینه‌وه‌یان له‌گه‌ڵ ده‌کات، جگه له الله هیچ که‌سێک ئه‌و کاره ناکات .

عزَّ ربُّنا وجلَّ که به‌سه‌ر هه‌ر شتێک بیه‌وێت توانای هه‌یه .

**٦٦** - والقرآنُ كلامُ الله، تكلَّمَ به، ليس بمخلوقٍ، فمَن زعمَ أن القرآنَ مخلوقٌ فهو جهميٌّ كافرٌ .

٦٦ - وه قورئان وته و كه‌لامی الله يه، قسه‌ی پێ كردووه، درووستكراو نييه، هه‌ر كه‌سێك پێی وابێت درووستكراوه، ئه‌وا جه‌همی و كافره .

٦٧ - ومن زعمَ أن القرآنَ كلامُ الله ووقفَ ولم يقل : ليسَ بمخلوقٍ، فهو أكفرُ مِن الأوَّلِ، وأخبثُ قولًا .

٦٧ - وه هه‌ر كه‌سێك پێی وابێت قورئان كه‌لامی الله يه به‌ڵام وه‌ستا و نه‌يووت : درووستكراو نييه، ئه‌وا ئه‌و كه‌سه كافرتره له كه‌سی يه‌كه‌م، وه قسه‌كه‌ی پيستره .

٦٨ - ومَن زعمَ أن ألفاظنا بالقرآنِ وتلاوَتَنا له مخلوقَةٌ، والقرآنُ كلامُ الله، فهو جهميٌّ خبيثٌ مُبتدعٌ .

٦٨ - وه هه‌ر كه‌سێك پێی وابێت قسه پێكردنمان - ده‌ربڕينمان - به قورئان و خوێندنه‌وه‌مان بۆی درووستكراوه، وه قورئان وته‌ی الله يه، ئه‌وا ئه‌و كه‌سه جه‌همييه‌كی پيس و بيدعه‌چييه .

**٦٩** - ومَن لم يُكفِّر هؤلاءِ القومَ، والجهميَّةَ كُلّهم فهو مِثلُهُم .

**٦٩** - وه هەر کەسێک ئەو کەسانە کافر نەکات، وه جەهمییەکان گشتیان، ئەوا وەک ئەوانە .

**٧٠** - وكلَّمَ الله مُوسى تكليمًا، وناوله التَّوراةَ مِن يدِهِ إلي يدِهِ، ولم يزل الله مُتكلِّمًا عالمًا، فتباركَ اللّهُ أحسنُ الخالقين .

**٧٠** - وه الله بەقسە کردن قسەی کردووه لەگەڵ موسا علیه السلام و تەوڕات ی پێداوه لەدەستی خۆیەوه بۆ دەستی ئەو، وه هەمیشە و بەردەوام الله قسەکەر و زانایە، بۆیە پاک و بێگەردە الله ی باشترین بەدیهێنەر .

**٧١** - والرُّؤيا مِن الله عزوجل وهي حَقٌّ، إذا رأى صاحِبُها شيئًا في منامِهِ ممَّا ليس هو ضِغْثٌ، فقصَّها على عالِمٍ، وصدقَ فيها، وأوَّلها العالمُ على أصلِ تأويلها الصَّحيحِ ولم يُحرِّف، فالرُّؤيا وتأويلُها حِينئذٍ حقٌّ .

وقد كانت الرُّؤيا مِن النَّبيين وحيًا .

فأيُّ جاهلٍ أجهل ممن يَطعنُ في الرُّؤيا، ويزعُمُ أنها ليست بشيءٍ .

وبلغني أن من قال هذا القول لا يرى الاغتسال من الاحتلام .

**٧١** - وه خەون بینین لە الله عزوجل ەوەیە، ڕاستە و حەقە، ئەگەر هاوەڵەکەی بینی لە خەودا لەو خەوانە نەبێ کە درۆ و پووچن و گێڕایەوە بۆ زانایەک بە خەون لێکدانەوە، وە ڕاستگۆ بوو تیایدا و زاناکەش لێکیدایەوە لەسەر بنچینەی لێکدانەوە ڕاستەکەی خۆی و نەیگۆڕی، ئەوکات خەونەکە و لێکدانەوەکەی ڕاستن إن شاء الله .

وە خەون بۆ پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام وەحی و سروش بووە .

بۆیە چ نەزانێک لەوە نەزانترە کە تانە دەدات لە خەون، وە پێی وایە هیچ نییە .

وە پێم گەیشتووە ئەو کەسەی ئەو قسەیە دەکات خۆشۆردن لەدوای لەشگرانی لەخەودا بەدرووست نازانێت .

**٧٢** - وقد رُوى عن النبي ﷺ : أنَّ رُؤيا المُؤمِنِ كلامٌ يُكلِّمُ به والرَّبُّ عبده .

**٧٢** - وە گێڕدراوەتەوە لە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (خەونی ئیمانداران قسە کردنێکە کە الله عزوجل قسە دەکات تیایدا لەگەڵ بەندەکەی) .

**٧٣** - وقال : الرُّؤيا مِن اللهِ، وباللهِ التَّوفيق .

ومِن السُّنَّةِ الواضحةِ البيّنةِ الثَّابتةِ المعروفةِ :

**٧٣** - وە فەرموویەتی : (خەونی خۆش لە لایەن الله وەیە)، وبالله التوفيق .

---

(رواه البخاري : ٥٧٤٧) - (ومسلم : ٥٩٥٩) له حەديسى أبي قتادة الأنصاري رضي الله عنه .

## وەلە سوننەتە ئاشكرا و ڕوون و جێگیر و زانراوەكان بریتیە لە :

**٧٤** - ذِكرُ مَحاسِنِ أصحابِ رسولِ الله ﷺ كُلِّهم أجمعين، والكفُّ عن ذِكرِ مساوئِهم، والذي شجرَ بينهُم .

**٧٤** - باسكردنى باشى و جوانييەكانى هاوەڵانى رسول الله ﷺ گشتيان، وە دەست هەڵگرتن خۆگرتنەوە لە باسكردنى هەڵەكانيان، وە ئەوەى لەنێوانيان ڕوويداوە .

**٧٥** - فمن سَبَّ أصحابَ رسولِ الله ﷺ، أو أحدًا منهُم، أو تنقَّصَهُ، أو طعنَ عليهم، أو عرَّضَ بِعيبِهم، أو عابَ أحدًا مِنهم بقليلٍ أو كثيرٍ، أو دِقٍ أو جِلٍ، مما يُتطرَّقُ به إلى الوقيعةِ في أحدٍ منهم فهو مُبتدعٌ، رَافِضيٌّ، خبيثٌ، مخالفٌ، لا قَبِلَ الله صرفَهُ، ولا عدلَهُ بل حُبُّهم سُنَّةٌ، والدُّعاءُ لهم قُربَةٌ، والاقتِداءُ بهم وسِيلةٌ، والأخذُ بآثارِهم فضيلةٌ .

**٧٥** - هەر كەسێك جنێو بدات بە هاوەڵانى رسول الله ﷺ، يان يەكێك لەوان، يان لێى كەم بكاتەوە - واتە لەڕێزيان كەم بكاتەوە - ، يان تانەيان لێبدات، يان

عەیبەکانیان نیشان بدات، یان یەکێک لەوان عەیبدار بکات بەکەم یان بە زۆر، شاراوەبێ یان ئاشکرا، لەو شتانەی سەردەکێشێ بۆ جنێودان و غەیبەتکردن و عەیبدارکردنیان، ئەوا ئەو کەسە بیدعەچی و ڕافیزەیەکی پیس و پێچەوانیکارە بۆ قورئان و سوننەت، الله نە فەرز نە سوننەتی لێ وەرناگرێت، بەڵکو خۆشویستنیان لەسوننەتەوەیە، وە دوعا کردن بۆیان نزیکبوونەوەیە لە الله عزوجل، وە کردنیان بە پێشەنگ و چاولێکردنیان وەسیلەیە، وە گرتنەبەری ڕێباز و شوێنەواریان فەزڵێکی گەورەیە .

٧٦ - وخيرُ الأُمّةِ بعد النَّبي ﷺ : أبو بكرٍ، وخيرُهُم بعد أبي بكر : عُمَر، وخيرُهم بعد عُمر : عُثمان .

٧٦ - وە باشترین کەس لە ئوممەت دوای رسول الله ﷺ أبوبکرە، وە باشترینیان دوای أبوبکر عمرە، وە باشترینیان دوای عمر عثمان ە .

٧٧ - وقال قومٌ مِن أهلِ العلمِ وأهلِ السُّنَّةِ : وخيرُهم بعد عثمان : علي .

٧٧ - وە کۆمەڵێک لە اهلی عیلم و سوننەت دەڵێن : باشترین کەس دوای عثمان علی یە .

**٧٨** - ووقفَ قومٌ على عُثمانَ .

**٧٨** - وه كۆمه‌ڵێكیش له‌سه‌ر عثمان وه‌ستاون .

**٧٩** - وهم خُلفاءُ راشِدُون، مهديُّونَ .

**٧٩** - وه ئه‌وانه جێنشینه هیدایه‌تدراوه‌كانن .

**٨٠** - ثُم أصحابُ مُحمد ﷺ بعد هؤلاءِ الأربعةِ خيرُ النَّاسِ .

**٨٠** - پاشان له‌دوای ئه‌م چوارانه‌وه هاوه‌ڵانی محمد ﷺ باشترین كه‌سن له‌سه‌ر زه‌وی .

**٨١** - لا يجوزُ لأحد أن يذكُرَ شيئًا مِن مساوئهم، ولا يطعنُ على أحد منهم بعيب، ولا بنقص، ولا وقيعة .

فمن فعل ذلك فالواجبُ على السُّلطانِ :

تأدِيبُهُ، وعقوبتُهُ، ليس له أن يعفوَ عنه بل يُعاقِبُهُ ثم يستتيبُهُ، فإن تاب قَبِلَ مِنهُ، وإن لم يَتُب أعادَ عليه العُقوبةَ، ثم خلَّدَهُ الحبس حتَّى يتوبَ ويُراجِعَ .

فهذا السُّنةُ في أصحابِ محمد ﷺ .

**٨١** - بۆ هیچ کەسێک درووست نییە هیچ شتێک لە خراپیەکانیان باس بکات - واتە ئەو کێشە و ناکۆکیانەی نێوان هاوەڵان هەیە نابێت باس بکرێت - ، وە نابێت تانە لە هیچ یەکێک لەوان بدات بە عەیبێک، وە نە بەکەموکوڕیەک، وە نە بە لەکەدارکردنێک .

هەر کەسێک ئەو کارە بکات، ئەوا واجبە لەسەر فەرمانڕەوا : تەمبێ بکات و سزای بدات، بۆی نییە لێی خۆشبێت، بەڵکو سزای دەدات پاشان داوای تەوبەی لێدەکات، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوا لێی قبوڵ دەکرێت، ئەگەر تەوبەی نەکرد، ئەوا دووبارە سزا دەدرێتەوە، پاشان بەند دەکرێت بۆ هەمیشە تاوەکو تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە .

ئەوەیە سوننەت بەرامبەر هاوەڵانی رسول الله ﷺ .

---

: ئەگەر فەرمانڕەوا ئەوەی کە لەسەری بوو ئەنجامی نەدا لە تەوبەکردن پێی و بەند کردنی، ئەوا لەسەرت واجبە کەوا خۆت هەجری بکەیت و پەیوەندی بپچڕێنیت .

هەروەکو ئیمامی الآجري لە [**الشريعة : ١١٠٩/٣**] دەربارەی حوکمی ئەوکەسەی کە دەڵێ قورئان مەخلوقە دەڵێت : ئەوکەسەی بڵێ قورئان مەخلوقە کافرە، تەوبەی پێدەکرێت، ئەگەر تەوبەی کرد و لەو مەزهەبە خراپە پاشگەزبویەوە ئەگەرنا ئیمام دەبێ بیکوژێت، ئەگەر ئیمام نەیکوژێت و تەوبەی پێ نەکرد، وە دەشیزانی کە ئەو مەزهەبەی هەیە، ئەوا دەبێت هەجری بکەیت و قسەی لەگەڵ نەکەی، وە سەلامی لێنەکەی، وە نوێژی لە دواوە نەکەی، وە شایەتیدانی لێ قبوڵ ناکرێت، وە مسوڵمان کچی خۆی لێ مارە ناکات .

**٨٢** - ويَعرفُ للعربِ حقَّها، وفضلها، وسابِقتَها، ويُحبُّهم .

**٨٢** - وه حەق و فەزڵ و ڕابردووی عەڕەب بزانیت و خۆشیانت بوویت - واتە عەڕەبی مسوڵمان - .

**٨٣** - لحديثِ رسولِ اللَّه ﷺ : حُبُّ العربِ إيمانٌ، وبُغضُهُم نِفاقٌ .

**٨٣** - بەهۆی فەرموودەی رسول الله ﷺ : (خۆشەویستی عەڕەب لە ئیمانەوەیە، وە ڕق لێبوونیشیان دووڕووییە) .

**٨٤** - ولا نقولُ بقول الشُّعوبيَّةِ، وأراذلِ الموالي الذين لا يُحبُّون العربَ، ولا يُقِرُّونَ لها بفضل فإنَّ قولَهم بدعةٌ وخِلافٌ .

**٨٤** - وه هەرگیز هەمان قسەی الشُّعوبيَّة - نەتەوە پەرستەکان - و بێ دەسەڵات و پەککەوتەکانی نێو موالیەکان ناکەین کە عەڕەبیان خۆشناوێت، وە دان نانێن بەفەزڵ و گەورەییان، بەڕاستی وتەکەیان بیدعە و پێچەوانەیە .

**٨٥** - ومَن حرَّمَ المكاسِبَ، والتِّجاراتِ، وطلبَ المالِ مِن وجوهِهَا فقد جَهِلَ، وأخطأ، وخالَفَ، بل المكاسِبُ مِن وجُوهِها حَلالٌ، فقد أحَلَّها اللَّهُ عزوجل، ورسولُهُ ﷺ، والعلماءُ مِن الأُمَّةِ .

فالرَّجلُ ينبغي له أن يسعى على نفسِهِ وعِيالِهِ، ويبتغي مِن فضلِ رَبِّهِ، فإن تركَ ذلك على أنَّه لا يرى الكسبَ فهو مُخالِفٌ .

**٨٥ -** وه هەر كەسێك كاركردن و بازرگانی و داواكردنی ماڵ بەشێوازی خۆی حەرام بكات - واتە بڵێت تەنیا عیبادەت دەكەم كار ناكەم - ، ئەوا نەزانە، وە هەڵەی كردووە، وە پێچەوانەكارە، بەڵكو كاركردن بە شێوازی خۆی حەڵاڵە، بەڕاستی الله عزوجل و پێغەمبەرەكەی ﷺ، وە زانایانی ئوممەت حەڵاڵیان كردووە - مەبەست لە زانا ئەوەیە كە ئەوانیش دەربارەی كاركردن قسەیان نەكردووە ئەگینا حەڵاڵ و حەرام بەدەست زانا نییە - .

پێویستە لەسەر پیاو كەوا هەوڵ بدات بۆ بژێوی ژیانی خۆیی و خێزانەكەی، دەیەوێت فەزڵ و ڕەزامەندی پەروەردگاری بەدەست بێنێت، هەر كەسێك واز لەوە بێنێت دەربارەی ئەوەی كاركردن بەحەڵاڵ نازانێت ئەوا كەسێكی پێچەوانیكارە.

---

: لەبەر حەدیسەكەی وهب بن جابر كە دەڵێت : مەولایەكی عبد الله بن عمرو بە عبداللە ی وت : من دەمەوێت ئەم مانگە لێرە نیشتەجێ بم لە بیت المقدیس .

پێی وت : ئایا بۆ خێزانەكەت بژێوی ئەم مانگەت بۆ كەس و كارەكەت بەجێ هێشتووە؟

وتی : نەخێر .

عبدالله وتی : دە بگەڕێوە بۆ لای كەس و كارەكەت و بژێویان بۆ بەجێ بهێڵە، چونكە بەڕاستی من لە رسول الله م بیست ﷺ كە دەفەرموێت : (ئەوەندە بەسە كە تاوان بۆ كەسێ بنوسرێ كە واز لەو كەسانە بهێنێ كە پێویستە پارەی بژێویان بۆ دابین بكات)، **(رواه أحمد : ٦٨٤٢)** حەدیسەكەش صحیحە .

**٨٦** - وكُلّ أحد أحقُّ بمالِهِ الذي ورِثَهُ، أو استفادَهُ، أو أصابَهُ، أو اكتسبَهُ، لا كما يقول المُتكلِّمون المُخالفون .

**٨٦** - وه هەر کەسێک شایستەترە بەو ماڵەی کە بەمیرات بۆی دەمێنێتەوە، یاخود بەدەستی بێنێت، یان بەڕێگەی شەرعی بەدەستی بێنێت، یان بەکارکردن دەستی بکەوێت، نەک هاوشێوەی وتەی اهلی کەلام ی سەرپێچیکار .

---

: اهلی کەلام پێیان وایە کە دەبێت هەموو کەس لە میرات و غەنیمەت و کارکردن .... هتد ماڵەکەی یەکسان بێت، ئەگەرچی کەسی بەرامبەر ماندووتر بێت یانیش شایستەتر بێت .

**٨٧** - والدِّينُ إنَّما هو :

كِتابُ اللَّه عزوجل، آثارٌ، وسُنَنٌ، ورِواياتٌ صِحاحٌ عن الثِّقاتِ بالأخبارِ الصَّحيحة القويةِ المعروفة المشهورةِ .

يرويها الثِّقةُ الأوَّلُ المعروف عن الثَّاني الثِّقة المعروف .

يُصدِّقُ بعضُهم بعضًا، حتَّى ينتهي ذلك إلى النبي ﷺ، أو أصحاب النبيِّ، أو التَّابعينَ، أو تابعِ التَّابعين، أو مَن بعدهم مِن الأئمةِ المعروفِين المُقتدى بهم، المُتمسِّكين بالسُّنَّةِ، والمُتعلِّقين بالأثرِ، الذين لايُعرَفون ببدعة، ولا يُطعنُ عليهم بكَذِب، ولا يُرمون بخلاف .

وليسوا أصحاب قياسٍ، ولا رأي لأن القياسَ في الدِّينِ باطلٌ، والرَّأي كذلك، وأبطل منِهُ .

٨٧ - وە دین - دینی ئیسلام - لەڕاستیدا بریتیە لە :

کیتابی الله عزوجل، وە شوێنەواری رسول الله ﷺ، و سوننەت، وە ڕیوایەتی ڕاست و درووست لە کەسانی جێی متمانە و بە هەواڵی ڕاست و درووستی بەهێز و ناسراو و بەناوبانگ .

کەوا کەسی ناسراو و متمانەپێکراوی یەکەم گێڕاویەتەوە لە کەسی ناسراو و متمانەپێکراوی دووەم .

هەندێکیان هەندێکی تریان بەڕاست دەخەنەوە، تاوەکو کۆتایی دێت و دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ، یان هاوەڵانی پێغەمبەر، یان تابعین، یان اتباعی تابعین، یاخود یەکێک لەدوای ئەوانەوە لە پێشەوای ناسراو کەوا کراونەتە پێشەنگ و چاویان لێدەکرێت، ئەوانەی کە دەستیان گرتووە بە سوننەت، وە پەیوەستن بە ئاثارەوە، ئەوانەی کە بە خاوەن بیدعە ناویان نەهاتووە، وە نە تانەیان لێدراوە بە درۆکردن، وە تۆمەتی پێچەوانیکاریان نەدراوەتە پاڵ .

ئەوانەی کە خاوەن قیاس و بۆچوون نین، چونکە قیاس لەدیندا پووچە - واتە ئەو قیاسەی کە زەمکراوە لای زانایان باتڵە - ، وە بۆچونیش بەهەمان شێوە، لە قیاس پووچترە .

٨٨ - وأصحابُ الرَّأيِ والقياسِ في الدِّينِ : مُبتدِعةٌ جهلةٌ ضُلَّالٌ إلّا أن يكون في ذلَك أثرٌ عمن سلفَ مِن الأئمةِ الثِّقاتِ، فالأخذُ بالأثرِ أولى .

٨٨ - وه خاوەنی بۆچوون و قیاس لەدیندا : بیدعەچی و نەزان و گومڕان، ئیللا مەگەر لەوەدا اثرێک هەبێ لەوانەی پێشوو - واتە اثرێک هەبێت لە سەلەفەوە - لە پێشەوا متمانەدارەکان، بۆیە دەستگرتن بە أثرەوە لەپێشترە .

---

: لە (الرسالة الواضحة : (٦٢٩/٢) محمد بن عبدالعزيز (٢٤١ ه) دەڵێت : هاوەڵانی قیاس و بیروبۆچوون لە دیندا موبتەدیع و گومڕان، دەرچوونە لە میلەتی ئیسلام، چونکە هاوەڵانی ڕەئی و قیاس لەدیندا دەیانەوێت کتاب وسوننەت پەکبخەن، وە زانست و ئەثەر پوچەڵ بکەنەوە، وە خۆیان جیا بکەنەوە بە ڕەئی و قیاسیان کە کردوویانە .

٨٩ - ومَن زعم أنّه لا يرى التقليدَ، ولا يُقلِّدُ دِينَهُ أحدًا فهذا قولُ فاسِقٍ مُبتدع، عدوّ لله ولرسولِهِ ﷺ، ولدينِهِ، ولكتابِهِ، ولسُنَّةِ نبيهِ عليه الصَّلاة والسَّلام .

وإنَّما يُريُد بذلك إبطالَ الأثرِ، وتعطيلَ العِلمِ، وإطفاءَ السُّنَّةِ، والتَّفرُّدَ بالرَّأيِ، والكلامِ، والبدعةِ، والخلافِ .

فعلى قائلِ هذا القولِ لعنةُ الله ، والملائكةِ، والنَّاسِ أجمعين .

فهذا مِن أخبثِ قولِ المُبتدعة، وأقربها إلى الضَّلالةِ والرَّدى بل هو ضَلالةٌ زعم أنَّه لا يرى التَّقليدَ، وقد قلَّدَ دِينَهُ أبا حنيفةَ، وبشرًا المريسي، وأصحابَهُ .

فأيُّ عدوٍّ لدينِ الله أعدى ممن يريدُ أن يُطفئَ السُّنن، ويُبطلَ الآثارَ والرِّوايات، ويزعمُ أنَّه لا يرى التَّقليدَ، وقد قلَّدَ دينَهُ مِن قد سميتُ لك، وهُم أئمَّة الضَّلالِ، و رؤوسُ البدعِ، وقادةُ المُخالفين .

فعلى قائل هذا القول غضبُ الله .

**٨٩** - هەر کەسێک پێی وابێت کەوا نابێت شوێن هیچ کەسێک بکەویت، وە دینەکەی شوێنکەوتەی هیچ کەسێک نەبێت - وەک شوێنکەوتەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ، و تابعين و اتباعی تابعين - ، ئەمە وتەی فاسق و بیدعەچییە، دوژمنە بۆ الله و رسول ەکەی ﷺ، وە دینەکەی، وە بۆ کتێبەکەی، وە بۆ سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ .

بەمە دەیەوێت أثر پووچ و بەتاڵ بکاتەوە، وە زانست و علم پەک بخات، وە ڕووناکی سوننەت بکوژێنێتەوە، وە تاک و دەگمەن بێ لە ڕەئی و بیروبۆچوون و قسە و بیدعە و خیلاف و دووبەرەکی .

لەعنەتی الله و فریشتەکان و گشت خەڵکی، لەو کەسە بێت کە ئەو قسەیە دەکات .

ئا ئەمە پیسترین وتەی بیدعەچییەکانە، وە نزیکترینە لە گومڕایی و تیاچوون، بەڵکو ئەوە گومڕاییە، ئەوەی پێی وابێت کە نابێت شوێنکەوتەی هیچ کەس بیت، وە ئەمانە دینەکەیان شوێنکەوتەی أبا حنيفة و بشر المريسي و هاوەڵاکانیەتی - واتە ئەوانەی کە پێیان وایە نابێت شوێنکەوتەی هیچ کەسێک بیت، ئەوا ئەوانە دینەکەیان شوێنی أبا حنيفة و بشر المريسي و هاوەڵەکانی ئەمانەیە - .

کێ لەو کەسە دوژمنترە بۆ الله کە دەیەوێت ڕووناکی سوننەت بکوژێنێتەوە، وە ئاثار و ڕیوایەتەکان پوچەڵ بکاتەوە، وە پێی وابێت کە نابێت شوێن هیچ کەس بکەویت، وە دینەکەی شوێنی ئەوە کەوتووە کە لەپێشوو ناوم هێنان بۆت - مەبەست پێی ئەوانەی ناوی هێناوە : أبا حنيفة و بشر المريسي و هاوەڵەکانی، والله اعلم - ، ئەمانە پێشەوایی گومڕان، وە سەرانی بیدعەچییەکانن، وە سەرۆکی پێچەوانەکارانن .

تورەیی الله دابەزێتە سەر خاوەنی ئەم قسەیە .

---

: تەقلید لای سەلەف و پێشەوایان سوننەت واتە شوێنکەوتنی ئاثار و هاوەڵان رضوان الله علیهم، وە هەرچی ئەوان موافەقەیان کردووە لە زانایانی سەلەف، کە ئەمەش تەقلیدێکی چاکە و خۆشویستراوە،

بەڵام ئەو تەقلیدەی کە ڕێگری لێکراوە لای زانایانی سەلەف ئەوەیە کە تەقلیدی شتێ بکەیت و شوێنی بکەویت بێ بوونی هیچ بەڵگەیەک و ئەثەرێک .

**٩٠** - فهذه الأقاويلُ التي وصفت : مذاهبُ أهلِ السُّنَّةِ والجماعةِ، والأثرِ، وأصحابِ الرِّواياتِ، وحملةِ العلم الذين أدركناهُم، وأخذنا عنهم الحديث، وتعلّمنا منهم السُّنَنَ وكانوا أئمَّةً معروفين، ثِقاتًا، أهلَ صدق وأمانة، يُقتدى بهم، ويُؤخذُ عنهم .

ولم يكونوا أصحابَ بدع، ولا خِلاف، ولا تَخليط، وهو قولُ أئمتِهم، وعُلمائِهم الذين كانوا قبلَهُم . فتمسَّكُوا بذلك رَحمكم الله ، وتعلَّموه، وعلِّموه، وبالله التوفيق .

**٩٠** - ئەو قسانەی کەوا باسم کرد : ڕێبازی ئەهلی سوننە و جماعەیە و أثر و هاوەڵانی ڕیوایەتەکانە، وە هەڵگرانی زانست ئەوانەی کەوا پێیان گەیشتووین، وە حەدیسمان لێیان وەرگرتووە، وە فێری سوننەتیان کردووین، وە ئەمانە پێشەوای ناسراو، خاوەن متمانە بوون، ئەهلی ڕاستگۆیی و ئەمانەت پارێز بوون، کەوا دەکرێنە پێشەنگ، وە لێیان وەردەگیرێت .

وە ئەوانە ئەهلی بیدعە نەبوون، وە پێچەوانەکاریش نەبوون، وە تێکەڵکەری حەق و باطل نەبوون، وە ئەمە وتەی پێشەوا، و زاناکانیانە ئەوانەی لەپێش ئەوانەوە بوون .

دەست بەمەوە بگرن ڕەحمەتی اللە تان لێبێت، وە فێری ببن و خەڵکیش فێر بکەن، وە تەوفیق و یارمەتیدانیش هەر لە لای اللە وەیە .

---

: ئیمامی بربهاري لە (**شرح السنة : ٩٨**) دەڵێت : وە بزانە ڕەحمەتی اللە ت لێ بێت کەوا عیلم بەزۆری کتێب و ڕیوایەت نییە، بەڵکو زانا ئەو کەسەیە شوێنی عیلم وسوننەتەکان دەکەوێت، هەرچەندە عیلم و کتێبی کەم بێت، هەر کەسێک لەگەڵ کیتاب و سوننەدا ناکۆك بوو ئەوا خاوەنی بیدعەیە هەرچەندە کتێب و عیلمی زۆر بێت .

**٩١** - ولأصحابِ البدع نبزٌ وألقابٌ وأسماءٌ لا تُشبهُ أسماءَ الصَّالحين، ولا الأئمَّةِ، ولا العلماء مِن أمةِ مُحمد ﷺ فمن أسمائهم :

**٩١** - وه خاوەن بیدعەکان کۆمەڵێک نازناو و لەقەب و ناویان هەیە کە بەناوی پیاوچاکان، و پێشەوایان و زانایان لە ئوممەتی محمد ﷺ ناچێت .

## لە ناوەکانیان :

**٩٢** - المرجِئةُ : وهم الذين يزعُمون : أن الإيمان قولٌ بلا عمل .

وأن الإيمانَ هو القولُ، والأعمالَ شرائع .

وأن الإيمانَ مُجرَّدٌ، وأنَّ النَّاسَ لا يتفاضلون في الإيمان .

وأن إيمانَهُم وإيمانَ الملائكةِ والأنبياءِ واحِدٌ .

وأن الإيمانَ لا يزيدُ ولا ينقُصُ .

وأن الإيمانَ ليسَ فيهِ استثناءٌ .

وأن مَن آمنَ بلسانِهِ ولم يَعمل فهو مؤمنٌ حقًّا، وأنهم مُؤمنون عندَ الله بلا استثناء .

هذا كُلُّهُ قولُ المُرجئة .

وهو أخبثُ الأقاويلِ وأضلّهُ، وأبعده مِن الهُدى .

**٩٢** - المرجئة : ئەوانەن کە پێیان وایە : ئیمان وتەیە بەبێ کردەوە .

وە ئیمان وتەیە، وە کردەوەکانیش تەواوکەری ئیمانن .

وە ئیمان تەنها یەک بەشە، وە خەڵک فەزڵیان بەسەر یەکتردا نییە لە ئیماندا - واتە پێیان وایە هەموو کەس ئیمانی وەک یەکە، هیچ کەس لەویتر بەرزتر نییە - .

وە ئیمانی ئەوان و ئیمانی فریشتەکان و پێغەمبەرەکان وەک یەکە .

وە ئیمان زیاد و کەم ناکات .

وە ئیمان إستثناءی تێدا ناکرێت . - وەک لەپێشوو باسمان کرد، واتە کاتێ کەسێک پێت ئەڵێت باوەڕداری ئەبێت بڵێی : إن شاء الله بڕوادارم، یاخود ئومێدم وایە بڕوادارم .

واتە بڕواداریت دەگەڕێنیتەوە بۆ لای الله، بەڵام مورجیئەکان دەڵێن نابێت بیگەڕێنتەوە بۆ لای الله، پەنا بە الله - .

وە هەر کەسێک بە زمان ئیمان بهێنێت و کاریشی پێنەکات ئەوە ئیماندارێکی ڕاستەقینەیە .

وە ئەوانە ئیماندارن لای الله بێ ئەوەی إستثناء لە ئیمانیاندا بکەن .

ئەمانە هەمووی وتەی مورجیئەیە .

وە ئەمانە پیسترین و گومڕایترین وتەکانیانە، وە دوورترینە لە هیدایەت و ڕێگای ڕاست .

**٩٣** - والقدريَّةُ : وهُم الذين يزعُمون أن إليهم الاستطاعةَ، والمشيئةَ، والقُدرَةَ، وأنَّهم يملِكون لأنفُسِهِم الخير والشَّرَّ، والضَّر والنَّفعَ، والطَّاعةَ والمعصيةَ، والهُدى

والضَّلالةَ، وأن العِبادَ يعملون بِدءًا مِن أنفُسهم، مِن غيرِ أن يكونَ سبقَ لهم في عِلمِ الله
.

وقولُهم يُضارِعُ قولَ المجُوسيَّةِ والنَّصرانيةِ، وهو أصلُ الزَّندقَةِ.

**٩٣** - القدريَّة : ئەوانەن کە پێیان وایە توانست و دەسەڵات و توانا و ویست تەنها بۆخۆیان دەگەڕێتەوە، وە پێیان وایە کە خێر و شەڕ و سوود و زیان و گوێڕایەڵی و سەرپێچی و هیدایەت و گومڕایی، بۆ نەفسی خۆیان بەدەست خۆیانە، وە پێیان وایە کارو کردەوەی بەندەکان سەرەتا لەخۆیانەوە دەست پێدەکات - واتە پێیان وایە بەندەکان کردەوەی خۆیان دروست دەکەن، والعیاذ باللە - ، بێ ئەوەی ئەمە پێشتر لە علمی اللە دا هەبووبێ - واتە پێیان وایە ئەو کردەوانەی بەندەکان دەیکەن پێشتر لە علمی اللە دا نەبووە و اللە نەیزانیوە، والعیاذ باللە - .

وە قسەکەیان پێشبڕکێ دەکات لەگەڵ قسەی ئاگرپەرست و نەسڕانییەکان، وە ئەمە بنچینەی زەندیقیەتە.

**٩٤** - والمُعتزِلَةُ : وهم يقولون بقول القدريَّةِ، ويدينون بدينهم، ويُكذِّبون بعذابِ القبرِ، والشَّفاعةِ، والحوضِ، ولا يرون الصَّلاةَ خلفَ أحد مِن أهلِ القبلةِ، ولا الجمعةَ إلا مَن كان على مِثلِ رأيهم وهواهم، ويزعُمون أن أعمالَ العبادِ ليست في اللَّوحِ المحفوظِ
.

**٩٤** - المُعتزِلة : ئەوانەن کە هەمان قسەی قەدەرییەکان دەکەن، وە بە دینی ئەوان دینداری دەکەن، وە عەزابی قەبر و شەفاعەتی رسول الله ﷺ و حەوزی کوثر بەدرۆ دەخەنەوە، وە نوێژ کردن لەدوای هەر کەسێک لە أهلی قیبلە بەدرووست نازانن، وە نە نوێژی جومعەش، ئیللا مەگەر کەسێک بێت کە لەسەر هەمان ڕاو و بۆچوون و هەواو ئارەزووی ئەوان بێت، وە پێیان وایە کاروکردەوەی بەندەکان لە لوح المحفوظ دا نییە .

**٩٥** - والبكريَّةُ : وهم القدريَّةٌ،

وهم أصحابُ الحبَّةِ، والقِيراطِ، والدَّانِقِ، الذين يزعُمون أن مَن أخذ حبَّةً، أوقِيراطًا، أو دانِقًا حرامًا فهو كافرٌ، وقولُهُم يُضاهِئ قول الخوارجِ .

**٩٥** - البکريَّة : ئەوانیش قەدەرین، وە ئەوانن خاوەن دەنک و قیڕات و دانق، ئەوانەی کە پێیان وایە ئەو کەسەی دەنکێک یان قیڕاتێک یان دانقێک ببات بەحەرامی ئەوا کافر دەبێت، وە قسەکەیان هاوشێوەی قسەی خەواریجەکانە .

: دەنک : مەبەستی دەنکە گەنمێک یان جۆیەکە، وە قیڕات نیوەی دانق ە، دانقیش شەشیەکی درهەمێکە .

**٩٦** - والجهميةُ : أعداءُ اللهِ وهم يزعُمون أن القرآنَ مخلوقٌ، وأنَّ اللهَ عزوجل لم يُكلِّم مُوسى، وأنَّ اللهَ لا يتكلَّمُ، ولا يُرى، ولا يُعرفُ للهِ مكانٌ، وليس للهِ عرشٌ، ولا كرسيٌّ، وكلام كثيرٌ أكرَهُ حِكايتهُ .

وهُم كُفَّارٌ زنادِقةٌ أعداءُ اللهِ فاحذروهم .

**٩٦** - الجهمية : دوژمنی الله ن، ئەوانەن کە پێیان وایە قورئان درووستکراوە - مخلوق - ، وە پێیان وایە الله قسەی لەگەڵ موسی علیه السلام نەکردووە، وە الله قسە ناکات و نابینرێ، وە شوێنی الله نازانرێت، وە الله عەرش و کورسی نییە، وە قسە گەلێکی زۆر کە رقم لێیە بیگێڕمەوە .

ئەوانە کافر و زەندیقن دوژمنی الله ن ئاگاداریان بە .

**٩٧** - والواقفة : وهُم الذين يزعمون أنا نقولُ : إنَّ القرآنَ كلامُ اللهِ، ولا نقول : غيرَ مخلوق، وهُم شرُّ الأصنافِ وأخبثُها .

**٩٧** - الواقفية : ئەوانەن کە بڕوایان وایە و دەڵێن : قورئان کەلام و وتەی الله یە، وە ناڵێین درووستکراو نییە .

وە ئەوان خراپترین و پیسترین جۆرن .

**٩٨** - واللفظيةُ : وهمُ الذين يزعمون أنا نقولُ : إنَّ القرآن كلامُ الله، ولكن ألفاظَنَا بالقرآنِ وتلاوتَنَا وقراءتَنَا لهُ مخلوقة . وهُم جهميةٌ فُسَّاقٌ .

**٩٨** - اللفظيّة : ئەوانەن کە پێیان وایە و دەڵێن : قورئان کەلام و وتەی اللە یە، بەڵام قسەکردنمان پێی و دەربڕینمان بۆ لەفزەکانی قورئان و تیلاوەت و خوێندنەوەمان بۆی درووستکراوە .

ئەوانە جەهمی و زۆر فاسقن و دەرچوون لە فەرمانی اللە.

**٩٩** - والرَّافضةُ : وهُم الذين يَتبرَّؤون مِن أصحابِ النبيِّ ﷺ، ويسبُّونَهم، ويَنتقِصُونَهم، ويُكفِّرون الأمَّةَ إلَّا نفرًا يسيرًا .

وليستِ الرَّافِضةُ مِن الإسلامِ في شيء .

**٩٩** - الرَّافِضة : ئەوانەن کە خۆیان بەری دەکەن لە هاوەڵانی رسول اللە ﷺ و جنێویان پێ دەدەن و کەموکوڕییان لێدەگرن و لە شکۆ و ڕێزیان کەم دەکەنەوە، وە هەموو ئوممەت کافر دەکەن ئیللا کەسانێکی کەم نەبێت .

وە ڕافیزە لەهیچ بەشێکدا لە ئیسلام نین .

**١٠٠** - والمنصورية : وهُم رافضةٌ أخبثُ الرَّوافضِ .

وهُم الذين يقولون : مَن قتلَ أربعين رجلًا مِمن خالف هواهم دخلَ الجنَّةَ .

وهُم الذين يَخنقون النَّاسَ، ويَستحِلُّون أموالهم .

وهُم الذين يقولون : أخطأ جبريلُ عليه السَّلام بالرِّسالة .

وهذا هو الكُفُر الواضحُ الذين لا يَشُوبُهُ إيمانٌ .

فنعوذُ بالله، ونعوذُ بالله .

١٠٠ - المنصوريّة : ئەوانیش ڕافیزەن لە پیسترینی ڕافیزەکانن .

ئەوانەن کە دەڵێن هەر کەسێک چل کەس بکوژێت لەوانەی کە پێچەوانەی هەواو ئارەزوویانە - مەبەستیان پێی ئەهلی سوننەیە - دەچێتە بەهەشتەوە .

ئەوانەن کە خەڵکی دەخنکێنن و ماڵ و سامانیان حەڵاڵ دەکەن .

ئەوانەن کە دەڵێن : جبریل لە وەحی و پەیامەکەیدا هەڵەی کردووە، ئەمە ئەو کوفرە ڕوون و ئاشکرایە کە هیچ ئیمان و باوەڕێکی تێکەڵ نابێت .

پەنادەگرین بە الله، پەنادەگرین بە الله .

١٠١ - والسَّبائيةُ : وهم رافضةٌ كذَّابون، وهُم قرِيبٌ ممن ذكرتُ مُخالِفون للأُمَّةِ .

والرَّافِضةُ أسوأُ أثرًا في الإسلامِ مِن أهل الكُفرِ مِن أهلِ الحربِ .

١٠١ - السَّبائية : ئەوانن ڕافیزە درۆزنەکان، وە ئەوان نزیکن لەوانەی باسم کردن پێچەوانیکاری ئوممەتن .

وە ڕافیزە شوێنەوار و جێ دەستیان خراپترە بۆ سەر ئیسلام لە ئەهلی کوفر و ئەهلی جەنگ و قیتال .

**١٠٢** - وصِنفٌ مِن الرَّافضةِ يقولون : عليٌّ في السَّحابِ، ويقولون : عليٌّ يُبعثُ قبل يوم القيامةِ . وهذا كُلُه كذِبٌ، و زُورٌ، وبُهتانٌ .

**١٠٢** - وە گروپێک لە ڕافیزە دەڵێن : ئیمامی علي لە ئاسمانە، وە دەڵێن علي زیندوو دەکرێتەوە پێش ڕۆژی قیامەت .

وە هەموو ئەمانە درۆ و خراپە و بوهتانە .

**١٠٣** - والزيديةُ : وهم رَافِضةٌ، وهم الذين يتبرؤون مِن : عثمان، وطلحةَ، والزُّبيرِ، وعائشةَ، ويرون القِتالَ مع كُلِّ مِن خرجَ مِن ولدِ علي، برًّا كان أو فاجِرًا، حتَّى أو يَغلِبَ أو يُغلَبَ .

**١٠٣** - الزَّيديّة : ئەوانیش ڕافیزەن، ئەوانەن کە خۆیان بەری دەکەن لە ئیمامی عثمان و طلحة و زبیر و عائشة، وە جەنگ و کوشتار بە ڕەوا دەزانن لەگەڵ هەر کەسێک کە دەربچێت لە ڕۆڵەی ئیمام علي، ئەو کەسە چاکەکاربێ یان خراپەکار، هەتاوەکو زاڵدەبێ بەسەریان یان زاڵدەبن بەسەریدا .

**١٠٤** - والخشبيةُ : وهم يقولون بقولِ الزَّيديَّةِ .

**١٠٤** - الخشبية : وە ئەوانیش هەمان ووتەی الزیدیة کان دەڵێن .

**١٠٥** - والشِّيعةُ : وهم فيما زعموا ينتحلون حُبَّ آلِ محمد ﷺ دون النَّاس وكذبوا، بل هُم خاصَّةً المُبغِضون لآل محمد ﷺ دون النَّاسِ .

إنَّما شيعةُ آلِ محمد المُتَّقون، أهلُ السُّنَّةِ والأثرِ، من كانوا، وحيثُ كانوا، الذين يُحبُّون آل مُحمد، وجميع أصحابِ محمد، ولا يذكرون أحدًا منهم بُسوء، ولا عيب، ولا منقصة .

فمن ذكرَ أحدًا مِن أصحابِ محمد عليه الصَّلاة والسَّلام، بسُوء، أو طعنَ عليهِ بعيب، أو تبرَّأ مِن أحد منهم، أو سبَّهُم، أو عرَّضَ بِسبَّهم، وشَتمِهم، فهو رَافضيٌّ، مُخالفٌ، خَبيثٌ ضَالٌّ .

**١٠٥** - الشِّیعة : وە ئەوان بانگەشەی خۆشویستنی آل ی محمد ﷺ دەکەن، لەکاتێکدا ئاواش نییە، وە درۆ دەکەن، بەڵکو ئەوان بەتایبەتی ڕقیان بۆ آل ی محمد ە ﷺ هەیە جیا لەخەڵکی .

بەڕاستی خۆشەویستانی آل ی محمد ﷺ کەسانی بە تەقوان، ئەهلی سوننە و أثرن، هەر کەسێک بن، وە لە هەرکاتێکدا بن، ئەوانەن کە آل ی محمد ﷺ یا

خۆشدەویت، وە هەموو هاوەڵانی محمد ﷺ، وە باسی هیچ کامێکیان ناکەن بە خراپە، وە نە بەعەیبێک، وە نە بەکەموکورتیەک .

هەر کەسێک باسی یەک لەهاوەڵانی محمد ﷺ باس بکات بە خراپە، یاخود تانەیان لێبدات بە عەیبێک، یاخود خۆی بەری بکەن لەیەکێک لەوان، یان جنێویان پێ بدات، یان بە جنێودان و نەفرەتی لێ کردن دەریانبخات، ئەوە کەسێکی رافیضة یە، سەرپێچیکارە، گومڕایەکی پیسە .

**١٠٦** - وأمَّا الخوارجُ : فمرقوا من الدِّينِ، وفارقوا المِلَّةَ، وشرَدُوا على الإسلامِ، وشذُّوا عن الجماعةِ، وضلُّوا عن سبيلِ الهدى، وخرجوا على السُّلطانِ والأئمَّةِ، وسلّوا السَّيف على الأُمَّةِ، واستحلُّوا دِماءهم وأموالهم، وأكفروا مَن خالفهم، إلَّا مَن قال بقولِهم، وكان على مِثلِ رأيهم، وثبتَ معهم في دارِ ضلالتهم .

وهُم يشتُمون أصحاب محمد عليه الصَّلاة والسَّلام، وأصهارَهُ و أختانَهُ، ويتبرَّؤونَ مِنهم، ويرمونَهُم بالكُفرِ، والعظائِمِ، ويرون خِلافهم في شرائعِ الدِّينِ و سُننِ الإسلامِ .

ولا يُؤمِنونَ بعذابِ القبرِ، ولا الحوضِ، ولا الشَّفاعةِ، ولا يُخرِجون أحدًا مِن أهل النَّارِ .

وهُم يقولون : مِن كَذَبَ كَذبةً، أو أتى صغيرةً، أو كبيرةً مِن الذُّنوبِ فماتَ مِن غيرِ توبة فهو كافِرٌ، فهو في النَّار خالدًا مُخلَّدًا فيها أبدًا .

وهُم يقولون بقولِ البكرِيَّةِ في الحبَّةِ والقِيراطِ .

وهُم قدريَّةٌ، جهميَّةٌ، مُرجِئةٌ، رَافِضةٌ .

ولا يرونَ جماعةً إلَّا خلفَ إمامِهِم .

وهُم يرونَ تأخيرَ الصَّلاةِ عن وقتِها، ويرون الصَّومَ قبلَ رُؤيتِهِ، والفطرَ قبلَ رُؤيتِهِ .

وهُم يرونَ النَّكاحَ بغيرِ وليٍّ، ولا سُلطان، ويرون المُتعةَ في دينهم، ويرون الدِّرهَمَ بالدرهمينِ يدًا بيد حلالًا .

وهُم لا يرونَ الصَّلاة في الخِفافِ، ولا المسحَ عليها . وهُم يرونَ للسُّلطانِ عليهم طاعةً، ولا لقُريش خِلافةً .

وأشياءَ كثيرةً يُخالفون فيها الإسلامَ وأهلَهُ .

فكفى بقومٍ ضلالةً يكونُ هذا رأيهم ومَذهبُهم ودِينهُم .

وليسوا مِن الإسلامِ في شيء . وهُم المارِقَةُ .

**١٠٦** - هەروەها الخوارج : دەرچوونە لەدین، وە جیابوونەتەوە لە کۆمەڵەی مسوڵمانان، وە دووركەوتونەتەوە لە ئیسلام، وە نامۆن لە جەماعەت - بەهۆی گومڕایەکەیانەوە نامۆن لەناو ئەهلی سوننە و جەماعەت - ، وە گومڕا بوون لەڕێگەی هیدایەت، وە دەرچوون لەسەر کاربەدەستان و پێشەوایان، وە شمشێریان هەڵکێشا لەسەر ئوممەت، وە خوێن و ماڵیان حەلاڵ کرد - واتە بەدرووستیان زانیوە کە شمشێر هەڵکێشی لەسەر مسوڵمانان و خوێن و ماڵیان حەلاڵ دەکردن - ، وە ئەوانەیان بەکافر دادەنا کە پێچەوانەی ئەوان بوون، ئیللا ئەوانەی هەمان وتەی ئەوانیان دەووت و لەسەر هەمان

بۆچوونی ئەوان بوو و لەگەڵ ئەواندا دەمانەوە لەناوچە گومڕاییەکەیان - واتە تەنیا ئەوانەی هەمان بیر و بۆچوونیان هەیە، یاخود هەمان قسەی ئەوانیان دەکرد و لەگەڵ ئەوان لەو گومڕاییە دەمانەوە، ئەوا بەکافریان دانەدەنا و خوێنیان حەڵاڵ نەدەکردن، ئەگینا ئەوانیتریان کافر دەکرد و خوێن و ماڵیان حەڵاڵ دەکرد - .

وە ئەوانە جوێن دەدەن بە هاوەڵانی محمد ﷺ، بە ماڵە خەزووران و کچەکانی، وە خۆیان لەوان بەری دەکەن، وە تۆمەتی کوفر و تاوانە گەورەکان دەدەنە پاڵیان، وە بە ڕەوا و گونجاوی دەزانن پێچەوانەی ئەوان بکەنەوە لە شەرائیعی دین و سوننەتەکانی ئیسلام .

وە باوەڕیان نییە بە سزای ناو گۆڕ و نە حەوزی کوثر و نە شەفاعەت، وە بەبیروباوەڕی خۆیان هیچ کەسێک لە ئەهلی دۆزەخ دەرناچێت لە ئاگر .

وە ئەوان دەڵێن : هەر کەسێک درۆیەک بکات، یان تاوانێکی بچووک بکات، یان تاوانێکی گەورە تەوبەی لێ نەکردبێت پاشان بمرێت ئەوا کافرە، ئەو کەسە لەئاگردا دەمێنێتەوە بۆ هەتاهەتایە .

وە ئەوان هەمان قسەی البكرية دەکەن دەربارەی دەنک و قیراط .

ئەوان قەدەری، جەهمی، مرجئة و رافضة ـن .

نوێژی جەماعەتیان پێ درووست نییە ئیللا لەدوای ئیمامی خۆیانەوە نەبێ .

ئەوان بە شیاوی دەزانن نوێژ دوابخرێ لەکاتی خۆی، وە ڕۆژووش بەدرووست دەزانن پێش بینینی مانگ، وە جەژنی ڕەمەزانیش - والله أعلم ڕۆژووشکاندنیش - بەهەمان شێوە .

وە ئەمانە بە جائیزی دەزانن ئافرەت بێ وەلی ئەمر و دەسەڵاتدار هاوسەرگیری بکات، وە بەحەڵاڵی دادەنێن مامەڵەکردنی درهەمێک بە دوو درهەم و دەست بەدەست .

وە ئەوان بەجائیزی نازانن نوێژکردن لەناو خوفەکاندا و بەهەمان شێوە مەسح کردنیشیان .

وە ئەوان گوێڕایەڵی کردنی سوڵتان و دەسەڵاتدار بە درووست نازانن، وە نە بۆ خیلافەتی قوڕەیشییەکانیش .

وە شتانێکی زۆر کە تیایدا پێچەوانەی ئەهلی سوننە دەکەن .

بۆیە بەسە قەوم و کۆمەڵێک گومڕابن کە ئەوە ڕاوبۆچوون و مذهب وڕێباز و دین یان بێت .

ئەوان بە هیچ شتێک نین لە ئیسلامدا، وە ئەوانن دەرچوو لە دین .

**١٠٧** - ومَن أسماءِ الخوارج :

الحَروريّةُ : وهم أهل حَرَورَاء .

والأزارِقَةُ : وهم أصحابُ نافعِ بن الأزرقِ .

وقولُهم أخبثُ الأقاويلِ، وأبعدُها مِن الإسلامِ والسُّنَّة .

والنَّجديَّةُ : وهُم أصحابُ نجدَة بن عامِر الحروري .

والإباضِيَّةُ : وهُم أصحابُ عبد الله بن إباضٍ .

والصِّفريَّةُ : وهُم أصحابُ داود بن النُّعمان، حين قيل له : إنك صِفرٌ مِن العلمِ .

البيَهسيَّةُ، و الميمُونِيَّةُ، و الخازِميَّةُ .

كُلُّ هؤلاءِ خوارج، فُسَّاقٌ، مُخالِفون للسُّنَّةِ، خارِجون مِن الملَّةِ، أهلُ بدعةٍ وضلالة، وهُم لُصوصٌ، قُطَّاعٌ، قد عرفناهُم بذلك .

**١٠٧** - لەناوەکانی خەوارج :

الحَروريَّة : ئەمانە خەڵکی حروراء ن - شارێکە لە کوفە - .

الأزارقة : ئەمانە هاوەڵی نافع ی کوڕی الأزرق ن، وە ووتەکەیان لەپیسترین ووتەکانە، وە دوورترینیانە لەئیسلام و سوننەت .

النَّجديَّة : ئەمانە هاوەڵی نجدة ی کوڕی عامر ی الحروري ن .

الإباضيَّة : ئەمانە هاوەڵی عبد الله ی کوڕی إباض ن .

الصِّفريَّة : ئەمانە هاوەڵی داود ی کوڕی النعمان ن، - وە ناوەکەیان لەوەوە هاتووە - کاتێک پێی ووترا : تۆ سفریت لە زانستدا - واتە تۆ هیچ زانستێکت نییە - .

وه البيهسيَّة و الميمونيَّة و الخازميَّة .

هەموو ئەمانە خەواريج و فاسقن، پێچەوانەی سوننەتیان کردووە، وە دەرچوون لەئیسلام، لە ئەهلی بیدعە و گومڕایین، وە ئەمانە دز و ڕێگرن، وە ئێمە بەمە ئەوانمان ناسیوە - واتە بەدزی کردن و ڕێگری کردن ئەوانمان ناسیوە - .

**١٠٨** - والشُّعُوبِيَّةُ : وهم أصحابُ بدعةِ وضلالة، وهم يقولون : العربُ والمَوالي عندنا واحدٌ، لا يرون للعربِ حقًّا، ولا يعرِفون لهم فَضلًا، ولا يُحبُّونَهُم، بل يُبغِضون العرب، ويُضمِرون لهم الغِلَّ والحسَدَ والبُغضَةَ في قلوبِهم .

وهذا قولٌ قبيحٌ، ابتدعَهُ رَجلٌ مِن أهلِ العِراقِ، وتابعَهُ عليه نفرٌ يسيرٌ، فقُتِلَ عليه .

**١٠٨** - الشُّعوبيَّة : ئەوانە خاوەنی بیدعە و گومڕایین، وە ئەوان دەڵێن : عەرەب و الموالي - بەردەست و هاوکارە مسوڵمانەکانی عەرەب کە غەیرە عەرەبن لە فارس و ئەفریقی و کورد و تورک - لەلامان وەک یەکە، هیچ حەقێک بە عەرەب نادەن، وە بە هیچ فەزڵ و چاکەیەکیشیان نازانن، وە خۆشیان ناوێن، بەڵکو ڕقیان لە عەرەب دەبێتەوە، وە ژەنگ و حەسوودیی و ڕقیان بەرامبەر ئەوان دەشارنەوە لە دڵیاندا .

وە ئەمە وتەیەکی ناشرینە، پیاوێک لە خەڵکی عێراق دایهێناوە، وە خەڵکێکی کەم لەسەر ئەوە شوێنی کەوتوون، پاشان خۆشی لەسەری کوژرا .

**١٠٩** - وأصحابُ الرَّأي : وهُم مُبتدِعةٌ ضُلَّالٌ، أعداءُ السُّنَّةِ والأثرِ، يرون الدِّين رأيًا وقياسًا واستحسَانًا .

وهُم يُخالفون الآثارَ، ويُبطلون الحديث، ويردُّون على الرَّسولِ عليه الصَّلاة والسَّلام، ويتَّخِذُون أبا حنيفةَ ومَن قال بقولِهِ إمامًا، يدينون بدينِهِم، ويقولون بقولِهم .

فأيُّ ضَلالة بأبين مِمنَ قال بهذا، أو كان على مِثلِ هذا يَتركُ قولَ الرَّسُولِ وأصحابِهِ، يتَّبعُ رأيَ أبي حنيفةَ وأصحابِهِ؟!

فكَفَى بهذا غَيًّا مُرديًا، وطُغيانًا، ورَدًّا .

**١٠٩** - أصحابُ الرَّأي : ئەوانە بیدعەچی و گومڕان، دوژمنی سوننەت و ئەثەرن، پێیان وایە دین بە بۆچوون و قیاس و باشبوونە - واتە ئەوەی بەباش بزانن ئەوە پەیڕەو بکەن - .

وە ئەوانە پێچەوانەی ئاثارن، وە حەدیث پوچەڵ دەکەنەوە، وە بەرپەرچی پێغەمبەر ﷺ دەدەنەوە، وە دەستیان گرتووە بە أبا حنیفة و هەر کەسێک هەمان وتەی ئەو بکات بە ئیمامی خۆیان دادەنێن، دینداری دەکەن بە دینی ئەوان، وە قسەکانی ئەوان دەڵێن - واتە تەنانەت ئەو کەسەی وتەی أبا حنیفة ش بڵێت ئەوا بە پێشەوای دەزانن و دەیکەنە پێشەوای خۆیان و دینداری بەو دینە دەکەن کە ئەوان هەیانە، وە هەمان قسەی ئەوان دەکەن - .

چ گومڕاییەک ئاشكراترە لەوەی كەسێك ئەم وتەیە بڵێت، یاخود هاوشێوەی ئەوە بێت، وازبێنێت لە وتەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەكانی، وە شوێنكەوتەی بۆچوونی أبا حنیفة و هاوەڵەكانی بێت .

ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی دینەكەی گومڕا و هەڵگەڕاوە و لەسنوور دەرچوو و ڕەتكەرەوە بێت .

**١١٠** - والـوَلايةُ بدعةٌ، والبراءةُ بدعةٌ .

وهُم الذين يقولون : نتولَّى فُلانًا، ونتبرَّأُ مِن فُلان، وهذا القولُ بدعةٌ فاحذَرُوهُ .

**١١٠** - پشتیوانی كردن بیدعەیە، وە خۆبەریكردن بیدعەیە .

---

وەک لە كتێبی **الإبانة الصغرى** ی إبن بطة لە ئەثەری **٥٣٠** هاتووە :

شایەتیدان بیدعەیە .

شایەتیدان : واتە شایەتی بۆ كەسێك بە بەهەشت یان دۆزەخ بێ ئەوەی هیچ خەبەرێک لەبارەی هاتبێ .

ویلایەت بیدعەیە .

ویلایەت : واتە پشتیوانی و خۆشەویستی بۆ قەومێك، بەڕائەت كردن لەوانی تر .

بەڕائەت كردن بیدعەیە .

بەرائەت : واتە بەڕائەت لەقەومێک بكەیت كە لەسەر دینی ئیسلام وسوننەتن .

وه ئەوانە دەڵێن : پشتیوانی فلان دەکەین، وە خۆمان بەری دەکەین لە فلان .

کە ئەمەش وتەیەکی بیدعەیە بۆیە ئاگاداربە .

لە (**السنة للخلال : ٧٦٣**) : کە أبو طالب دەڵێت : پرسیارم کرد لە أبا عبد الله - أحمد بن حنبل .دەربارەی : بەرائەتکردن بیدعەیە، وە پشتیوان کردن بیدعەیە، وە شایەتیدان بیدعەیە .

ئیمامی أحمد وتی : البراءة ئەوەیە کە : بەرائەت بکەی لە یەکێک لە هاوەڵەکانی رسول الله ﷺ .

الولاية ئەوەیە کە : هەندێک پشت لەویتر بکات و واری لێبێنێت، وە شایەتیدان ئەوەیە کە : شایەتی بدەی لەسەر کەسێک کە بۆ دۆزەخە .

**١١١** - فمَن قال بشيء من الأقاويلِ، أو رآها، أو هَويَها، رَضِيهَا، أو أحبَّهَا :

فقد خالفَ السُّنَّةَ، وخرجَ مِن الجماعةِ، وتركَ الأثرَ، وقال بالخِلافِ، ودخلَ في البدعَةِ، وزالَ عن الطَّرِيقِ .

وما توفيقُنا إلا بالله، عليهِ توكَّلنا، وبهِ استعنَّا، ولا حولَ ولا قوَّةَ إلَّا بالله .

**١١١** - هەر کەسێک شتێک بڵێ لەو وتانە، یان هەمان بۆچوونی هەبێت، یان حەزی پێی هەبێت، یان پێی رازی بێت، یان خۆشی بوێت :

ئەوا پێچەوانەی سوننەتی کردووە، وە دەرچووە لە ئەهلی جەماعە، وە وازی لە ئەثەر هێناوە و پێچەوانەی وتوە، وە کەوتووەتە ناو بیدعەوە، وە لەرێی راست لایداوە .

وما توفيقنا إلا بالله، عليه توكلنا، وبه استعنَّا، ولا حول ولا قوة إلا بالله .

**١١٢** - وقد أحدثَ أهلُ الأهواءِ والبدعِ والخِلافِ أسماءَ شنيعةً قبيحةً، فسَمُّوا بها أهلَ السُّنَّةِ يُريدون بذلك عيبَهم، والطَّعنَ عليهم، والوقِيعةَ فيهم، والإزراءَ بهم عند السُّفهاءِ والجُهَّالِ .

**١١٢** - وه ئەهلى هەواو ئارەزوو و بیدعەكان و ناكۆكییەكان چەند ناوێكی ناپەسند و ناشرینیان داهێنا، لە ئەهلی سوننەیان ناونا، بەمە دەیانەوێت عەیبداریان بكەن، وە تانەدان لێیان، وە ڕۆچوون لە باسكردنیان، وە ڕیسواكردنیان لە لای گەمژە و نەزانەكان

---

: چونكە كەسی زانا و شارەزا لەدین هەرگیز بەقسەكانیان هەڵناخەڵەتێ .

**١١٣** - فأمَّا المُرجئةُ : فإنَّهُم يُسمُّون أهلَ السُّنَّةِ : شُكَّاكًا .

وكذبتِ المُرجئةُ بل هُم أولى بالشَّكِّ وبالتَّكذيبِ .

**١١٣** - وه هەروەها المُرجیئة : ئەهلی سوننە ناو دەنێن شكاكا - واتە بە شك و گومانەكان .

بەهۆی دوو هۆكار، یەكەم : بەهۆی ئەوەی ئەهلی سوننە إستثناء دەبینن لە ئیمان دا، واتە بڵێیت من ئیماندارم إن شاء الله .

دووەم : كاتێك ئەهلی سوننە دەڵێن ئیمان بریتییە لە وتە و كردەوە، وە ئیمان كامل نابێت ئیللا بەم دووانە نەبێت، مورجیئەكان بەهۆی ئەم قسەوە ئەڵێن ئەمانە گومانیان هەیە لە ئیمانی خۆیان - .

وه مورجیئەکان درۆیان کرد، بەڵکو خۆیان لەپێشترن بە هەبوونی شک و گومان و بەدرۆخستنەوە .

**١١٤** - وأمَّا القدريَّةُ : فإنَّهم يُسمُّون أهلَ السُّنَّةِ والإثباتِ : مُجبِرة .

وكذبتِ القدريَّةُ، بل هُم أولى بالكذبِ والخِلافِ أنفوا قُدرةَ الله عن خلقِهِ، وقالوا له ما ليسَ بأهل له تبارك وتعالى .

**١١٤** - وە هەروەها القَدَرِيَّة : ئەوان ئەهلی سوننە و جێگیرکردنی - سیفاتی الله تعالی - ناودەنێن : مُجبِرة - واتە ناچارکراو - .

- کاتێک ئەهلی سوننە وتیان کاروبارەکانمان گشتی دەگەڕێتەوە بۆ الله تعالی، ئەوان بەڕەئی و بۆچوونی باتڵ و پووچیان وا دەبینن الله تعالی بەندەکانی ناچار دەکات گوناه و تاوان ئەنجام بدەن لە کوفر و شرک و تاوانەکانی تر - .

قەدەرییەکانیش درۆیان کرد، بەڵکو خۆیان لەپێشترن بە درۆکردن و ناکۆکی نانەوە، نەهی قودرەتی الله تعالی دەکەن بەسەر درووستکراوەکانی، وە شتانێکیان ووت سەبارەت بە الله تعالی کە شایەنی نییە و ئەهلی ئەوە نییە .

**١١٥** - وأمَّا الجهميَّةُ : فإنَّهم يُسمُّون أهلَ السُّنَّةِ : مُشبِّهة . وكذبتِ الجهميةُ أعداءُ الله، بل هُم أولى بالتَّشبيهِ والتَّكذيبِ . افتروا على الله عزوجل الكذِبَ، وقالوا على الله الزُّورَ والإفكَ، وكفروا في قولِهم .

**١١٥** - وه هەروەها الجَهميَّة : ئەهلی سوننە ناو دەنێن : مشبّهة - واتە الله تعالى دەچوێنن بە دروستكراوەكان، كاتێک جەهمییەكان بینییان ئەهلی سوننە صیفاتەكانی الله تعالى یان جێگیركرد بەوشێوەی شایەن بەخۆیەتی لەگەڵ نەفیكردنی چواندنی بە مخلوقات و دروستكراوەكان ئەم بوهتانەیان دایە پاڵیان - .

وە جەهمییەكانیش درۆیان كرد دوژمنانی الله تعالى، وە خۆیان لەپێشترن بە چواندن و بەدرۆخستنەوە .

درۆیان هەڵبەست بۆ الله، وە دەربارەی الله بوختانیان كرد، وە لە قسەكانیاندا كوفریان كرد .

**١١٦** - وأمَّا الرَّافضةُ : فإنَّهم يُسمُّون أهل السُّنَّة : ناصِبَةٌ .

وكذبتِ الرَّافِضةُ بل هم أولى بهذا الأسمِ إذ ناصبوا أصحابَ محمد ﷺ السَّبَّ والشَّتمَ، وقالوا فيهم غير الحقِّ، ونسبُوهُم إلى غيرِ العدلِ، كذِبًا وظُلمًا، وجُرأةً على الله عزوجل، و استِخفافًا لحقِّ الرَّسول ﷺ، وهم والله أولى بالتَّعييرِ والانتقامِ منهُم .

**١١٦** - وە هەروەها الرَّافِضة : ئەهلی سوننە ناودەنێن : ناصبة - واتە ئەوانەی دینداریی دەكەن بە ڕق لێبوونەوەیان لە الإمام علي الله لێی ڕازی بێت، پێیان وایە گەر ڕقت لەئیمامی علی بێت ئەوا ئیمانێكی بەهێزت هەیە - .

ڕافیزە درۆیان كرد، بەڵكو خۆیان لەپێشترن بەم ناوە، دژایەتی هاوەڵانی رسول الله یان كردووە بە جنێودان و بوختان، وە قسەی ناڕاست دەكەن سەبارەت بەوان،

وه پاڵیانداون بۆ لای نادادپەروەریی، بە درۆ و ستەم، وە خۆیان بەجورئەت و بوێر کردووە لەسەر الله و رسول ەکەی، وە گاڵتەکردن بە مافی رسول الله، والله خۆیان شایستەترن بەو ناوە و تۆڵەسەندنەوە لێیان .

**١١٧** - وأمَّا الخوارجُ : فإنَّهم يُسمُّونَ أهلَ السُّنَّةِ والجماعةِ : المُرجِئة . وكذبتِ الخوارجُ في قولِهِم بل هُم المُرجِئةُ ويزعُمون أنَّهم على إيمان وحقّ دون النَّاسِ، ومَن خالفهُم كُفَّارٌ .

**١١٧** - وه هەروەها الخوارج : ئەهلی سوننە ناودەنێن مرجئة، خەواریج درۆیان کرد لە قسەکەیاندا، بەڵکو خۆیان مورجیئەن، وا گومان دەبەن تەنها خۆیان لەسەر ئیمان و حەق ن لەسەرووی خەڵکەوە، ئەوانەشی پێچەوانەیان دەکەن کافرن .

**١١٨** - وأمّا أصحابُ الرَّأي والقياسِ : فإنَّهم يُسمُّون أصحابَ السُّنَّة : نابتة، وحَشْوية .

وكذبتَ أصحابُ الرَّأي أعداءُ الله بل هُم النَّابِتةُ والحشوية، تركوا أثرَ الرَّسول ﷺ وحديثَهُ وقالوا بالرَّأي، وقاسوا الدِّينَ بالاستحسانِ، وحَكَموا بخلافِ الكتابِ والسُّنة .

وهُم أصحابُ بدعة، وجَهلَةٌ، ضُلَّالٌ، طُلَّابُ دنُيا بالكذِبِ والبُهتانِ .

فرحِمَ الله عبدًا قال بالحقِ، واتبعَ الأثرَ، وتمسَّكَ بالسُّنَّةِ، واقتدى بالصَّالحينَ، وجانبَ أهلَ البدع، وتركَ مُجالستَهم، ومُحادثتهم احتسابًا وطلبًا للقُربةِ مِن الله وإعزاز دينِهِ . وما توفيقنا إلَّا بالله .

**١١٨** - وە هەروەها أصحابَ الرَّأي والقياس - خاوەن ڕەئی و بۆچوون و قیاس - : ئەهلی سوننە ناودەنێن نابتة، و حشوية - الحشوية : واتا ئەوانەن لە خەڵكی كە پشتیان پێ نابەسترێ، واتە هیچ نرخێكیان نییە و زەلیلن، بە واتایەكی تر حدیث ەكان دەگێڕنەوە بەڵام جیاكاریی ناكەن لەنێوان حدیث ی صحيح و عیلەل، گرنگی نادەن ئاخۆ صحيح یا ضعيف یا متعارض یا موضوع بێت .

بە واتایەكی تر : ئەوان جسم دادەنێن بۆ الله تعالى بەهۆی ئەوەی صیفاتەكانی الله جێگیر دەكەن و نەفی ناكەن و ماناكەی ناگۆڕن .

النابتة : ئەمما ناونانییان لە ئەهلی سوننە بە نوابت یان نابتة، واتە ئەهلی سوننە وەك گژوگیا تازە پێگەیشتووە بچووكەكانن، واتە ئەوان لە علم و زانست و زانیارییدا بچووكن وەك ئەم گژووگیا بچووكانەی كە گەشەكردنیان تەواو نەبووە - .

خاوەن ڕەئی و بۆچوونەكان درۆیان كرد دوژمنانی الله، بەڵكو خۆیان نابتة و حشوية ن، أثر و حدیث ەكانی رسول الله یان وازلێهێنا، وە بە ڕەئی و بۆچوون قسەیان كرد، وە دینیان پێوانە كرد بەوەی پێیان باشە، وە حوكمیاندا بەپێچەوانەی قورئان و سوننەت .

وە ئەوانن خاوەنی بیدعە، نەزان، گومڕا، داواكاری دونیا بە درۆ و بوختان - ئەمانە كۆمەڵێك سیفەتی ئەهلی ڕاو و بۆچوونە كە ئیمام باسی دەكات - .

الله ڕەحم بكات بە بەندەیەك كە بە حەق قسە بكات، وە شوێن أثر بكەوێت، وە دەستبگرێت بە سوننەتەوە، وە صالحين و پیاو چاكان بكاتە پێشەنگ

و قدوه، وه خۆی لابدات له ئههلی گومڕایی، وه وازهێنێت له دانیشتن لهگهڵیان و قسهکردن لهگهڵیان، وهک احتساب و داواکردنێک بۆ نزیکبوونهوه له الله عزوجل و ڕێزلێگرتنی دینهکهی .

وما توفيقنا إلا بالله .

# باب : (٢)

# باب في الإيمان

# دەربارەی ئیمان



**١١٩** - سُئل أحمد عن الإيمان؟

فقال : قولٌ وعملٌ، يزيدُ و ينقصُ .

قيل : ويُستثنى فيه؟

قال : نعم .

قلتُ : من زعم أن الإيمان قولٌ، أليس هو مُرجئ؟ قال : نعم .

**١١٩** - پرسيار لە ئيمامی أحمد كرا دەربارەی ئيمان؟

وتی : وتە و كردەوەيە، زياد و كەم دەكات .

وترا : إستثناء ی تێدا دەكرێ؟

وتی : بەڵێ .

وتم : ئەو کەسەی کە پێی وایە ئیمان وتەیە - واتە تەنیا وتەیە بەبێ کردەوە - ، ئایا ئەو کەسە مورجیئە نییە؟

وتی : بەڵێ - واتە بەڵێ ئەو کەسەی پێی وابێت ئیمان تەنیا وتەیە ئەوا مورجیئەیە - .

**١٢٠** - وسألتُ إسحاقَ عن الإيمان؟

فقال : قولٌ وعملٌ، ويزيدُ و ينقصُ .

**١٢٠** - وە پرسیارم کرد لە إسحاق دەربارەی ئیمان؟

وتی : وتە و کردەوەیە، وە زیاد و کەم دەکات .

**١٢١** - وسألتُ علي بن عبد الله، قلتُ : ما قولك في الإيمان؟

قال : الإيمانُ قولٌ و عملٌ، ويزيدُ و ينقصُ، على هذا أدركنا العُلماء .

**١٢١** - پرسیارم کرد لە علي کوڕی عبد الله، ووتم : قسەی تۆ چییە لە ئیماندا؟

ووتی : ئیمان وتە و کردەوەیە، وە زیاد و کەم دەکات، بە زانایان گەیشتووین لەسەر ئەمە بوون - واتە ئەو زانایانەی پێیان گەیشتوون هەموویان لەسەر ئەو بیروباوەڕە بوون - .

**١٢٢** - وسألتُ يحيي بن عبد الحميد عن الإيمان؟

فقال : أدركتُ المشايخ، فذكر شريكًا، و أبا الأحوص و حمادَ بن زيد، وقيسًا، يقولون الإيمانُ قولٌ وعملٌ . قلت أنا له : ويزيدُ و ينقصُ؟ قال نعم، ويزيدُ ويَنقصُ .

**١٢٢** - پرسیارم کرد لە یحیی کوڕی عبد الحمید دەربارەی ئیمان؟

ووتی : گەیشتم بە شێخەکان، باسی شریک و أبو الأحوص و حماد ی کوڕی زید و قیس ی کرد، دەیانووت : ئیمان وتە و کردەوەیە .

من پێم ووت : زیاد و کەم دەکات؟

وتی : بەڵێ، وە زیاد و کەم دەکات .

**١٢٣** - وسمعتُ عباس بن عبد العظيم، قال : سمعتُ عبد الله بن داود يقول : الإيمان قولٌ وعملٌ ونيةٌ وقال : على هذا أدركنا أهل العلم .

قال عباس : الإيمانُ قولٌ وعملٌ ونيةٌ، ويزيدُ وينقصُ . وأقولُ : مُؤمنٌ إن شاء الله، وليس بشَكٍّ .

**١٢٣** - گوێم لە عباسی کوڕی عبد العظیم بوو، وتی : گوێم لە عبداللە ی کوڕی داوود بوو دەیووت : ئیمان وتە و کردەوە و نیەتە .

وە ووتی : بە أهلی عیلم گەیشتووین لەسەر ئەوە بوون .

عباس ووتی : ئیمان وتە و کردەوە و نیەتە، وە زیاد و کەم دەکات .

وه دەڵێم من ئیماندارم إن شاء الله، وه بەبێ هەبوونی گومان .

**١٢٤** - حدثنا عباس، قال : سمعتُ أبا الوليد يقول : الإيمانُ قولٌ وعملٌ، ويزيدُ وينقُصُ .

**١٢٤** - أبا الوليد بوو دەیوت : ئیمان وته و کردەوەیه، وه زیاد و کەم دەکات .

**١٢٥** - وسمعت محمد بن أبي بكر المقدمي يقول : وأنا أقولُ : الإيمانُ قولٌ وعملٌ ونيّةٌ، ويزيدُ وينقُصُ .

**١٢٥** - گوێم له محمدی بن أبي بکر مقدمي بوو دەیووت، وه من دەڵێم : ئیمان وته و کردەوه و نیەته، وه زیاد و کەم دەکات .

**١٢٦** - حدثنا المسيب بن واضح، قال : حدثنا يوسف بن أسباط، قال : كان سفيان يقول : الإيمان يزيد وينقص .

قلتُ : وكيف يزيدُ؟ وكيف ينقصُ؟

قال : يزيد بأداءِ الفرائض، وينقص بترك الفرائض .

**١٢٦** - یوسف بن أسباط ووتی : سفیان دەڵێت - سفیان لێرەدا مەبەستی سفیان الثوريیه رحمه الله - : ئیمان زیاد و کەم دەکات .

ووتم : چۆن زیاد دەکات؟ وە چۆن کەم دەکات؟

ووتی : زیاد دەکات بە جێبەجێکردنی فەرزەکان، وە کەم دەکات بە وازلێهێنانی فەرزەکان .

**١٢٧** - حديثا أحمد ابن حنبل، قال : حدثنا سُريج بن النُّعمان، قال : حدثنا عبداللَّه بن نافع، قال : كان مالك بن أنس يقول : الإيمانُ قولٌ وعملٌ، ويزيدُ وينقصُ .

**١٢٧** - أنس بن مالک دەیووت : ئیمان وتە و کردەوەیە، وە زیاد و کەم دەکات .

**١٢٨** - حدثنا أحمد، قال : حدثنا أبو جعفر السويدي، عن يحي بن سليم، عن هشام، عن الحسن قال : الإيمانُ قولٌ و عملٌ .

**١٢٨** - حسن ووتی : ئیمان وتە و کردەوەیە .

**١٢٩** - وقال أحمد : بلغني أن مالك بن أنس، وابن جريج، وشريكًا، وفُضيلَ بن عِياض قالوا : الإيمانُ قولٌ و عملٌ .

**١٢٩** - وە ئیمامی أحمد ووتی : پێم گەیشتووە کە مالک بن أنس و ابن جریج و شریکا و فضیل بن عیاض، وتوویانە : ئیمان وتە و کردەوەیە .

**١٣٠** - حدثنا عمران بن يزيد بن خالد، قال : حدثنا عبد الملك بن محمد قال : سمعتُ الأوزاعي يقولُ : أدركتُ مَن أدركت من صدرِ هذه الأُمَّة، ولا يُفرِّقون بين الإيمانِ والعمل، ولا يَعدُّون الذُّنوب كُفرًا، ولا شِركًا .

قال : وسمعتُ الأوزاعيَّ يقول : الأيمانُ والعملُ كهاتينِ وقال بإصبعيه، لا إيمان إلَّا بعمل، ولا عملَ إلَّا بإيمان .

**١٣٠** - محمد بن ملك بۆی گێڕاینەوە، گوێم لە ئەوزاعی بوو دەیووت : گەیشتم بەوانەی پێیان گەیشتم لە سەرەتاکانی ئەم ئوممەتە، جیاوازییان نەدەکرد لەنێوان ئیمان و کردەوە، تاوانەکانیشیان بە کوفر دانەدەنا، نە بە شیرک یش .

هەروەها گوێم لەئەوزاعی بوو دەیووت : ئیمان و کارکردن وەک ئەم دووانەن، وە بە پەنجەکانی وتی، هیچ ئیمانێک نییە ئیللا بە عەمەل و کردەوە نەبێ، وە هیچ کارو کردەوەیەک نییە ئیللا بە ئیمانەوە نەبێ .

**١٣١** - حدثنا أحمد بن سعيد، قال : سمعتُ النَّضر بن شُميل يقول : الإيمانُ قولٌ و عملٌ، ويزيدُ وينقُصُ .

**١٣١** - أحمد بن سعید بۆی گێڕاینەوە، ووتی : گوێم لە نضری بن شمیل بوو دەیووت : ئیمان ووتە و کردەوەیە، وە زیاد دەکات و کەم دەکات .

**١٣٢** - حدثنا علي بن يزيد، قال : ثنا يحيي بن سُليم الطائفي، قال : سألتُ هشام بن حسَّان : ما كان قول الحسن في الإيمانِ؟

قال : كان يقول : قولٌ و عملٌ .

قلتُ : فما قولك أنت؟

قال : قولٌ و عملٌ .

قال : وقال مالكُ بن أنس : الأيمانُ قولٌ و عملٌ .

وقال محمد بن عبد الله بن عُثمان بن عفَّان : الإيمانُ قولٌ وعملٌ .

قال : وحدثني رَجُل من أهل البصرة يقال له : أبو حيان قال : سمعت الحسن يقول : لا يصلحُ قولٌ إلّا بعمل، ولا يصلح قولٌ وعمل إلّا بنيةٍ، ولا يصلحُ قولٌ وعملٌ ونيَّةٌ إلَّاً بسُنَّة .

قال : وقال الفُضَيل بن عياض : الإيمانُ قولٌ وعملٌ .

قال : وكان المُثَنَّى بن الصَّباح يقول : الإيمانُ قولٌ و عملٌ .

قال : وكان سُفيان الثوري يقول : الإيمانُ قولٌ وعملٌ .

**١٣٢** - يحيى بن سليم الطائفي بۆى گێڕاینەوە، ووتی : پرسیارم کرد لە هشام بن حسان : وتەی حسن چی بوو لە ئیمان دا؟

ووتی : دەیووت : وتە و کردەوەیە .

ووتم : ئەی وتەی تۆ چیە؟

ووتی : وته و کردەوەیه .

ووتی : وه مالک بن أنس ووتی : ئیمان وته و کردەوەیه .

وه محمد بن عبد الله بن عمرو بن عثمان بن عفان ووتی : ئیمان وته و کردەوەیه

.

ووتی : وه پیاوێک له خەڵکی بەسرە بۆی گێڕامەوە پێی دەوترا أبو حیان ووتی : گوێم له حسن بوو دەیووت : هیچ وتەیەک چاک و باش نابێ ئیللا به کردەوە نەبێ، وه وته و کردەوە چاک و باش نابن ئیللا به نیەت نەبێ، وه وته و کردەوە و نییەت چاک و باش نابن ئیللا به سوننەت نەبێ .

ووتی : وه فضیل بن عیاض دەیوت : ئیمان وته و کردەوەیه .

ووتی : وه مثنى بن الصَّباح ووتی : ئیمان وته و کردەوەیه .

ووتی : وه سوفیان الثوري دەیووت : ئیمان وته و کردەوەیه .

**١٣٣** - حدثنا أحمد، قال : حدثنا وكيع، قال : ثنا سُفيان، عن سُهيل بن أبي صالح، عن عبد الله بن دينار، عن أبي صالح، عن أبي هريرة قال : وقال رسول الله ﷺ : الإيمانُ بضعٌ وسبعون بابًا، فأدناها : إماطةُ الأذَى عن الطَّريقِ، وأرفعُها : قولُ لا إله إلَّا اللَّهُ.

**١٣٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : ئیمان حەفتا و هەندێک بەشە، نزمترینیان : لادانی ئازارێک لەسەر ڕێگە - شتێک ببێتە مایەی ئازاردانی خەڵکی - ، وە بەرزترینیان وتنی لا إله إلا الله یە .

---

: **رواه أحمد (٩٧٤٨)، والبخاري (٩)** -

**١٣٤** - حدثنا أحمد، قال : حدثنا هِشام، قال : حدثنا عبد الرحمان بن عبد الله بن دينار، عن أبيه، عن أبي صالح، عن أبي هريرة، قال : قال رسول اللَّه : الإيمانُ تسعٌ وتسعون شُعبةً، أَعظمُ ذلك قولُ : لا إِله إلَّا الله، وأدنى ذلك : كُفُّ الأذى عن طَريقِ النَّاسِ، والحياءُ شُعبةٌ مِن الإِيمانِ - رواه أحمد له كتێبی (الإيمان : ٣٦) - .

**١٣٤** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : ئیمان نەوەد و نۆ بەشە، بەرزترینیان لەمەدا : وتەی لا إله إلا الله یە، وە نزمترینیان لەمەدا : هەڵگرتنی ئازار و نارەحەتیەک لەڕێگای خەڵک، وە شەرم و حەیا بەشێکە لە ئیمان .

---

: **رواه أحمد له كتێبی (الإيمان : ٣٦)** .

**١٣٥** - حدثنا أحمد، قال : سمعتُ وكيعًا يقول : الإيمانُ يزيدُ وينقُصُ .

قال : وكذلك كان سُفيان يقول .

**١٣٥** - أحمد بۆی گێڕاینەوە ووتی : گوێم لە وكیع بوو دەیووت : ئیمان زیاد و كەم دەكات .

ووتی : سفیان یش بەهەمان شێوەی ووت - واتە سفیان یش هەمان قسەی كردووە و وتویەتی كە ئیمان زیاد و كەم دەكات، وە سفیان لێرە سفیان الثوري یە رحمه الله - .

**١٣٦** - سمعت إسحاق قال : سألتُ سُفيان بن عُيينة، فقلت : ما تقولُ في الإيمان أيزيد؟

قال سُفيان : أوأحد يستطيعُ رَدَّ هذا؟!

وقد قال الله تبارك و تعالى : ﴿وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدًى﴾ [الكهف : ١٣] .

و﴿لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ﴾ [الفَتْح : ٤] .

فتلا آيات احتجَّ بها، وتَعجَّبَ ممن لم يقُل به .

فقلت له : ما الإيمانُ، أهو قول و عمل؟

فقال : نعم، هو قول وعمل، ومن يُشكُّ في هذا؟!

**١٣٦** - گوێم لە إسحاق بوو وتی : پرسیارم لە سفیان بن عيينة كرد، پێم ووت : چی دەڵێی دەربارەی ئیمان ئایە زیاد دەكات؟

سفیان ووتی : ئایە كەس دەتوانێ ئەمە ڕەدد بكاتەوە؟!

الله تبارک وتعالی فەرموویەتی : ﴿وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى﴾ [سورة الكهف : ١٣] .

واتە : ئێمەش زیاتر هیدایەتمان بۆیان زیاد کرد .

وە ﴿لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡ﴾ [الفتح : ٤] .

واتە : بۆ ئەوەی کە ئیمانیان پتەوتر بکات، سەرەڕای ئیمانداری ئیمانیان زیاد ببێت .

ئەم ئایەتانە بەڵگەن بۆی، وە پێم سەیرە ئەوەی کە ئەم قسەیە ناکات - واتە پێم سەیرە کەسێک نەڵێت ئیمان زیاد دەکات، مەبەست لەم وتەیە ئەوەیە کە باسی زیادکردنی ئیمان زۆر ڕوونە و لەقورئان باس کراوە کە ئیمان زیاد دەکات چۆن دەکرێت کەسێک بڵێ زیاد ناکات! - .

پێم ووت : ئیمان چییە، ئایە ووتە و کردەوەیە؟

وتی : بەڵێ، ئیمان وتە و کردەوەیە، کێ گومانی لەوەدا هەیە؟!

**١٣٧** - وسمعتُ أبا إسحاق الرَّمَادي، قال : سمعت سُفيان بن عُيينة يقول : الإيمانُ قولٌ وعملٌ .

فقالوا : يا أبا محمد، أيزيدُ وينقصُ؟

قال : ما زادَ شيءٌ قطُّ إلَّا نقصَ ألا تسمع الله يقول : ﴿فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا﴾ [آل عِمرَان : ١٧٣] فما زادَ شيءٌ قطّ إلَّا نقصَ .

قال سُفيان: وقال أبو الدَّرداء: ما الإيمانُ إلَّا كقميصِ أحدكم يَنزعُهُ مرَّة، ويَلبسُهُ أُخرى .

قال أبو إسحاق : وأنا أقول : الإيمانُ قولٌ وعملٌ، يزيدُ وينقصُ، وكذلك أدركتُ النَّاسَ الذين أثقُ بهم .

**١٣٧** - سفيان بن عيينة دەیووت : ئیمان وته و کردەوەیە .

ووتیان : ئەی باوکی محمد، ئایا زیاد و کەم دەکات؟

ووتی : هیچ شتێک زیاد ناکات ئیللا کەم دەکات - واتە هەر شتێک زیاد بکات لەپێشوودا کەم بووە ئینجا زیادی کردووە، هەر لەسەرەتاوە زیاد نەبووە - ، ئایە وتەی الله ـت نەبیستووە دەفەرمووێت : ﴿**فَزَادَهُمْ إِيمَانًا**﴾ [**آل عمران : ١٧٣**] .

واتە : ئیمانیان زیاتر دامەزراو .

هەر شتێک زیاد بکات ئیللا لەپێشوودا کەم بووە .

سفیان ووتی : وە أبو الدرداء ووتی : ئیمان چییە ئیللا وەکو قەمیسێکی هەر یەکێکتانە کە جارێک دایدەکەنێت، وە جارێک لەبەری دەکات - واتە ئیمانیش وەکو جلێک وایە کە لەبەری دەکەیت و دایدەکەنیت، گۆڕانکاری بەسەریدا دێت، کاتێک کارێکی چاک دەکەیت ئیمانت بەرز دەبێتەوە، وە کاتێک تاوانێک ئەنجام دەدەیت ئیمانەکەت نزم دەبێتەوە، بەمەش ئیمان هەمووکات لە یەک پلەدا نامێنێتەوە - .

أبو إسحاق ووتی : وە منیش دەڵێم : ئیمان وتە و کردەوەیە، زیاد و کەم دەکات، وە بەم شێوەیە گەیشتووم بەو خەڵکانەی کە جێی متمانە بوون .

**١٣٨** - حدثنا أبو بكر محمد بن يزيد، قال: ثنا عبد الوهاب بن نجدة، عن إسماعيل بن عياش، عن بِشْر بن عبد الله بن يَسار السُّلمي، قال: الإيمانُ يزدادُ وينقصُ في كذا وكذا، إنَّه مِن كتاب الله: ﴿لِيَزْدادُوٓا إيمانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ﴾ [الفَتْح: ٤]، ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِم ءَايَاتُهُۥ زَادَتهُمْ إِيمَانًا﴾ [الأنفَال: ٢].

**١٣٨** - بشر بن عبد الله بن يسار السلمي ووتى: ئيمان زياد و كەم دەكات لەووو لەوەدا، ئەوە لە كتابى الله تعالى دايە: ﴿لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ﴾ [الفتح: ٤] .

واتە: بۆ ئەوەی كە ئيمانيان پتەوتر بكات، سەرەڕای ئيمانداری ئيمانيان زياد ببێت.

﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا﴾ [الأنفال: ٢].

واتە: كاتێك ئايەت و فەرمانەكانی ئێمەيان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئيمان و باوەڕيان زياد دەكات.

**١٣٩** - حدثنا عبدة بن عبد الرحيم، قال: حدثنا موسى بن أعين الجزري، قال: سمعتُ عبد الكريم بن مالك الجزري، وخُصيف ابن عبد الرحمن الجزري يقولان: الإيمانُ يزدادُ وينقُصُ.

**١٣٩** - موسى بن أعين الجزري ووتى: گوێم لە عبد الكريم بن مالك الجزري، وە خصيف ابن عبد الرحمن الجزري بوو دەڵێن: ئيمان زياد و كەم دەكات.

**١٤٠** - حدثنا أحمد بن حنبل، قال : حدثنا يزيد بن هارون، قال : حدثنا محمد بن طلحة، عن زبيد، عن ذَرٍّ، قال : كان عُمر بن الخطَّاب يقول لأصحابهِ : هلمُّوا نزدادُ إيمانًا . فيذكرون الله .

**١٤٠** - عمر بن الخطاب به هاوه‌ڵانی ده‌ووت : وه‌رن ئیمانتان زیاد بكه‌ن، یادی الله تعالى بكه‌ن .

**١٤١** - حدثنا أحمد، قال : ثنا محمد بن فضيل، قال : ثنا أبي، عن شِبَاكٍ، عن إبراهيم، عن علقمة أنَّه قال لأصحابهِ : امشوا بنا نزداد إيمانًا .

يعني : تفقُّهًا .

**١٤١** - علقمة به هاوه‌ڵانی ووت : بڕۆن له‌گه‌ڵمان ئیمانتان زیاد بكه‌ن .

واته : تێگه‌یشتنتان .

---

: واته له‌گه‌ڵمان بڕۆن تێگه‌یشتنتان زیاد بكه‌ن، چونكه ئه‌وان چاك له قورئان و وته‌ی رسول الله ﷺ تێگه‌یشتبوون .

**١٤٢** - حدثنا أحمد، قال : ثنا وكيع، عن شريك، عن هلال بن حميد، عن عبد الله بن عُكيم، قال : سمعت ابن مسعود يقول في دُعائه : اللهم زدنا إيمانًا، ويقينًا، وفِقهًا .

**١٤٢** - إبن مسعود لەدوعاكانيدا دەيووت : پەروەردگار ئيمان و يەقين و تێگەيشتنمان لەدين زياد بكە .

**١٤٣** - حدثنا أحمد، قال : ثنا وكيع، قال : ثنا سُفيان، عن هشام ابن عُروة، عن أبيه، قال : ما نقصت أمانةُ عبد قطّ إلَّا نقص إيمانه .

**١٤٣** - لە هشام ابن عروة، لە باوكيەوە ووتى : ئەمانەتى بەندەيەك كەم ناكات ئيللا ئيمانەكەى كەم دەكات .

---

: واتە كاتێك بڕوادارێك ئەمانەتێكى لا دادەنرێت خيانەتى لێ بكات بەوەى دەستكارى بكات، يان لێى بەرێت و كەم بيێتەوە، ئەوا لەبەرامبەردا ئيمانى كەم دەبێتەوە .

حەديثێكى تر دەبارەى سيفاتى منافق كە پێغەمبەر ﷺ باسى دەكات : (آية المنافق ثلاث) نيشانەكانى كەسى منافق سێ يە، يەكێك لەوانە (إذا اؤتمن خان) واتە : كاتێ ئەمانەتێكى پێ دەسپێريت خيانەتى تێدا دەكات . (متفق عليه) .

**١٤٤** - سمعتُ بشَّار بن موسى الخفاف يقول : الإيمانُ قولٌ وعملٌ ونيَّةٌ، يزيدُ حتَّى يكون أعظم من الجبلِ، وينقصُ حتَّى لا يبقى منه شيء .

قلتُ : ويُستثنى فيه؟

قال : كُلُّ شيء بمشيئةِ الله .

**١٤٤** - گوێم لە بشار بن موسى الخفاف بوو دەیووت : ئیمان وتە و کردەوە و نیەتە، زیاد دەکات تاوەکو گەورەتر دەبێت لە شاخ، وە کەم دەبێت تاوەکو هیچی لێ نامێنێتەوە .

وتم : استثناء یشی تێدا دەکرێ؟

وتی : هەموو شتێک بە ویستی الله یە .

---

: واتە ئیللا الله ویستی لەهەر کەسێک بێت ئیمانی بەرز دەکات، یان کەم دەکات، نابێت بەخۆت بڵێی ئیماندارێکی تەواوم، یان استثناء ی نەکەی .

**١٤٥** - حدثنا أحمد بن حنبل، قال : سمعت يحيى بن سعيد يقول : ما أدركتُ أحدًا من أصحابِنا، ولا بلغني إلَّا على الإستثناء .

وقال يحيى : الإيمانُ قولٌ وعملٌ .

قال يحيى : وكان سُفيان يُنكر أن يقول : أنا مُؤمنٌ .

**١٤٥** - أحمد بن حنبل بۆی گێڕاینەوە، ووتی : گوێم لە يحيى بن سعيد بوو دەیوت : نەگەیشتووم بە هیچ یەکێک لە هاوەڵانمان، وە پێشم نەگەیشتووە لێیانەوە ئیللا لەسەر استثناء بووە - واتە باوەڕی وابووە استثناء دەکرێ لە ئیمان دا - .

وە يحيى وتی : ئیمان وتە و کردەوەیە .

وه يحيى وتى : سوفيان نكۆڵيى دەكرد بڵێ : من ئيماندارم .

وه يحيى لەدوايەوە زياد و كەمبوونى بەباش دەزانى .

---

: مەبەستى ئەوەيە لەدواى ئەوەى يحيى دەڵێت ئيمان قول و عملە وەستاوە، پاشان لەم أثرەدا هاتووە كەوا يحيى پێى باشە ئەمەش بڵێيت لەدوايەوە : زياد و كەم دەكات .

واتە ئاوا بڵێيت : ئيمان وتە و كردەوەيە زياد و كەم دەكات . والله اعلم .

**١٤٦** - وسُئل أحمد بن يونس وأنا أسمع عن الإيمانِ؟

فقال : قولٌ وعملٌ، يزيدُ و ينقُصُ، وبعضُهُ أفضلُ مِن بعض .

**١٤٦** - وه أحمد بن يونس پرسيارى لێكرا وه منيش گوێم لێبوو دەربارەى ئيمان؟

ووتى : وتە و كردەوەيە، زياد و كەم دەكات، وە هەندێكى باشترە لە هەندێكى ترى - واتە هەموو كەس ئيمانى وەك يەك نييە، هەندێك ئەفزەڵترە لەهەندێكى تريان - .

## باب : (٣)

# باب الإستثناء في الإيمان

# دەربارەی إستثناء لە ئیمان ـدا



**١٤٧** - سُئل أحمد بن حنبل : ما تقولُ في الإستثناءِ في الإيمان؟

قال : نحن نذهبُ إليه .

قيل : الرَّجلُ يقول : أنا مؤمنٌ إن شاءَ الله؟

قال : نعم .

**١٤٧** - پرسیار کرا لە ئیمامی أحمد : چی دەڵێیت لەسەر إستثناء لە ئیماندا؟

ووتی : ئێمە بەرەو ئەوە دەڕۆین .

وترا : پیاو دەڵێت : من ئیماندارم إن شاء الله؟

ووتی : بەڵێ .

**١٤٨** - قال أحمد وسمعت سُفيان يقول إذا سُئل أمؤمنٌ أنت؟ إن شاء لم يُجبْهُ، وسُؤالك إيَّايَ بدعة .

ولا أشكُّ في إيماني .

لا يُعنَّف مَن قال : الإيمان ينقُصُ .

إن قال : إن شاء الله ليس يُكره وليس بداخلٍ في الشَّكِّ .

**١٤٨** - ئيمامی أحمد ووتی : گوێم له سفيان بوو دەيووت ئەگەر پرسيار كرا ئايا تۆ ئيمانداری؟

گەر ويستی لێ بوو وەڵامی ناداتەوە، وە ئاگاداربە پرسيار كردنت لێم بيدعەيە، وە گومانيش ناكەم لە ئيمانم .

وە توندوتيژ نابيت بەرامبەر كەسێك ئەگەر ووتی ئيمان كەم دەكات .

ئەگەر ووتی : إن شاء الله، رێگری لێ نەكراوە، وە ناچێتە بابی شك و گومانەوە.

**١٤٩** - سألت إسحاقَ، قلتُ : أنت تقول : أنا مؤمنٌ إن شاء الله؟

قال : نعم .

**١٤٩** - پرسيارم لە إسحاق كرد ووتم : تۆ دەڵێيت : من ئيماندارم إن شاء الله؟

ووتی : بەڵێ

**١٥٠** - وسألتُ علي بن عبد الله: عن الاستثناء في الإيمان؟

فقال: يقول: أنا مؤمنٌ إن شاء الله مِن غيرِ شكّ. أو يقول: أرجو.

قلتُ: فتحفظ عن جرير بن عبد الحميد عن عِدة ذكرهم في الاستثناء؟

قال: قد سمعته منه، ولم أكتبه، فأنا أهابه.

فذكر: يزيد بن أبي الزياد، ومنصور، ومُغيرة، وغيرهم.

قلت لعليٍّ: فتحفظ عن عائشة من حديث جرير؟

قال: نعم، حدثنا به جرير، عن مُغيرة، عن سِماك بن سلمة، عن عبد الرحمن بن عصمة، قال: قالت عائشة إنَّهم المؤمنون إن شاء الله.

في حديث ذكره.

**١٥٠** - وه پرسيارم كرد له علي بن عبد الله: دەربارەی إستثناء كردن له ئيماندا؟

ووتی: دەڵێ: من ئيماندارم إن شاء الله بەبێ بوونی هيچ گومانێک، ياخود دەڵێ: ئومێدم وايه - واته تكام وايه ئيماندار بم -.

ووتم: لەبەرت كردووه له جرير بن عبد الحميد لەزۆرێک لەوانەی ناويان هێنا له إستثناء؟

ووتی: لێيانم بيستووه، بەڵام نەمنوسيوەتەوە، من لێی دەترسم، ناوی يزيد بن ابي زياد و منصور و مغيرة وه جگه لەوانيش هێنا.

به علي م ووت : له عائشة وه رضي الله عنها حەدیسەکەی جریر ت لەبەرکردووە؟

ووتی : بەڵێ، بۆی گێڕاینەوە جریر، له مغیرة، له سماك بن سلمة، له عبدالرحمن بن عصمة، ووتی : عائشة رضي الله عنها ووتی : ئەوانە ئیماندارن إن شاء الله . لەو حەدیسەی باسی کرد .

---

: ئەمە حەدیسێکە کاتێک معاویە نێردراوێک دەنێرێت بۆ لای عائشة رضي الله عنها بۆ ئەوەی دیاریەکی پێبدات، جا عائشة رضي الله عنها پێیان دەڵێت : ئێوە ئیماندارن إن شاء الله تعالی، ئەوەش - واتە معاویە - ئەمیرتانە، وە دیاریەکەی قبوڵم کرد.

**١٥١** - سألتُ أبا ثور : عن الاستثناء في الإيمانِ ما تقول فيه؟ قال الإستثناء لا بأس به مِن غير شكّ .

قلتُ لأبي ثور : فإن قال لي قائل : قال الله ﴿**وَتُوبُوٓا۟ إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ**﴾ [**النُّور** : ٣١] .

فقد سمّاهم المؤمنين، ونحو ذلك في القرآن .

قال : يلزمُه اسم الإيمان، ولا يكون مستكمِلًا إلَّا أن يُوافق قوله فعله، وذلك أنَّا قد نقول للرَّجل إذا دخل في الصَّلاةِ : مُصلِّي .

ولا يكون مستكمِلًا للصَّلاةِ حتَّى يؤدِّيها . ونقول : صائمٌ، وقد دخل في الصَّومِ، ولا يكون مستكمِلًا في صومه حتَّى يمضي يومه .

**١٥١** - پرسیارم لە أبا ثور کرد دەربارەی إستثناء لە ئیماندا، چی دەڵێی دەربارەی؟

ووتی : إستثناء هیچ کێشەی تێدا نییە بەبێ بوونی هیچ گومانێک - واتە دەبێت هیچ گومانت نەبێ لەئیمانت و بڵێیت : إن شاء الله ئیماندارم - .

بە أبا ثور م ووت : ئەگەر قسەکەرێک پێی ووتم : الله تعالى دەفەرمووێت : ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ [سورة النور : ٣١] .

واتە : هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە .

الله تعالى ناویانی هێناوە بە ئیماندار، وە هاوشێوەی ئەوانە لە قورئان .

وتی : ناوی ئیمان پێوەی لکاوە، وە کامل و تەواو نابێت تاوەکو موافقی وتە و کردەوەی نەبێت، بەم شێوەیە کاتێک پیاوێک دەچێتە ناو نوێژەوە پێی دەوترێ نوێژخوێن، بەڵام تەواو و کامل نابێت تاوەکو تەواوی دەکات .

وە دەڵێن ڕۆژووگر، لە کاتێکدا چووەتە ناو ڕۆژووەوە، بەڵام ڕۆژووەکەی تەواو نابێ تاوەکو ئەو ڕۆژە تێدەپەڕێنێت .

**١٥٢** - سمعتُ أحمد بن سعيد، قال : سمعتُ النَّضر بن شُميل يقول إذا سُئل : أمؤمنٌ أنت؟

قال : آمنتُ بالله، أو مؤمنٌ إن شاء الله، أو مؤمنٌ أرجُو .

قال النَّضرُ : أدركتُ عليه أهلَ البصرةِ : ابنَ عون، وهشامًا، وعوفًا، وحمادًا، وهِشامَ بن حسَّان، وعِمران، كُلُّهم يستثنون .

وكان الحسنُ، وابنُ سِيرين، وقتادةُ، وأيوبُ، وأصحابُنا كُلُّهم يَستثنون .

**١٥٢** - گوێم له أحمد بن سعيد بوو دەيووت : گوێم له نضر بن شميل بوو دەيووت : ئەگەر پرسيار كرا، ئايا تۆ ئيمانداری؟

ووتی : باوەڕم هێناوه به الله، يان ئيماندارم إن شاء الله، يان ئومێدەوارم ئيماندارىم .

نضر ووتی : گەيشتم به خەڵكی بەصره لەسەر ئەوه بوون : ابن عون، هشام، عوف، حماد، هشام بن حسان، عمران، گشتييان استثناء يان دەكرد .

حسن و ابن سيرين و قتاده و ايوب و هاوەڵانمان گشتيان إستثناء يان دەكرد .

**١٥٣** - حدثنا عليُّ بن يزيد، عن يحيى بن سعيد، أن الثَّوري قال : مَن قال : أنا مؤمنٌ، ولم يستثنِ، فهو مُرجئ .

**١٥٣** - ثوري ووتی : هەر كەسێک بڵێت من ئيماندارم و إستثناء نەكات، ئەوا مورجيئەيە .

**١٥٤** - حدثنا علي بن يزيد، قلت لعبد الله بن داود : أتعيبُ على من يقول : أنا مُؤمنٌ إن شاء الله؟

ومن يقول : أرجو؟

قال : لا، كلُّ هذا حسن .

**١٥٤** - على بن يزيد بۆی گێڕاینەوە، وتم بە عبد الله بن داود : ئايا هيچ عەيبێک دەگری لە كەسێک بڵێ : من ئيماندارم إن شاء الله؟

يان ئەو كەسەی دەڵێت : ئومێدەوارم؟

ووتی : نەخێر، ئەمانە هەموويان باشن .

**١٥٥** - حدثنا محمد بن يزيد، قال : حدثنا محمد بن كثير، عن الأوزاعي قال : لا بأس أن يقولَ : أنا مؤمنٌ إن شاء الله .

**١٥٥** - أوزاعي ووتی : كێشەی نييە ئەگەر بڵێت : من ئيماندارم إن شاء الله .

**١٥٦** - حدثنا أحمد، قال: حدثنا أبو مُعاويه، قال: حدثنا الأعمش، عن إبراهيم، عن علقمة، قال: تكلَّمَ عِنده رَجُلٌ مِن الخوارجِ بكلامٍ كرِهه، فقال علقمة: ﴿**وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا**﴾ [**الأحزاب: ٥٨**].

فقال له الخارجيُّ: أمنهم أنت؟

قال: أرجو.

**١٥٦** - علقمة ووتى: پیاوێک له خەواریج قسەیەکی کرد لە لای پێی ناخۆش بوو، علقمه ش ووتی: ﴿**وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا**﴾ [**الأحزاب: ٥٨**].

واتە: ئەوانەش کە ئازاری پیاوانی ئیماندار و ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بێ ئەوەی تاوانێکیان ئەنجامدابێت.

خەواریج ەکە پێی ووت: ئایا تۆ لەوانیت؟

ووتی: ئومێدەوارم.

**١٥٧** - حدثنا أحمد، قال: ثنا عبد الرحمن، قال: ثنا سُفيان، عن الحسن بن عُبيد الله، عن إبراهيم، قال: إذا قيل لك: أمؤمنٌ أنت؟

فقل: أرجو.

**١٥٧** - إبراهيم ووتی: ئەگەر پێت وترا: ئایا تۆ ئیمانداری؟

ئەوا بڵێ : ئومێدەوارم - واتە تکا و ڕەجام وایە ئیمانداربم - .

**١٥٨** - حدثنا أحمد، قال : حدثنا عبد الرحمن، عن سُفيان، عن عطاء بن السَّائب، عن سعيد بن جُبير، قال : سألتُ ابن عُمر، قلتُ : أغتسِل مِن غسل الميت؟

قال : أمؤمنٌ هو؟

قال : قلتُ : أرجو .

قال : فتمَّسح بالمؤمنِ ولا تغتسل مِنه .

**١٥٨** - سعيد بن جبير ووتى : پرسيارم لە ابن عمر كرد، ووتم : مردوويەكم شۆريوە ئايا خۆم بشۆرم - واتە دواى ئەوەى ئەوم شوشتووە خۆم بشۆرمەوە - ؟

ووتى : ئايا ئەو ئيماندارە؟

ووتى : ووتم : ئومێدەوارم - واتە ئومێدەوارم ئيماندار بێ، إستثناءى بەكارهێناوە - .

ووتى : دەستنوێژ دەگريتەوە لە ئيماندار و خۆت ناشۆريتەوە .

**١٥٩** - حدثنا عبد الله بن خُبيق، قال : سمعت يوسف بن أسباط يقول : إن قال : مؤمنٌ إن شاء الله، فحسنٌ .

وإن قال : أرجو أن أكون مؤمنًا، فحسن .

**١٥٩** - يوسف بن أسباط دەڵێت : ئەگەر ووتی : ئیماندارم إن شاء الله، ئەوا چاکی وتووە .

وە ئەگەر ووتی : ڕەجام وایە ئیماندار بم، ئەوا چاکی وتووە .

**١٦٠** - حدثنا أحمد، قال : حدثنا وكيع، عن سُفيان، عن الحسن بن عمرو، عن فُضيل، عن إبراهيم قال : إذا سئلت أمؤمنٌ أنت؟

فقل : آمنتُ بالله، وملائكتِهِ، وكتبِهِ، ورسلِهِ، فإنَّهم سَيَدَعُونك .

**١٦٠** - إبراهيم ووتی : ئەگەر پرسیارت لێکرا ئایا تۆ ئیمانداری؟

ئەوا بڵێ : بڕوام هەیە بە الله، وە فریشتەکانی، وە کتێبەکانی، وە نێردراوەکانی، ئەوا ئەوکات ئەوان وازت لێدێنن .

**١٦١** - حدثنا أحمد، قال : ثنا عبد الرحمن، قال : حدثني حَسن بن عياش، عن مُغيرة، عن إبراهيم قال : سؤال الرَّجل للرجلِ : أمؤمنٌ أنت؟ بدعة .

**١٦١** - إبراهيم ووتی : پرسیار کردنی کەسێک لە کەسێ کە بڵێت : ئایە تۆ ئیمانداری؟ ئەوا بیدعەیە - واتە کردنی ئەو پرسیارە بیدعەیە - .

**١٦٢** - حدثنا أبو جعفر محمد بن عوف الحمصي، قال: حدثنا عُمر ابن حفص بن شُلَيْلَةَ الدمشقي، قال: حدثنا أبو شابور، عن سعيد بن عبد الجبار، عن عُمر بن المُغيرة، حدثهم عن أيوب السختياني، عن ابن أبي مُليكة، عن عائشة قالت: ما كان رسول الله ﷺ يبوحُ بهذا الكلام أن يقول: إيماني كإيمان جبريل وميكائيل.

**١٦٢** - عائشة رضي الله عنها فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ ئەو قسەیەی نەدەکرد کە دەڵێ: ئیمانم وەک ئیمانی جبریل و میکائیلە.

**١٦٣** - حدثنا محمد بن إسماعيل، قال: ثنا مخلد بن يزيد، قال: ثنا جعفر بن برقان، عن ميمون في قوله: ﴿**ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِى الْعَرْشِ مَكِينٍ**﴾ [**التَّكْوير: ٢٠**].

قال: ذاك جبريلُ، وخيبةً لمن يزعم أن إيمانه مثل إيمان جبريل.

**١٦٣** - میمون لە وتەی الله تعالى: ﴿**ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ**﴾ [**سورة التكوير: ٢٠**].

ووتی: ئەوە جبریلە، وە جێگەی نائومێدییە کەسێک پێی وایە ئیمانی وەک ئیمانی جبریلە.

**١٦٤** - حدثنا محمد بن يزيد، قال: ثنا أبو الحارث السُّلمي يعني: عبد الوهاب بن الضَّحاك، عن الوليد بن مسلم، قال: قلتُ لمالكٍ، والليثِ بن سعدٍ: الرجلُ يقول: أنا مؤمنٌ كإيمانِ جبريل وميكائيل؟

قالا: إذا قال تلك المقالة، فهو إلى إيمانِ إبليس أقرب منه إلى إيمان جبريل وميكائيل.

**١٦٤** - وليد بن مسلم ووتى: به مالك و الليث بن سعد م ووت: پياوێك دەڵێت: من ئيماندارم وەك ئيمانى جبريل و ميكائيل ە.

هەردووكيان ووتيان: ئەگەر ئەم قسەيەى وتبێ، ئەوا ئيمانەكەى نزيكترە لە ئيمانى إبليس وەك لە ئيمانى جبريل و ميكائيل.

**١٦٥** - سُئل إسحاق عن الرَّجلِ قال: أنا ممن كتبَ اللهُ الإيمان في قلبي؟

قال: إذا قال: لا أحتاجُ إلى النُّطقِ، فهو جهمي أراه.

قال: وإن قال: أحتاج إلى النُّطقِ بلا عملٍ، فهو مرجئ.

**١٦٥** - إسحاق پرسيارى لێكرا دەربارەى پياوێك دەڵێت: من لەو كەسانەم كە الله ئيمانى نووسيوە لە دڵياندا؟

وتى: ئەگەر ووتى: پێويستم بە دەربڕين نييە، ئەوا جەهمييە - والله أعلم مەبەستى ئەوەيە تەنها لەدڵيدا باوەڕى هەبێت بە الله و رسول و پايەكانى ترى باوەڕ، بەبێ ئەوەى بيڵێت بە زمان -.

وە ئەگەر ووتی پێویستم بە دەربڕین هەیە بەبێ کردەوە، ئەوا ڕای مورجیئەیە - واتە بەتەنها وتنی بە زمان، بەبێ ئەوەی کردەوەی پێبکات ئەوا مورجیئەیە - .

**١٦٦** - حدثنا علي بن يزيد، قال : حدثني إبراهيم بن سعيد، أنه سَمِعَ وكيع بن الجرَّاح يقول :

مَن قال : أنا مؤمن عند الله، فهو مُرجئ .

ومَن قال : إيماني كإيمانِ جبريل ومكائيل، فهو شَرٌّ مِن المرجئ .

ومَن زعم أن المعرفةَ تنفعُ في القلبِ وإن لم يتكلَّم بها، فهو مُرجئ .

**١٦٦** - إبراهيم بن سعيد گوێی لە وكيع بن الجراح بوو دەیووت : هەر کەسێک بڵێت : من ئیماندارم لای الله، ئەوا مورجیئەیە .

وە هەر کەسێک بڵێت : ئیمانم وەک ئیمانی جبریل و میکائیلە، ئەوا خراپترە لە مورجیئە .

وە هەر کەسێک پێی وابێت کەوا تەنها ناسین لەدڵەوە سوودی پێدەگەیەنێت ئەگەرچی قسەی پێنەکات، ئەوا مورجیئەیە .

**١٦٧** - قال عليٌّ بن يزيد، قلتُ لعبد الله بن داود : مَن المُرجئة؟

قال : مَن قال : إيماني كإيمانِ جبريل وميكائيل، فهو رَجلُ سُوءٍ، وهو مُرجئ .

**١٦٧** - علي بن يزيد ووتى : به عبد الله بن داود م ووت : مورجيئه كێيه؟

وتى : هەر كەسێك بڵێت : ئيمانم وەك ئيمانى جبريل و ميكائيله، ئەوا پياوێكى خراپه، وه ئەوه مورجيئەيه .

---

: له ئەثەرى ١٦٨ باسكراوه كەوا ئەو گرووپەى كه پێيان وايه ناسين سوود به خاوەنەكەى دەگەيەنێت ئەگەرچى كاريشى پێنەكات ئەوا جەهميه، جا ئەمەيان ڕاسته .

**١٦٨** - حدثنا عبد الله بن محمد بن إسحاق الجزري، قال : سمعت وكيعًا قال : كانت المُرجئةُ تقول : الإيمانُ قولٌ .

فجاءتِ الجهميةُ فقالت : الإيمانُ معرفَةٌ .

قال عبد الله : وحدثني إسحاق بن حكيم، أن وكيعًا قال : وهذا عندنا كُفرٌ .

**١٦٨** - وكيع ووتى : مورجيئه دەڵێن : ئيمان وتەيه .

له دواتر جەهمى هاتن و وتيان : ئيمان تەنيا ناسينه - واته ناسينى الله تعالى تەنيا له دڵەوە - .

عبد الله ووتى : إسحاق بن حكيم بۆى گێڕاينەوه، كه وكيع اوتى : ئەوه لەلامان كوفره .

---

واته وتنى : ئيمان تەنيا وتەيه، ياخود تەنيا ناسينه لەدڵەوه، لەلامان كوفره، والله اعلم .

## باب : (٤)

## باب في من يقول : أنا مؤمن حقا

## دەربارەی کەسێك دەڵێت : من بڕواداری ڕاستەقینەم



**١٦٩** - سمعت إسحاقَ يقولُ : لا تقولُ لرجلٍ : إنَّه مؤمنٌ باسم الإيمان الذي عليه . وذكر ذلك عن النَّضر بن شُميل .

**١٦٩** - گوێم لە إسحاق بوو دەیووت : بە پیاوێک ناڵێین : کەوا بڕواداره بەناوی ئەو بڕوایەی لەسەریەتی، وە باسی ئەمەی کرد لە نضر بن شمیل ەوە .

**١٧٠** - حدثنا أحمد بن حنبل، قال : ثنا أبو سلمة الخُزاعي، قال : قال مالك بن أنس، وأبو بكر بن عيَّاش، وعبد العزيز بن أبي سلمة، وحماد بن سلمة، وحماد بن زيدٍ، الإيمانُ : المعرفة، والإقرار، والعمل .

**١٧٠** - خوزاعی ووتی : مالک بن أنس و أبو بکر بن عیّاش و عبد العزیز بن أبي سلمة و حماد بن سلمة، و حماد بن زید - پێناسەی ئیمانیان کردووە - : ئیمان بریتییە لە : دڵەوە زانست هەبوون و دانپێدانان و کردەوە .

**١٧١** - حدثنا أحمد، قال : ثنا وكيع، قال : قال سفيان : النَّاسُ عندنا مؤمنون في الأحكام والمَواريث، ونرجو أن نكون كذلك ولا ندري ما حالنا عِند الله .

**١٧١** - سفيان ووتی : خەڵکی لای ئێمە بڕوادارن لە حوکم و میراتییەکان، وە ئومێدەوارین ئێمەش وابین، وە نازانین حاڵمان چۆنە لای الله .

**١٧٢** - سمعتُ إسحاق يقول : وسأله رجلٌ فقال : الرَّجل يقولُ : مؤمنٌ حقًّا، فقال : هو كافِرٌ حَقًّا .

**١٧٢** - گوێم لە إسحاق بوو دەیووت، وە پیاوێک پرسیاری لێکرد ووتی : پیاوێک دەڵێت : من ئیمانداری ڕاستەقینەم .

ئەویش ووتی : ئەو کافری ڕاستەقینەیە .

---

: والله أعلم لەبەر گەورەیی قسەکە وشەی کافری بەکارهێنراوە، چونکە لە کتابی **(السنة للخلال : ٩٧٥)** هاتووە کە زیاد بن أیوب دەڵێت : گوێم لە أحمد بن حنبل بوو دەیوت : پێمان خۆش نیە کەوا بڵێین : ئیمانداری ڕاستەقینەین، وە ئەو کەسەش کافر ناکەین کە ئەم قسەیە دەکات .

**١٧٣** - حدثنا إسحاق، قال : أخبرنا مُعتمر، عن ليث، عن صاحب له، عن الحسن قال : قال رسول ﷺ : مَن قال : مُؤمِنٌ حقًّا، فهو مُنافِق حقًّا .

**١٧٣** - حسن ووتى : رسول الله ﷺ فەرموويەتى : (هەر كەسێك بڵێت من ئیمانداری ڕاستەقینەم، ئەوا بەڕاستی ئەو كەسە منافقە) - حەدیسەكە ضعیفە - .

**١٧٤** - حدثنا أبو بكر محمد بن يزيد، قال : ثنا عبد الصَّمد بن أزهر، عن ابن مبارك، قال : قلتُ لابن عون : تزعم أنَّك مؤمنٌ؟

قال : إنِّي لأستحي الله أن أزعُمَ أنِّي مسلم .

**١٧٤** - إن مبارك ووتی : به ابن عون م ووت : تۆ بانگەشەی ئەوە دەكەیت كە بڕواداری؟

ووتی : بەڕاستی من شەرم دەكەم لە الله كە بڵێم من مسوڵمانم .

**١٧٥** - حدثنا أبو معن، قال : ثنا وهب بن جرير، قال : ثنا أبي، قال : ثنا الفضيل بن حسَّان، قال : ذكروا عند أبي جعفر محمد بن علي قول النبي ﷺ : لا يزنِي الزَّانِي حِينَ يزني وهو مؤمِنٌ، ولا يسرِقُ السَّارِقُ حِينَ يسرِقُ وهو مؤمِنٌ .

فقال : قال محمد بن عليّ فأدار دارة هكذا كَبيرة، فقال : هذا الإسلام . وأدار دارة أُخرى صغيرة في جوفِها، وقال : هذا الإيمانُ مقصورٌ في الإسلام، فإذا زنى، أو سرقَ : خرجَ مِن الإيمان، فإذا تاب رجعَ إلى الإيمان، ولا يخرجه من الإسلامِ إلَّا الشِّرك .

والدَّارة هكذا .

**١٧٥** - له فضيل بن حسان ەوه گێڕڕاوەتەوه، ووتی : له لای أبي جعفر محمد بن علي وتەی رسول الله ﷺ باسكرا كه دەفەرمووێت : (زیناكار زینا ناكات لەو كاتەی كه زیناكه دەكات و بڕوادار بێت، وه دزیش دزی ناكات لەو كاتەی دزییەكەی تێدا دەكات و بڕواداریش بێت) .

---

: واته كەسێک كاتێک زینایەک دەكات یان دزی، ئەوا ئیماندار نییه واته لەبەرگی ئیمان دێتە دەرەوه تەنیا مسوڵمانیەتەكەی دەمێنێتەوه، بەڵام گەر لەو حاڵەشدا بمرێت ئەوا به كافری نامرێت، والله اعلم .

ووتی : محمد بن علی ووتی : بازنەیەكی گەورەی دروستكرد بەم جۆره و ووتی : ئەمه ئیسلامه، پاشان بازنەیەكی تری بچووكی دروستكرد لەناویدا و ووتی : ئەمه ئیمان و بڕوایه و له ئیسلامدا كورتكراوەتەوه، كاتێک زینای كرد و دزی كرد له ئیمان دەردەچێت، كاتێكیش تۆبەی كرد دەگەڕێتەوه ناو ئیمان، وه هیچ شتێک له ئیسلام دەری ناكات ئیللا شیرک نەبێ .

بازنەكەش بەم جۆرەیه .

**١٧٦** - حدثنا أحمد، قال : ثنا زيد بن حُباب، قال : حدثنا حُسين ابن واقد، قال : ثنا عبد الله بن بُريدة، عن أبيه، قال : قال رسول الله ﷺ : بينَنَا وبينَهُم تركُ الصَّلاةِ، فمن تركَها فقد كَفَرَ .

**١٧٦** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (لە نێوان ئێمە و ئەواندا وازهێنانە لە نوێژ، هەر کەسێک وازی لێهێنا کافر بووە) .

: **رواه أحمد** (**٢٣٠٠٧**) حەدیسەکە صحیحە .

**١٧٧** - حدثنا إسحاق بن إبراهيم، قال : أخبرني بقية بن الوليد، عن زياد بن أبي حميد، عن مكحول فيمن يقول : الصَّلاة مِن عندِ الله، ولا أُصلِّيها، والزَّكاة مِن عندِ الله، ولا أؤدِّيها .

قال : يُستتابُ، فإن تابَ وإلَّا قُتِلَ .

**١٧٧** - مکحول دەربارەی ئەوەی کە دەڵێت : نوێژ لە لایەن الله وەیە و نایکەم، وە زەکات لە لایەن الله وەیە و جێبەجێی ناکەم - واتە دەزانێت کە الله فەرزی کردووە بەسەریدا و کەچی جێبەجێیان ناکات - .

ووتی : داوای تەوبەی لێدەکرێت، ئەگەر تەوبەی کرد ئەگینا دەکوژرێت .

**١٧٨** - قال إسحاقُ : وقال ابن المبارك، ووكيع في ترك الصَّلاة مُتعمدًا، فأحدهما يقول : هو أن يتركَ الظُّهرَ إلى وقتِ العَصرِ مُتعمِّدًا .

وقال الآخرُ : هو أن يترك الظَّهرَ إلى المغربِ، والمغربَ إلى الفجرِ .

**١٧٨** - إسحاق ووتی : وه إبن مبارک و وكيع دەربارەی وازهێنانی نوێژ به ئەنقەست ووتیان :

یەکێکیان ووتی : ئەوەیە کە واز لە نوێژی نیوەڕۆ بێنیت بەئەنقەست تاوەکو کاتی نوێژی عەسر .

وه ئەویتریشیان ووتی : ئەوەیە کە واز لە نوێژی نیوەڕۆ بێنیت تاوەکو مەغریب، وه مەغریبیش تا بەیانی .

**١٧٩** - حدثنا أحمد بن الأزهر، قال : حدثنا مروان بن محمد، قال : حدثنا أبو مُسلم الفزاري، قال : سمعت الأوزاعي، وسُئل عن رجُلٍ قال : أنا أعلم أن الصَّلاةَ حقٌّ ولا أُصلِّي .

قال : يعرضُ على السَّيفِ، فإن صلَّى وإلَّا قُتل .

قال : وسمعت سعيد بن عبد العزيز سُئِلَ عنه، قال : يُحبَسُ، ويُضربُ حتَّى يُصلِّي.

**١٧٩** - ئەوزاعی پرسیاری لێکرا دەربارەی کەسێک کە وتوویەتی : من دەزانم کە نوێژ ڕاست و حەقە، وه نوێژیش ناکەم .

ووتی : شمشێری پێ نیشان دەدرێت، ئەگەر نوێژی کرد ئەگینا دەکوژرێت .

ووتی : گوێم لە سعید بن عبدالعزیز بوو کە پرسیاری لێکرابوو، ووتی : بەند دەکرێ، وه لێی دەدرێت تاوەکو نوێژ دەکات .

**١٨٠** - حدثنا أحمد، قال : ثنا عبد الله بن يزيد، قال : ثنا عبد الله ابن لهيعة، قال : حدثني بكر بن عمرو المُعافري، عن رَجُل، قال : قال عُقبة بن عامرٍ : إن الرَّجلَ ليتفضَّل الإيمان كما يفضلُ ثوب المرأة .

**١٨٠** - عقبة بن عامر ووتى : بەڕاستى پیاو ئیمان لەبەردەکات هەروەکو چۆن ئافرەت جلێک لەبەر دەکات .

**١٨١** - وحدثنا علي بن يزيد، قال : حدثنا سليمان بن داود، قال : ثنا الصَّلت بن دينار، قال : سمعت ابن أبي مُليكة يقول : لقد أتى عليَّ بُرهة من دهرِي وما أرى أني أسمع رَجُلًا يقول : إني مُؤمن، فوالله مَا رضوا بذلك حتَّى قالوا : إنَّه لمؤمنٌ وإن نكح أُمَّه وأُخته، والله لقد أدركتُ أكثرَ مِن ثلاثمائةِ من أصحابِ محمدٍ ما مِنهم رجلٌ يموتُ إلَّا وهو يخشى النِّفاقَ على نفسِهِ .

**١٨١** - الصَّلت بن دينار بۆی گێڕاینەوە ووتی : گوێم لە ابن ابي مليكة بوو دەیووت : گەیشتم بە ماوەیەک لە سەردەمەکەم نەمبینی گوێم لە پیاوێک ببێت بڵێ : من بەڕاستی ئیماندارم، سوێند بە الله بەمە ڕازی نەبوون تاوەکو وتیان : بەڕاستی ئەمە ئیماندارە ئەگەر هاوسەرگیری لەگەڵ دایک و خوشکیشی بکات، والله ئەوە ئیماندارە وەکو جبريل عليه السلام، محمد هەرگیز بە وتەیەکیش قسەی تێدا نەکردووە، والله گەیشتم بە زیاتر لە سێ سەد لە هاوەڵانی محمد ﷺ، هیچ یەکێکیان تیانەبووە لێیان مردبا ئیللا ترسی دووڕوویی هەبووە بۆ سەر نەفسی خۆی .

١٨٢ - حدثنا أحمد، قال: حدثنا سُفيان بن عُيينة، عن الزُّهري، عن سالم، عن أبيه، سمع النبي ﷺ رجلًا يَعِظُ أخاهُ في االحياء، قال النَّبي ﷺ: الحياءُ مِن الإيمَانِ.

١٨٢ - پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێک بوو کە ئامۆژگاریی براکەی دەکرد لە شەرم و حەیا - بۆ ئەوەی شەرم نەکات - ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (شەرم و حەیا لە ئیمانەوەیە).

---

: (رواه البخاري: ٢٤) و (مسلم: ٣٦).

١٨٣ - حدثنا أحمد، قال: ثنا يحيى بن سعيد، عن حبيب بن الشَّهيد، قال: حدثنا عطاء، قال: سمعت أبا هريرة يقول: لا يزني حِين يزني وهو مؤمن، ولا يسرق حِين يسرق وهو مُؤمن.

قال عطاءٌ: يتنحَّى عنه الإيمان.

١٨٣ - أبا هريرة رضي الله عنه دەفەرمووێت: (لەکاتی زینادا زینا ناکات و بڕواداریش بێت، وە دزی ناکات لەکاتی دزیەکەی و بڕواداریش بێت).

عطاء ووتی: ئیمانەکەی نامێنێت.

**١٨٤** - حدثنا أحمد، قال : حدثنا يحيى، عن عوفٍ، قال الحسنُ : يُجانبه الإيمان ما دامَ كذلك، فإن راجعَ راجعه .

**١٨٤** - حسن ووتی : ئیمان لێی لادەدات مادام ئاوابێت، ئەگەر گەڕایەوە ئەوا ئیمانەکەشی دەگێڕێتەوە .

**١٨٥** - حدثنا أحمد، قال : ثنا يحيى، قال : ثنا أشعث، عن الحسن عن النبي ﷺ قال : ينزعُ مِنهُ الإيمان، فإن تابَ أُعِيدُ إليهِ الإيمان .

**١٨٥** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئیمانی لێ دەسەنرێتەوە، ئەگەر تەوبەی کرد ئەوکات ئیمانەکەی بۆ دەگێڕدرێتەوە)

---

: رواه الخلال في (**السنة : ١٢٦٩**) كه مرسل ه .

**١٨٦** - وسمعت أحمد وقِيل له : المُرجئةُ مَن هُم؟

قال : مَن زعمَ أن الإيمانَ قول .

**١٨٦** - گوێم لە أحمد بوو وە پێی وترا : مورجیئە کێن؟

ووتی : هەر کەسێک پێی وابێت کە ئیمان وتەیە - واتە پێی وابێت ئیمان تەنیا وتەیە بەبێ کردەوە - .

## باب : (٥)

# الصلاة خلف المرجئ

# نوێژکردن له دوای مورجیئه



**١٨٧** - وسمعتُ أحمد يقول : لا يُصلَّى خلف مَن زعم أن الإيمان قول إذا كان داعِية .

**١٨٧** - گوێم له أحمد بوو دەیووت : نوێژ ناکرێت لەدوای کەسێکەوە کە پێی وابێت ئیمان تەنها وتەیە - واته ئیمان تەنها وتەیە بەبێ کردەوە - ئەگەر بانگخواز بێت - واته بانگەوازی ئەوە بکات کە ئیمان تەنیا وتەیە - .

**١٨٨** - وسمعتُ إسحاقَ يقول : مَن قال : أنا مُؤمنٌ، فهو مُرجِئ .

قلتُ : الصَّلاة خلفَهُ؟

قال : لا .

**١٨٨** - گوێم لە إسحاق بوو دەیووت : هەر کەسێک بڵێت من بڕوادارم، ئەوا مورجیئەیە .

ووتم : ئەی نوێژکردن لەدوایەوە؟

ووتی : نەخێر - واتە نوێژ لەدوایەوە مەکەن گەر بیروباوەڕی بەم شێوەیە بوو - .

**١٨٩** - وسمعتُ إسحاقَ أيضًا يقول : أوَّل مَن تكلَّمَ بالإرجاءِ، زعموا أنه الحسنَ بن محمد ابن الحنفية .

ثُم غلت المُرجئة حتَّى صارَ مِن قولِهم، أن قومًا يقولون : مَن تركَ المكتوبات، وصومَ رمضان، والزَّكاةَ، والحجَّ، وعامَّةَ الفرائض مِن غيرِ جُحودٍ بها أنَّا لا نُكفِّره، يُرجى أمره إلى الله، بعد إذ هو مُقِرٌّ . فهؤلاءِ المُرجئةُ الذين لا شكَّ فيهم .

ثُم هُم أصنافٌ، منهم من يقول : نحن مؤمن البتَّة، ولا نقول : عندَ الله، ويرون الإيمان قولًا وعملًا، وهؤلاء أمثلهم .

وفرقةٌ يقولون : الإيمان قول، وتصديقه العمل، وليس العمل مِن الإيمان، ولكن العمل فريضة، والإيمان هو القول، ويقولون : حسناتُنا مُتقبَّلة، ونحن مؤمنون عند الله، وإيمانُنا وإيمان جبريل واحد .

فهؤلاء الذين جاء فيهم الحديث : أنَّهم المُرجئة التي لُعِنت على لسانِ الأنبياء :

أخبرنا بقية بن الوليد، عن زُرعة بن عبد الله الزُّبيدي، أن شيخًا حدَّثهم، عن مُعاذ بن جبلٍ، قال : لُعِنت المُرجئةُ والقدريَّةُ على لسانِ سبعينَ نبيًّا، آخرهم محمد ﷺ .

**١٨٩** - وه گوێم له إسحاق بوو دەیووت : یەکەم کەس کە قسەی کردووە بە إرجاء پێیان وابووە کە حسن بن محمد إبن حنفیة یە .

پاشان مورجیئەکان زیادەڕۆییان کرد لە قسەکانیان هەتا وای لێهات، کە کۆمەڵێک لەوان دەڵێن :

هەر کەسێک وازی هێنا لە نوێژە فەڕزەکان و ڕۆژووی ڕەمەزان و زەکاتدان و حەج کردن، وە تێکڕای فەڕزەکان بەبێ نکۆڵی لێ کردنیان ئەوا ئێمە کافری ناکەین، ئەمر و کاروباری دەگەڕێنینەوە بۆلای الله دوای ئەوەی دانی پێداناوە .

ئا ئەوانە موڕجیئەن هیچ گومانی تێدا نییە .

پاشان ئەوان چەند جۆرێکن، تێیاندا هەیە دەڵێت : تەواو ئێمە ئیمانداریـن، وە ناڵێین : لە لای الله، وە وایدەبینن ئیمان وتە و کردەوەیە، وە ئەوانەش هاوشێوەیانن .

وە گروپێکیشیان دەڵێن : ئیمان ووتەیە، وە بەڕاستدانانی بریتییە لە کردەوە، وە کردەوە لە ئیماندا نییە، بەڵام کردەوەکردن فەڕزە، وە ئیمان ووتە یە، وە دەڵێن : چاکەکانمان وەرگیراو و قبوڵکراوە، وە ئێمە ئیمانداریـن لای الله، وە ئیمانی ئێمە و جبریل وەک یەکە .

ئەوانە دەربارەیان حدیث هاتووە : کەوا بەڕاستی ئەمانەن ئەو مورجیئانەی کەوا لەسەر زوبانی پێغەمبەران لەعنەت و نەفرینیان لێ کراوە .

بقية بن وليد هەواڵی پێداین، لە زرعة بن عبد الله الزبيدي، کەوا شێخێک هەواڵی پێداون، دەربارەی معاذ بن جبل، وتوویەتی : قەدەری و مورجیئە لەعنەتیان لێ کراوە لەسەر زوبانی حەفتا پێغەمبەر، دواهەمیینیان محمدە ﷺ - ئیسنادەکە ضعیف ە - .

**١٩٠** - حدثنا عبد الله بن خُبيق، قال : سمعت يوسف بن أسباط، يقول : أمَّا المُرجئةُ فهم يقولون : الإيمانُ كلامٌ بلا عملٍ، من شهد أن لا إله إلَّا الله، وأن محمدًا رسول الله، فهو مُستكملُ الإيمان، كإيمان جبريل وميكائيل، وإن قتلَ كذا وكذا مؤمنًا، وترك الصَّلاةَ، والصِّيامَ، والغُسلَ مِن الجنابةِ .

وهُم يرون السَّيفَ على أُمَّةِ محمد ﷺ .

**١٩٠** - عبد الله بن خبيق بۆی گێڕاینەوە، ووتی : گوێم لە یوسف بن أسباط بوو دەیووت : ئەمما مورجیئەکان دەڵێن : ئیمان وتەیە بەبێ کردەوە، هەر کەسێک شایەتی بدات بە لا إله إلا الله، و أن محمدًا رسول الله، ئەوا ئیمانی تەواو و کامڵە، وەک ئیمانی جبریل و میکائیل، ئەگەرچی ئەوەندە و ئەوەندە بڕوادارە بکوژێت، وە واز بهێنێت لە نوێژ و ڕۆژوو، وە غوسڵ دەرکردن لە کاتی لەشگرانی .

وە ئەوان بە ڕەوای دەبینن شمشێر لەسەر ئوممەتی محمد ﷺ .

**١٩١** - حدثنا علي بن يزيد، قال : حدثنا عِصمة بن المُتوكِّل، قال : سألتُ سُفيان بن عُيينة عن المُرجئة؟

قال : مَن زعمَ أن الصَّلاةَ والزّكاةَ ليستا مِن الإيمان .

**١٩١** - عصمة بن متوكل بۆی گێڕاینەوە، ووتی : پرسیارم کرد لە سفیان بن عیینة دەربارەی مورجیئە؟

ووتی : هەر کەسێک پێی وابێت کەوا نوێژکردن و زەکاتدان لە ئیماندا نین.

**١٩٢** - حدثنا أبو سُليمان يحيى بن عثمان، قال : حدثنا بقية بن الوليد، قال : ثنا محمد بن عبد الرحمن، قال : حدثني فِطْر ابن خليفة، عن ابن سابط، عن أبي بكر الصِّدّيق، قال : قال رسول الله ﷺ : صِنفانِ مِن أُمَّتي لا يدخُلون الجنَّةَ : القدريَّةُ، والمُرجِئةُ .

**١٩٢** - أبي بکری صدیق رضي الله عنه فەرموویەتی : رسول الله ﷺ فەرمووی : (دوو کۆمەڵ هەن لە ئوممەتەکەم ناچنە بەهەشتەوە، قەدەریی و مورجیئە) .

---

: حەدیسەکە مونکەرە، إبن القیم لە [**تهذیب السنن** ٢٩٨/١٢] دەڵێ :

ئەوەی کە بە صحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێ دەربارەی زەم کردنی ئەهلی بیدەع، خەواریجەکانن .

بۆیە وتەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خەواریجەکان لەهەموو ڕوویەکەوە صحیحە، لەبەر ئەوەی وتەکانیان لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەرکەوتبوو، بەڵام ئیرجاء، و ڕافیزە، و قەدەر و جەهمی و حلول و غەیری ئەوانە لە بیدعەکان، لە کۆتایی هاتنی سەردەمی هاوەڵان دەرکەوتن .

وە بیدعەی قەدەرییەکان : لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵان دەرکەوت، هەریەک لەو هاوەڵانەی زیندوو بوون نکۆڵیان لێکرد وەکو : عبدالله بن عمر، إبن عباس، وە هاوشێوەکانیان .

زۆرترین وتە دەربارەی زەمکردنیان هاتبێ ئەوا : موقوف بووە بۆ سەر هاوەڵان کە وتەیان هەیە دەربارەیان .

پاشان بیدعەی ئیرجاء دەرکەوت لەدوای کۆتایی هاتنی سەردەمی هاوەڵان، کە گەورەی و کیباری تابعین قسەیان دەربارەی کردووە ئەوانەی کەوا پێیان گەیشتوون هەروەکو چۆن دەربارەیان باسمان کرد، پاشان بیدعەی تجهم - جەهمیەکان - دەرکەوت لەدوای کۆتایی هاتنی سەردەمی تابعین .

**١٩٣** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، قال : ثنا بقيَّة، قال : حدثنا المعافى ابن عمران الموصلي، عن القاسم بن حبيب، عن نِزار بن حيَّان، عن عِكرمة، قال : قال ابن عبَّاس : اتقوا هذا الإرجاء، فإنَّه شعبة من النَّصرانيَّة .

**١٩٣** - إبن عباس ووتی : بترسن لەم ئیرجائە، چونکە بەڕاستی ئەوە بەشێکە لە نەصرانیەت .

**١٩٤** - حدثنا عمرو بن عُثمان، قال : حدثنا بقيَّة، قال : حدثني أبو العلاء الدمشقي، قال : حدثني محمد بن جُحَادة، عن يزيد بن خمير، عن مُعاذ بن جبلٍ، قال : قال رسول الله ﷺ : ألَا وإنَّ اللهَ قد لعنَ المُرجئةَ والقدريةَ على لِسَانِ سَبعينَ نبيًّا، ألا وإنَّ صِنفينِ مِن أُمَّتي لا يَدخلون الجنَّة : المرجِئة، والقدرِيَّة .

**١٩٤** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئاگاداربن بەڕاستی الله تعالى نەفرەتی لە مورجیئە و قەدەری کردووە لەسەر زمانی حەفتا پێغەمبەر، ئاگاداربن دوو جۆر لە ئوممەتەکەم ناچنە بەهەشت : مورجیئە، وە قەدەری) .

---

: سەیری ڕوونکردنەوەی ئەثەری **١٩٢** بکە .

**١٩٥** - حدثنا أحمد، قال : ثنا محمد بن بشر، قال : حدثني سعيد بن صالح، عن حكيم بن جُبير، قال : قال إبراهيم : للمُرجئة أخوف عندي على أهل الإسلام مِن عِدتهم مِن الأزارقة .

**١٩٥** - إبراهيم ووتی : ترسی زۆرم لە مورجیئەیە بۆ سەر ئەهلی ئیسلام وەک لە الأزارقة .

---

: واتە زیاتر لە مورجیئە ئەترسم بۆ سەر ئیسلام وەک لە الأزارقة، لەکاتێکدا کە الأزارقة گروپێکن لە خەواریج، وەک لەپێشوو باسکرا لە باب ى یەکەم .

**١٩٦** - حدثنا أحمد، قال : ثنا وكيع، قال : ثنا القاسم بن حبيب، عن رجلٍ يقال له : نِزار بن حيان، عن عكرمة، عن ابن عباس، قال : صِنفان مِن هذه الأُمَّة ليسَ لهما في الإسلام نصيبٌ : المُرجئةُ، والقدرية .

**١٩٦** - إبن عباس ووتى : دوو كۆمەڵ هەن لەم ئوممەتە هيچ بەشێكييان لە ئيسلامدا نييە : مورجيئە و قەدەرى .

**١٩٧** - حدثنا أحمد، قال : ثنا مُعاوية بن عمرو، قال : ثنا أبو إسحاق، قال : قال الأوزاعيُّ : كان يحيى بن أبي كثير وقتادة يقولان : ليس مِن الأهواءِ أخوف عندهما من الإرجاء .

**١٩٧** - ئەوزاعى ووتى : يحيى بن أبي كثير و قتادة دەيانووت : لە هەواو ئارەزووەكاندا هيچ شتێك نييە زياتر لێى بترسين وەك لە ئيرجاء .

---

: واتە لە هەموو اهلى هەواو ئارەزوو زياتر ترسمان لە ئيرجاء هەبووە .

**١٩٨** - حدثنا أحمد، قال : ثنا مُؤمل، قال : سمعت سفيان يقول : قال إبراهيم : تركتِ المُرجئةُ الدِّينَ أرقَّ مِن ثوبِ سَابري .

**١٩٨** - إبراهيم ووتى : مورجيئە وازيان لەدين هێنا نەرمتر لە جلى سابري .

: جلی سابري جلێکی تەنکە ژێرەوە هیچ داناپۆشێت .

**١٩٩** - حدثنا محمد بن يزيد، قال : ثنا أبو أحمد، عن زياد بن المنذر، قال : سمعت الشَّعبي يقول : لو كانت المرجئة من الدَّواب لكانوا حُمُرًا .

**١٩٩** - زياد بن المنذر ووتی : گوێم لە الشَّعبي بوو دەیووت : ئەگەر مورجیئە لە ئاژەڵەکان بونایە، ئەوا دەبوونە گوێدرێژ .

**٢٠٠** - حدثنا أحمد، نا عبد الله بن ميمون أبو عبد الرحمن الرَّقِّي، قال : أخبرنا أبو مليح، قال : سُئل ميمون عن كلام المُرجئة؟

فقال : أنا أكبرُ مِن ذلك .

**٢٠٠** - أبو مليح ووتی : پرسیاری کرا لە میمون دەربارەی قسەی مورجیئە؟

ووتی : من لەوە گەورەترم

: واتە پێش ئەوەی إرجاء هەبێت من هەبووم ، واتە دینێکی تازەیە، من لەژیاندا بووم إرجاء پەیدا نەبوبوو، دواتر پەیدا بوو، واتە دینی ئیسلام بوایە تازە نەدەبوو، کەوایە بیدعەیە و تازەیە .

**٢٠١** - حدثنا أحمد، قال : ثنا عبد الرحمن، قال : حدثني محمد بن أبي الوضاح، عن العلاء بن عبد الله بن رافع، أن ذرًّا أبا عُمر أتى ابن جُبيرٍ يومًا في حاجَةٍ، قال : فقال : لا حتَّى تُخبرني على أيّ دينٍ أنت اليوم؟ فإنَّك لا تزال تلتمِسُ دينًا قد أضللته، ألا تستحي مِن رأيٍ أنت أكبر منه؟!

**٢٠١** - له العلاء بن عبد الله بن رافع ەوە، کەوا ڕۆژێک ذر ى باوکی عمر - کە یەکێکە لە موڕجیئە - بۆ پێویستیەک چوو بۆ لای إبن جبیر و پێی ووت، ووتی : نەخێر تاوەکو هەواڵم پێنەدەیت کەوا ئەمڕۆ لەسەر چ دینێکی؟

چونکە بەڕاستی تۆ تا ئێستاش بەدوای دینێک کەوتوویت کە گومڕای کردووی، ئایە شەرم ناکەیت لەبۆچوونێک کە تۆ لەو گەورەتری؟!

**٢٠٢** - حدثنا أبو الأزهر، قال : ثنا سعيد بن عامر، عن سلام، عن أيوب، قال : أنا أكبرُ من الإرجاء .

**٢٠٢** - أيوب ووتی : من گەورەترم لە - دین و بیروبۆچوونی - إرجاء .

**٢٠٣** - حدثنا أبو الأزهر، قال : سمعت أبا ضمرة يقول : قال أبو حازِم : لعنَ الله دينًا أنا أكبرُ منه .

**٢٠٣** - أبو حازم ووتی : نەفرەتی الله لەدینێک کە من لەو گەورەترم - مەبەستی موڕجیئەیە والله اعلم - .

**٢٠٤** - حدثنا أحمد، قال : ثنا أبو عمر، قال : ثنا حماد بن سلمة، عن عطاء بن السَّائب، عن زاذان وميسرة، قالا : أتينا الحسن ابن محمد، فقلنا : ما هذا الكتاب الذي وضعت؟! وكان هو الذي أخرج كتاب المرجئة .

قال زاذان : فقال لي : يا أبا عُمر، لوددت أني مِتُّ قبل أن أُخرِجَ هذا الكتاب .

**٢٠٤** - زاذان و ميسرة وتيان : چووينه لاى الحسن ابن محمد پێمان ووت : ئەوە چ كتێبێكە داتناوە؟

ئەو بوو كە كتێبى مورجيئەى دەرهێنا .

زاذان ووتى : پێى ووتم : ئەى باوكى عمر خۆزگايە دەمردم پێش ئەوەى ئەو كتێبە دەربهێنيت - واتە مردبام پێش ئەوەى ببينم ئەو كتێبە دەربهێنيت، كە ئەمەش بەهۆى رِق لێبوونەوەى زۆر بووە بۆئەم گرووپە گومڕايە، والله اعلم - .

**٢٠٥** - قال أحمد : لا يُعجبني للرَّجُلِ أن يُخالِطَ المُرجِئة .

**٢٠٥** - ئيمامى أحمد ووتى : سەرسامى كەسێك نيم - خۆشم ناوێت - كەوا تێكەڵى مورجيئە ببێت .

**٢٠٦** - حدثنا بشار بن موسى، قال : قيل لشريك ونحنُ عنده : يا أبا عبد الله، كانوا يتزاورُون وأهواؤهم مُختلفة؟

قال : لا .

حدثنا مُغيرة، قال : سلَّمَ التيميُّ على النَّخعيَّ فلم يرُدَّ عليهِ .

وسَلَّمَ ذَرٌّ على سعيد بن جُبيرٍ فلم يرُدَّ عليه .

قيل له : لم يا أبا عبد الله؟

قال : لأنّهم كانوا يرون الإرجاء، زعموا أن الصَّلاة ليس من الإيمان، إنَّما الإيمان قول! وقد حدثنا أبو إسحاق، عن البراء في قول الله تبارك وتعالى : ﴿**وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ**﴾ [**البَقَرَة : ١٤٣**] .

قال : صلاتكم نحو بيت المَقدِس .

**٢٠٦** - بشار بن موسى بۆی گێڕاینەوە، ووتی : بە شریک ووترا لە کاتێکدا ئێمەش لە لای بووین : ئەی باوکی عبد الله، ئایا سەردانی یەکتریان دەکرد لە کاتێکدا هەواو ئارەزووەکانیان جیاوازبوو؟

ووتی : نەخێر .

مغيرة بۆی گێڕاینەوە، ووتی : التيمي سەلامی کرد لە نخعي ئەویش وەڵامی نەدایەوە، ذر یش سەلامی کرد لە سعيد بن جبير وڵامی نەدایەوە .

پێی وترا : بۆچی ئەی باوکی عبد الله؟

ووتی : چونکە ئەوان إرجاء یان بەڕاست دەزانی، پێیان وابوو نوێژ لە ئیماندا نییە، وە بەڕاستی ئیمان وتەیە، وە أبو إسحاق بۆی گێڕاینەوە لە براء ەوە دەربارەی وتەی الله تبارک وتعالى : ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمۡۚ﴾ [البقرة : ١٤٣] .

ووتی : نوێژەکەتان ڕووی بەرەو قودس بێ .

---

: ئەو ئایەتەی هێناویەتی کە دەفەرموێ : الله تعالى ئیمانەکەتان بەفیڕۆ نادات، دەڵێ : لێرە ئیمان مەبەستی پێی ئەو نوێژانەیە کە بەرەو بیت المقدس کردووتانە بەفیڕۆی نادات، لێرەدا نوێژ بە ئیمان ناو براوە، ئەم ئایەتەش کاتێ دابەزی کە قیبلە گۆڕا، والله اعلم .

**٢٠٧** - حدثنا أحمد بن سُليمان الباهلي، قال : ثنا مرحوم العطَّار، قال : سمعت أبي وعمي، سمعا الحسن ينهى عن مُجالسة معبد الجهني، ويقول : لا تُجالسُوه، فإنَّه ضالٌّ مُضِلٌ .

**٢٠٧** - مرحوم العطار بۆی گێڕاینەوە، ووتی : گوێم لە باوکم و مامم بوو گوێیان لە حسن بوو نەهی دەکرد لە دانیشتن لەگەڵ معبدی الجهني - کە یەکێک بوو لە ئیمامی قەدەریەکان - ، وە دەیووت : لەگەڵی دامەنیشن چونکە ئەو گومڕا و گومڕاکەرە .

# باب : (٦)

# باب في القدر

# دەربارەی قەدەر



**٢٠٨** - سمعتُ إسحاق يقول: الخيرُ والشَّرُّ مِن الله مقدورٌ على عِباده.

**٢٠٨** - گوێم لە إسحاق بوو دەیوت: خێر و شەڕ لە سەر بەندەكان بە قەدەر نوسراوە لە لایەن الله ـەوە.

**٢٠٩** - حدثنا أبو معن، قال: ثنا أبو أحمد الزُّبيري، قال: حدثنا سفيان الثوري، عن عُمر بن محمد، قال: كنتُ عِند سالم ابن عبد الله، فقال له رجلٌ: الرَّجل يزني، كتبَهُ اللهُ عليه؟

قال: نعم.

قال: ويُعذِّبُه عليه؟

قال: نعم.

**٢٠٩** - عمر بن محمد ووتى : له لاى سالم ابن عبد الله بووم، پياوێك پێى وت : پياوێك زينا دەكات، الله لەسەرى نووسيوه؟

وتى : بەڵێ .

وتى : وه لەسەرى سزاى دەدات؟

وتى : بەڵێ .

**٢١٠** - حدثنا محمد بن الوزير الدِّمشقي، قال : حدثنا يوسف بن السَّفر، قال : حدثنا الأوزاعي، قال : حدثني يونس بن يزيد الأيلي، عن ابن شِهاب، عن عبد الرحمن بن كعب بن مالك، عن أبيه، قال : قال رسول الله ﷺ : إنَّ اللهَ لمَّا وعدَ موسى أن يُكلِّمه خرجَ إلى الوقتِ الذي وعدَهُ الله، قال : فبينا هو يُناجي ربَّه إذ سمعَ خلفَهُ صوتًا، فقال : إلهي إني لأسمع خلفي صوتًا، لعل قومي ضلُّوا؟

قال : نعم يا موسى .

قال : إلهي فمن أضلَّهم؟

قال : أضلهم السَّامري .

قال : إلهي، فيمَ أضلَّهم؟

قال : صاغَ لهم عِجلًا جسدًا له خُوار .

قال : إلهي، هذا السَّامري صاغَ لهم العِجل، فمن نفخَ فيه الرُّوح حتَّى صارَ له خُوار؟

قال : أنا يا موسى .

قال : فَوَعزَّتِكَ إلٰهي ما أضلَّ قَومي أحدٌ غيرَك .

قال : صدقتَ يا حَكيم الحُكماء، لا ينبغي لحكيمٍ أن يكونَ أحكم مِنك .

**٢١٠** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله تعالى كاتێک بەڵێنيدا بە موسى كەوا قسەی لەگەڵدا بكات دەرچوو لەوكاتەی كە الله بەڵێنی پێدابوو، وتی : لە كاتێكدا كە موناجاتی دەكرد لەگەڵ پەروەردگاری لەدواوە دەنگێكی بيست، ئەويش وتی : ئەی پەرستراوی من لەدواوە دەنگێک دەبيستم، ڕەنگە گەل و هۆزەكەم گومڕابووبن؟

فەرمووی : بەڵێ ئەی موسى .

موسى وتی : ئەی پەرستراوی من كێ گومڕای كردوون؟

فەرمووی : سامري گومڕای كردوون .

وتی : ئەی پەرستراوی من لەچيدا گومڕای كردن؟

فەرمووی : گوێرەكەی بەبۆڕەی لە خشڵ و زێڕ بۆ سازدان و پەرستيان .

وتی : ئەی پەرستراوی من ئەوە سامری بوو كە گوێرەكەكەی بۆ سازدان، ئەی كێ فووی پياكرد تاوەكو بۆڕەی بێت؟

فەرمووی : من ئەی موسی .

وتی : دەی سوێند بێ بە عیزەتی تۆ ئەی پەرستراوی من بێجگە لە تۆ کەسی تر قەومەکەمی گومڕا نەکرد .

پەروەردگار فەرمووی : ڕاستتکرد ئەی دانای داناکان، هیچ دانایەک ناتوانێت لەتۆ داناتر بێت) .

---

: بخاري دەڵێت : حەدیسەکە منکرە، وە أبو زرعة دەڵێت : ئەوە حەدیسێکی متروک ە .

**٢١١** - حدثنا إسحاق بن إبراهيم، قال : أخبرنا بقيَّة بن الوليد، عن أرطأة بن المنذر، عن بشير، عن مُجاهد، عن ابن عُمر، أن النبي ﷺ قال : إنَّ اللهَ أوَّل شيءٍ أخذَ القلمَ بيمينِهِ، وكِلتا يديهِ يمينٌ، فكتبَ الدُّنيا بما فيها مِن عملٍ مَعمولٍ بَرٍّ أو فاجِرٍ، رَطبٍ أو يَابسٍ ، وأحصَاهُ في الذِّكرِ .

ثُم قال : اقرؤوا إن شئتم : ﴿**هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ**﴾ [**الجَاثيَة : ٢٩**] فهل تكونُ النُّسخة إلَّا مِن شيءٍ قد فُرِغَ مِنه؟ .

**٢١١** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله یەکەمین شت قەڵەمی گرت بە دەستی ڕاستییەوە، هەردوو دەستی ڕاستن، دونیای نووسی بەوەی تێیدایە لە کارێکی کردەوە پێکراوی باش یان خراپ، تەڕ یان وشک، وە هەژمارکراون لە لوح ی محفوظدا) .

---

: واتە هەرچی لە دونیادایە، وە هەر کردەوەیەکیش کە دەکرێت جا باش بێت یان خراپ، گشتی نوسراوە لە لایەن الله تعالی وە .

پاشان فەرمووی : ئەگەر ویستتان ئەم ئایەتە بخوێننەوە : ﴿هَٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ [الجاثِية : ٢٩] .

واتە : ئەمە ئیتر نامەی کردەوەکانتانە کە تۆمارمان کردووە لەسەرتان، خۆی گوایە قسە دەکات و حەق بێژە چونکە بەڕاستی ئێمە کاتی خۆی ئەوەی ئێوە دەتان کرد لەبەرمان دەگرتەوە .

ئایا نوسخەکردن لە چ شتێکە ئیللا شتێک کە تەواوبووە؟

---

: حەدیسەکە صحیحە .

**٢١٢** - حدثنا إسحاق، قال : ثنا بقيَّة بن الوليد، عن محمد بن الوليد الزُّبيدي، عن راشد بن سَعْد، عن عبد الرحمن بن أبي قتادة البصري، عن أبيه، عن حكيم بن حِزام، أن رجلًا قال : يا رسول الله، أنبتدئُ الأعمال، أم قُضي القضاء؟

فقال رسول الله ﷺ : إنَّ اللهَ أخذَ ذُرِّيةَ آدمَ مِن ظهرِهِ، ثُم أفاضَ بِهم في كَفيهِ، ثُم أشهدَهُم على أنفُسِهِم، ثُم قال : هؤلاءِ في الجنَّةِ، وهؤلاءِ في النَّارِ، فأهل الجَنَّةِ مُيَسَّرونَ لعملِ أهل الجنَّةِ، وأهلُ النَّارِ مُيَسَّرون لعمَلِ أهل النَّارِ .

**٢١٢** - له حكيم بن حزام ەوە، پیاوێک ووتی : ئەی رسول الله ئایا ئێمە کارەکان دەست پێدەکەین، یاخود بڕیارەکە تەواوبووە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (الله پەیمانی لە نەوەکانی ئادەم وەرگرت کاتێک لەپشتی باوکیاندا بوون - واتە لەپشتی ئادەمدا - ، پاشان خستیە سەر دەستی خۆی، پاشان کردنی بە شایەت بەسەرخۆیانەوە، پاشان فەرمووی : ئەمانە لەبەهەشتن، وە ئەمانەش لە ئاگرن، ئەهلی بەهەشت ئاسانکاریان بۆ دەکرێ بۆ کار و کردەوەی بەهەشت، وە ئەهلی جەهەننەمیش ئاسانکارییان بۆ دەکرێ بۆ کار و کردەوەی ئەهلی جەهەننەم) .

**٢١٣** - حدثنا يحيى بن عثمان، قال : ثنا محمد بن حِمْيَر، قال : حدثني يزيد بن يوسف، عن أبي عبد الرحمن الأنصاري، عن عَمرو بن دينار، عن عبد الرحمن بن سابطٍ، عن ابن عباس، عن رسول الله ﷺ أنَّه قال : لعلَّكَ أن تَبقى بعدِي حتَّى تُدرِكَ قومًا يُكذِّبونَ بقدَرِ الله، ويحملون الذُّنوب على عبادِهِ، واشتَقُّوا كلامهم مِن النَّصارى، فإذا كان ذلك، فابرأ إلى الله منهم .

فكان ابن عباسٍ يرفعُ يديه فيقول : اللهم إني أبرأُ إليكَ منهم، كما أمرني رسول الله ﷺ.

**٢١٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ڕەنگە تۆ لەدوای منەوە بمێنیت و قەومانێک ببینیت کە قەدەری الله بەدرۆ دەخەنەوە، وە تاوانەکان دەخەنە ئەستۆی بەندەکانی، قسەکانیان لە نصاری ەوە وەرگرتووە، ئەگەر وابوو، ئەوکات خۆتان دووربخەنەوە لێیان بە الله) .

ابن عباس یش دەستی بەرزدەکردەوە دەیووت : ئەی پەروەردگارم من خۆم لێیان دووردەخەمەوە بەتۆ .

هەروەکو چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردم .

---

حەدیسەکە ضعیفە، بەڵام بەڕائەتکردنی قەدەریەکان جێگیر کراوە لەلایەن ابن عمر رضي الله عنهما، کە **مسلم** لە (**صحيحه** - ١) ڕیوایەتی کردووە لە ابن عمر رضي الله عنهما دەڵێت : ئەگەر گەیشتی بەوان (واتە قەدەریەکان) پێیان ڕابگەیەنە کە من لێیان بەریم، وە ئەوانیش لەمن بەرین، لە ئەثەری **٢٥٤** یش باسکراوە .

**٢١٤** - حدثنا هِشام بن عمار، قال : حدثنا سويد بن عبد العزيز، قال : ثنا قُرَّة بن عبد الرحمن بن حيويل، عن أبي قَبيل حُيَيّ ابن هانئ المَعَافِري، عن شُفي بن ماتع الأَصبَحِي، عن عبد الله بن عمرو بن العاص، قال : دخلت على رسول الله ﷺ وفي يدهِ

كتابٌ، فقال : هذا كتابٌ كتبَهُ ربُّ العالمين بِعدَدِ أهلِ الجنَّةِ، فيهِ أسماؤهم وأسماءُ آبائِهم، ثُمَّ أُجملَ على آخِرِهم، لا يُزادُ فِيهم ولا يُنتقصُ، وبِعَدَدِ أهلِ النَّارِ، فيهِ أسماؤهم، وأسماءُ آبائِهم، ثُمَّ أُجمِلَ على آخرِهم، لا يُزادُ فيهم، ولا يُنتقصُ .

فقال رجلٌ : فقيمَ العملُ يا رسول الله؟

فقال : اعمَلوا وسَدِّدوا، فإنَّ صاحِبَ الجنَّةِ خاتِمٌ بعملِ أهل الجنَّةِ، وإن عَمِلَ أيَّ عَمَلٍ، وإن صاحِبَ النَّارِ خاتمٌ بعملِ أهلِ النَّارِ، وإن عمل أيَّ عَمَل .

ثُم قال : ﴿**فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ**﴾ [الشّورىٰ : ٧] .

**٢١٤** - عبد الله بن عمرو بن العاص ووتى : چوومە لای پێغەمبەر ﷺ کتێبێکی بەدەستەوە بوو، فەرمووی : (ئەو کتێبە الله تعالى نوسیویەتی بەژمارەی أهلی بەهەشت، کە لەناویدا ناوەکانیان و ناوی باوکیان تێدایە، پاشان کۆکراونەتەوە تاوەکو کۆتایی، هیچ شتێکی تێدا زیاد ناکرێت، وە کەمیش ناکرێت، وە بەژمارەی أهلی ئاگر، کە تێیدا ناوەکانیان و ناوی باوکیان تێدایە، پاشان کۆکراونەتەوە تاوەکو کۆتایی، هیچ شتێکی تێدا زیاد ناکرێت، وە کەمیش ناکرێت) .

پیاوێک ووتی : ئەی چ کارێکمان لەسەرە ئەی پێغەمبەری الله ﷺ؟

فەرمووی : (کاربکەن و جێگیر بن، چونکە بەڕاستی خاوەنی بەهەشت کۆتایی دێت بەکردەوەی ئەهلی بەهەشت، جا گەر هەر کردەوەیەکی کردبێ، وە خاوەنی ئاگر و دۆزەخ کۆتایی دێت بەکردەوەی ئەهلی ئاگر و دۆزەخ، جا گەر هەر

کردەوەیەکی کردبێ، پاشان فەرمووی : ﴿فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾ [الشورى : ٧] .

واتە : کۆمەڵەیەکیان بۆ بەهەشت بەڕێ دەکرێن و دەچنە ناو بەهەشتەوە، کۆمەڵەکەی تریان بۆ ناو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن .

---

: **رواه أحمد (٦٥٦٣)**، مەبەستی گشتی ئەم ئەثەرە ئەوەیە : کە شتەکان تەواو بڕاونەتەوە بەهەموو کارو کردەوەیەک، تەنانەت ئاخیرەتی هەر کەسێک کە دەچێتە بەهەشت یان دۆزەخ، جا هیچ شتێک زیاد و کەم ناکات، وە لەسەرمانە کاربکەین و جێگیر بین نەک بڵێی مادام هەموو شت نوسرایە و بڕاوەتەوە هیچ کارێک ناکەم، چونکە هەموو کەسێک بۆ ئەوە کار دەکات کە بۆی درووستکراوە، والله تعالى اعلم .

**٢١٥** - حدثنا عُثمان بن سلام الأهوازي، قال : حدثنا صفوان بن عيسى، عن عزرة بن ثابت، عن يحيى بن عُقيل، عن يحيى ابن يَعمر، عن أبي الأسود الدِّيلي، قال : غدوتُ على عمران ابن حُصين يومًا من الأيام فقال لي عمران : يا أبا الأسود، أرأيت ما يعمل النَّاس اليوم، ويكدحون فيهِ، شيء قُضي عليهم، ومضى عليهم في قدرٍ قد سبقَ؟ أو شيء فيما يستقبلون مما أتاهم به نبيهم ﷺ، واتُّخِذَت به عليهم الحُجَّة؟

قال : قلتُ : بل شيء قُضي عليهم .

قال : فقال عمران : فهل يكون ذلك ظُلمًا؟

قال: فَفزِعتُ مِن ذلك فَزَعًا شديدًا، ثُم قلتُ: إنَّه ليس شيء إلَّا خلْقُ الله، ومُلك يده، ﴿**لَا يُسْئَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْئَلُونَ**﴾ [**الأنبياء: ٢٣**].

قال: فقال عمران: سدَّدك الله، والله ما سألتُك إلَّا لأُحرِزَ عقلك، إن رجلًا مِن مُزينة، أو جُهينة، أتى رسول الله ﷺ، فقال: يا رسول الله، أرأيت ما يعمل النَّاس اليوم ويكحدون فيه، أشيءٌ قُضِيَ عليهم، ومضى عليهم في قدرٍ قد سبقَ؟ أو فيمَ يستقبِلون مما أتاهم به نبيهم، واتخذت به الحُجَّة عليهم؟

قال: بل شيءٌ قُضِيَ عليهم، ومَضى عليهم.

قالوا: يا رسول الله، فلم يعملون إذًا؟

فقال رسول الله ﷺ: من كان اللهُ خلقَهُ لِوَاحِدةٍ مِن المنزِلتينِ يهيئه الله لِعَملِها، وتصدِيقُ ذلك في كتابِ الله ﴿**وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا**﴾ [**الشّمس: ٧، ٨**].

**٢١٥** - أبي الأسود الديلي ووتی: ڕۆژێ لەڕۆژان بەیانییەکی زوو چوومە لای عمران بن حصين، عمران پێی ووتم: ئەی أبو الأسود ئایا ئەو کاروکردەوەی ئەمڕۆ خەڵکی دەیکەن و ڕەنج دەدەن تێیدا، شتێکە کەوا بڕیاردراوە لەسەریان و تێپەڕیوە لەسەریان لەقەدەرێک کە لە پێشتردا بووە؟ یان شتێکە کە لە داهاتوودا بۆیان پێش دێت لەوەی کە پێغەمبەرەکەیان ﷺ بۆی هێناون، وە پێی دەبێتە حوججە و بەڵگە لەسەریان؟

ووتی: ووتم: بەڵکو شتێکە بڕیاردراوە لەسەریان.

ووتی: عمران ووتی: ئایا ئەمە دەبێتە ستەم؟

ووتی : ترس دایگرتم لەوە ترسێکی زۆر سەخت، پاشان ووتم : بەڕاستی هیچ شتێک نییە ئیللا درووستکراوی الله یە، وە موڵکی دەستی ئەوە ﴿**لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ**﴾ [**الأنبيَاء : ٢٣**] .

پاشان عمران ووتی : الله ڕاستەڕێت بکات، والله ی پرسیارم لێ نەکردیت ئیللا بۆئەوەی عەقڵت مەزەندە بکەم، بەڕاستی پیاوێک لە مزينة یان جهينة هات بۆلای رسول الله ﷺ و ووتی :

ئایا ئەو کاروکردەوەی ئەمڕۆ خەڵکی دەیکەن و ڕەنج دەدەن تێیدا، ئایا شتێکە کەوا بڕیاردراوە لەسەریان و تێپەڕیوە لەسەریان لەقەدەرێک کە لە پێشتردا بووە؟ یان لەوەیە کە لە داهاتوودا بۆیان پێش دێت لەوەی کە پێغەمبەرەکەیان بۆی هێناون، وە بەهۆیەوە حوجحە و بەڵگە لەسەریان چەسپاوە؟

فەرمووی : (بەڵکو شتێکە بڕیاردراوە لەسەریان، وە بەسەریاندا تێپەڕیوە) .

ووتیان : ئەی رسول الله کەواتە بۆچی کاردەکەن؟

پاشان رسول الله ﷺ فەرمووی : هەر کەسێک الله درووستی کردبێ بۆ یەکێک لە دوو مەنزڵگاکە ئەوا ئامادەی دەکات بۆ کارکردن بۆی، وە بەڕاستدانانی ئەوەش لە کتابی الله دایە : ﴿**وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا**﴾ [**الشَّمْس : ٧، ٨**] .

---

: **رواه أحمد (١٩٩٣٦)، و مسلم (٦٨٣٢)** .

**٢١٦** - حدثنا المُسيّب بن واضح، قال: ثنا يوسف بن أسباط، عن بحر السَّقاء، عن أبي حازم، عن أبي هريرة، قال: قال رسول الله ﷺ: ما كانت زندقةٌ قَطّ إلَّا كان أصلُها التَّكذيبَ بالقدَرِ.

**٢١٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (هەرگیز هیچ زەندیقییەتێک نەبووە ئیللا بنچینەکەی بریتیی بووە لە بەدرۆخستنەوەی قەدەر).

---

: حەدیسەکە ضعیفە.

**٢١٧** - حدثنا أبو الفضل عباس بن الوليد، قال: حدثنا مروان بن محمد، قال: حدثنا سُليمان بن عُتبة السُّلمي، قال: حدثنا يُونس بن ميسرة بن حَلْبس، عن أبي إدريس الخولاني، عن أبي الدَّرداء، أنهم قالوا: يا رسول الله، أرأيت ما نعمل، أفي شيءٍ قد فُرِغَ منه؟ أم شيء نستأنفه؟

فقال رسول الله ﷺ: في شيءٍ قد فُرِغَ مِنهُ.

قالوا: فكيف بالعمل بعد القضاء؟

فقال رسول الله ﷺ: كُلُّ امرىءٍ مُيسَّرٌ لِمَا خُلِقَ له.

**٢١٧** - ابو درداء دەگێڕێتەوە وتویانە، ئەی رسول الله ئایا ئەم کارو کردەوانەی دەیکەین، ئایا لەشتێکدایە کە تەواوبووە یان لەشتێکدایە کە ئێمە سەرەتا

دەستی پێدەکەین؟ - والله أعلم واتە ئایا کاروکردەوەکانمان پێشتر بڕیاری لەسەردراوە و تەواوبووە و کۆتایی هاتووە؟ یاخود کە ئێمە ئەیکەین دەست پێدەکات؟ - .

رسول الله ﷺ فەرمووی: (لە شتێکە کە تەواوبووە).

ئەی کارکردن لەدوای قەزا و بڕیاری الله؟

رسول الله ش ﷺ فەرمووی: (هەرکەسێک بەرەو ئەوە دەڕوات کە بۆی درووستکراوە).

---

: **رواه أحمد (٢٧٤٨٧)**، حەدیسەکە صحیحە.

**٢١٨** - حدثنا أبو الربيع الزهراني، قال: ثنا عبد الله بن يزيد المقرئ، قال: ثنا عبد الله بن لهيعة بن عُقبة، قال: حدثني عمرو بن شعيب، قال: كنت عند سعيد بن المسيّب إذ جاءه رجل، فقال: إن ناسًا يقولون: قدَّرَ الله كُلَّ شيءٍ ما خلا الأعمال.

فغَضِبَ سعيدٌ غضبًا لم أره غضبَ مثله قطُّ، حتى همَّ بالقيامِ، ثم قال: فعلوها! فعلوها! ويحهم لِمَ يعملون؟! أما أنِّي قد سمعت فيهم بحديثٍ كفاهم به شرًّا.

فقلتُ: وما ذاك يا أبا محمد رحمك الله؟

فقال: حدثني رافع بن خَديج، عن النبي ﷺ قال: سيكونُ في أمتي قومٌ يُكذِّبون بالله وبالقرآنِ، وهم لا يشعرون.

قال : فقلت : يقولون كيف يا رسول الله؟

قال : يُقِرُّون ببعضِ القدرِ، ويكفُرون ببعضٍ .

قال : قلتُ : يقولون ماذا يا رسول الله؟

قال : يقولون الخيرُ مِن الله، والشَّرُّ مِن إبليس، ثم يقرَؤون على ذلك كتاب الله، فيكفرون بالله وبالقرآن بعد الإيمان والمعرفة، فماذا تلقى أُمَّتي منهم مِن العداوةِ والبغضاءِ، ثُم يكون المسخُ، فيُمسَخُ عامَّةُ أولئك قِردةً وخنازِيرَ، ثُم يكونُ الخسفُ، فقلَّ من ينجُو مِنهم، المؤمنُ يومئذٍ قليلٌ فرَحُهُ، شديدٌ غمُّهُ .

ثُم بكي النبي ﷺ حتَّى بكينا لبُكائِهِ .

فقيل : يا رسول الله، ما هذا البُكاء؟!

قال : رحمةً لهُم الأشقياء، لأنَّ منهم المُجتهِدَ، ومِنهُم المُتَعبِّدَ، أما إنَّهم ليسوا بأوَّلِ مَن سبقَ إلى هذا القولِ، وضاقَ بحملِهِ ذرْعًا، إن عامَّةَ مَن هلكَ مِن بني إسرائيل بالتَّكذِيبِ بالقدرِ .

فقيل : يا رسول الله، فما الإيمانُ بالقدرِ؟

قال : أن تُؤمنَ بالله وحدَهُ، وتؤمنَ بالجنَّةِ والنَّارِ، وتعلمَ أنَّ اللهَ تبارك وتعالى خلقهما قبلَ الخلقِ، ثُم خلقَ الخلقَ لهما، فجعلَ مَن شاءَ مِنهُم للجنَّةِ، ومن شاءَ مِنهُم للنَّارِ، عدلًا منهُ، فكُلٌّ يعملُ لِما فُرِغَ منهُ، وصائرٌ إلى ما خُلِقَ له .

فقلت : صدقَ اللهُ ورسولُهُ .

**٢١٨** - عمرو بن شعيب دەگێڕێتەوە، لە لای سعيد بن مسيب بووم پياوێک هاتە لای، ووتی : کەسانێک دەڵێن : الله قەدەری هەموو شتێکی داناوە ئیللا کاروکردەوەکان نەبێ .

سعيديش تووڕەبوونێک تووڕەبوو کە هەرگيز پێشتر نەمبينيوە بەو جۆرە تووڕەببێت، هەتا وەکو هەڵسا، پاشان ووتی : کردیان! کردیان! واوەيلا بۆيان بۆچی کاردەکەن؟! من شتێکم بيست تێياندا کە بەسە بۆ خراپييان .

ووتم : چی بووە ئەی باوکی محمد رەحمەتی الله ت لێبێت؟

پاشان ووتی : رافع بن خديج بۆی گێڕامەوە، لە رسول الله ەوە ﷺ فەرمووی : (لە ئوممەتەکەمدا قەومانێک دێن الله و قورئان بەدرۆدەخەنەوە و هەستيشی پێ ناکەن) .

ووتی : ووتم : چۆن دەڵێن ئەی رسول الله؟

فەرمووی : (دانئەنێن بە بەشێکی قەدەر و کافر دەبن بەبەشی تر) .

ووتی : ووتم : دەڵێن چی ئەی رسول الله ﷺ؟

فەرمووی : (دەڵێن خێر لە الله ەوەيە و خراپەش لە إبليس، پاشان لەسەرئەوە کتابی الله دەخوێننەوە، پاشان کافر دەبن بە الله و قورئان لەدوای ئيمان و ناسين، وە چ دووژمنايەتی و ڕکابەرايەتييەک بەئوممەتەکەم دەگات لێيانەوە، پاشان گۆڕانی شێوەيان ڕوودەدات بۆشێوەيەکی ناشرين، تێکڕای ئەوانە لە سەر شێوەی مەيمون و بەراز دەگۆڕدرێن، پاشان خەسف و ڕۆچوونی زەوی دەبێت، کەمێکن

لەوانەی ڕزگاریان دەبێ لێیان، بڕوادار لەو ڕۆژەدا دڵخۆشییەکەی کەمە، خەفەتەکەی قورسە) .

پاشان رسول الله گریا گریانێکی توند، هەتا ئێمەش گریاین بۆ گریانی ئەو .

ووترا : ئەی رسول الله، ئەم گریانە چییە؟!

فەرمووی : (وەک بەزەیی و ڕەحمەتێک بۆیان بەدبەخت و چارە ڕەش، لەبەر ئەوەی تێیاندایە کۆششکارە، تێیاندایە خوا پەرستە، ئەمما ئەوان یەکەم کەس نین پێشکەوتبن بۆ ئەو قسەیە، وە بەهەڵگرتنی تەنگەتاوبووبن - واتە نەفسییەن زۆر نارەحەتی کردبن و دەروونیان زۆر پێی تەنگ بووبێت - ، بەڕاستی تێکڕای بنی اسرائیل تیاچوون بە بەدرۆخستنەوەی قەدەر) .

ووتیان ئەی رسول الله، ئەی باوەڕبوون بە قەدەر چییە؟

فەرمووی : (ئەوەیە کە بەتاک و تەنها باوەڕ بهێنیت بە الله، وە باوەڕ بهێنیت بە بەهەشت و دۆزەخ، وە بزانیت الله تعالی درووستی کردوون پێش درووستکردنی درووستکراوەکان، پاشان درووستکراوەکانی درووستکرد بۆیان، پاشان هەریەکێک لەوان ویستی لێ هەبووبێ کردیانی بۆ بەهەشت، وە هەر کەسێکیش ویستی هەبووبێ بۆ جەهەننەم، بە عەدالەت و دادپەروەریی لێیەوە، بۆیە هەر کەسێک کاردەکات بۆ ئەوەی کە تەواوبووە و کۆتایی هاتووە، وە دەڕوات بەرەو ئەوەی بۆی درووستکراوە) .

---

: حەدیسەکە موضوع ە .

**٢١٩** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، قال: حدثنا بقيَّة بن الوليد، عن حبيب بن عمر الأنصاري، عن أبيه، عن ابن عُمر، عن عُمر، عن رسول الله ﷺ أنَّه قال: يُنَادِي مُنادٍ يومَ القِيامَةِ: ليَقُم خُصَمَاءُ الله، وهُم القدريَّة.

**٢١٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەت بانگکەرێک بانگ دەکات: با دوژمنانی اللە هەستنە سەر پێ، کە قەدەرییەکانن).

---

: حەدیسەکە منکرە.

**٢٢٠** - حدثنا زيد بن يزيد، قال: حدثنا عبد الملك بن عمرو، قال: حدثنا سُليمان بن سُفيان، عن عبد الله بن دينار، عن عبد الله ابن عمر، عن عمر بن الخطاب قال: لما نزلت: ﴿**فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ**﴾ [**هُود**: ١٠٥] سألتُ النبي ﷺ فقلتُ: يا رسول الله، فعلى ما نعمل! أعلى أمرٍ قد فُرِغَ منه؟ أم شيءٌ لم يُفرغ مِنهُ؟

قال: بل على شيءٍ قد فُرِغَ مِنهُ، وجَرَتْ بِهِ الأقلامُ يَا عُمر، ولكن كُلٌّ مُيسَّرٌ لِمَا خُلِقَ.

**٢٢٠** - عمر بن الخطاب دەگێڕێتەوە: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿**فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ**﴾ [**هُود**: ١٠٥]، پرسیارم کرد لە رسول الله ﷺ ووتم: ئەی رسول الله ئێمە لەسەر چی کار دەکەین؟ ئایا لەسەر شتێک کە تەواو بووە؟ یان شتێک تەواو نەبووە و کۆتایی نەهاتووە؟

فەرمووی : (بەڵكو لەسەر شتێك كە تەواو بووە، وە قەڵەمەكان پێی ڕۆیشتوون - قەڵەمەكان واتە ئەو قەڵەمەی یەكەمجار الله تعالى درووستی كرد و پێی فەرموو بنووسە - ئەی عمر هەموو كەسێك بەرەو ئەوە ئاسانكاریی بۆ دەكرێ كە بۆی درووستكراوە - واتە هەموو ئەو هۆكارانەی بۆ ئاسان دەكرێ كە دەیبات بەرەو ئەوە - ) .

---

: **رواه الترمذي (٣١١١)**، حديث حسن غريب .

**٢٢١** - حدثنا محمد بن مُصَفَّى، قال : حدثنا بقيَّة، قال : حدثنا ابن أبي جميلة، عن نافع، عن ابن عُمر، عن النبي ﷺ قال : إنَّ اللّهَ لو شاءَ أن لا يُعصَى ما خلقَ إبليسَ.

**٢٢١** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەگەر الله ویستی هەبووایە كەوا سەرپێچیی نەكرێت ئەوا إبليس ی درووست نەدەكرد) .

---

: حەدیسەكە ضعیفە، ئەو فەرموودەیانەی لەم كتێبەدا هاتووە و ضعیفـ ە، هۆكاری لاوزیەكەی ئەوەیە كە جێگیر بووە كە وتەی رسول الله ﷺ نییە، بەڵكو وتەی هاوەڵێك یان تابیعیەكە دراوەتە پاڵ رساول الله ﷺ، بۆ نمونە ئەو وتەیەی سەرەوە وتەی عمر بن عبدالعزیز ە .

**٢٢٢** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، قال : حدثنا بقيَّة، عن سعيد بن جميل، عن ثابت البُناني، قال : سمعت ابن عُمر يقول : سمعت رسول الله ﷺ يقول : يكونون

مُكذِّبينَ زنديقين، ألا وهُم مجوسُ هذه الأُمّة، مَا هلكت أُمَّة قطّ إلَّا بشركها، ولا كان بدءُ شِركها بعد إيمانِها إلَّا بتكذِيبٍ بالقدرِ .

**٢٢٢** - له ثابت البناني يەوه دەگێڕێتەوه، گوێم له ابن عمر بوو دەیووت : گوێم له رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو : (بەدرۆخەرەوەی زەندیق پەیادەبن، ئەوان مەجوسی ئەم ئوممەتەن، هیچ ئوممەتێک بەهیلاک نەچووە ئیللا بەهۆی شیرکی ئەوانەوە نەبێ، وە سەرەتای دەست پێکردنی شیرکیان لەدوای ئیمانەوە بەهۆی هیچ شتێکەوە نەبوو ئیللا بەهۆی بەدرۆخستنەوەیان بۆ قەدەر) .

---

: واته سەرەتای دەست پێکردنی شیرکەکەیان بەهۆی بەدرۆخستنەوەی قەدەر بوو، والله اعلم، حەدیسەکە ضعیفه .

**٢٢٣** - حدثنا ابن مُصفَّى، قال : حدثنا أبو المُغيرة، قال : ثنا أبو يحيى اليماني الحبشي، قال : سمعت طاووسًا يُحدِّث عن ابن عباس، قال : قال رسول الله ﷺ : لكُلِّ أُمَّةٍ مجوسٌ، وإن مجوسَ أُمَّتي لأقوامٌ يُكذِّبُون بمقادِيرِ الله، وإنَّ أدنَى تكذيبٍ بالقدرِ كمثلِ مَن أشركَ بالله بعدَ الإيمانِ .

**٢٢٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەموو ئوممەتێک مەجووسی هەیە، وە بەڕاستی مەجوسەکانی ئەم ئوممەتە قەومانێکن کە قەدەرەکانی الله

بەدرۆدەخەنەوە، وە كەمترین و نزمترینی بەدرۆخستنەوەی قەدەر وەک نمونەی ئەو کەسەیە کە شرک بڕیاردەدا بۆ الله لەپاش ئیمان) .

**٢٢٤** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، قال : ثنا بقيَّة، عن عُمر بن محمد، عن زيد بن أسلم، عن أبيه، عن أبي هريرة، عن رسول الله ﷺ لما نزلت : ﴿**لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ**﴾ [**التّكوير** : ٢٨] .

قالوا : الأمر إلينا، إن شِئنا استقمنا، وإن شِئنا لم نَستقم .

فأهبط الله عليه جبريل يقول : كذبوا يا محمد، ﴿**وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ**﴾ [**التَّكوِير**: ٢٩] .

فَفَرَّجَ ذلك عن رسول الله ﷺ .

**٢٢٤** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿**لِمَن شَاءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ**﴾ [**التَّكْوير** : ٢٨] وتیان : کارەکە لەدەستی ئێمەدایە، ئەگەر ویستمان استقامەمان دەبێ، ئەگەر نەمان ویست استقامەمان نابێ .

الله ﷻ جبریلی دابەزاندە سەری ووتی : درۆیان کرد ئەی محمد ﷺ ﴿**وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِين**﴾ [**التَّكْوير** : ٢٩] .

پێغەمبەر ﷺ بەمە دڵتەنگی لەسەر لاچوو .

: ئیسنادەکەی ضعیفه .

**٢٢٥** - حدثنا الحُميدي، قال : حدثنا سُفيان، قال : ثنا أبو الزِّناد، عن الأعرج، عن أبي هريرة، قال : قال رسول الله ﷺ : احتَجَّ آدمُ ومُوسى، فقال موسى : يا آدمُ، أنتَ أبونا خَيبتنا، وأخرجتنا من الجنَّةِ!

فقال آدمُ : يا مُوسَى، اصطفاكَ اللهُ بكلامِهِ، وخَطَّ لكَ في الألواحِ بيدِهِ، أتلُومُني على أمرٍ قَدَّرَهُ اللهُ عليَّ قبلَ أن يخلُقَني بأَربعِينَ عامًا؟ .

قال رسولُ الله ﷺ : فحَجَّ آدمُ مُوسَى، فحَجَّ آدمُ مُوسَى .

**٢٢٥** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئادەم و موسی بووه مووناقەشه لەنێوانیان، موسی ووتی : ئەی آدم تۆ باوکمانی نائومێدت کردین و دەرتکردین له بەهەشت!

آدم یش ووتی : ئەی موسی الله تۆی هەڵبژارد به قسەکردن لەگەڵ خۆی، وه بەدەستی خۆی له ألواح بۆی کێشای - واته لەو الواح ەی پێی بەخشی و حوکمی هەموو شتێکی بۆ نووسی، هەموو ئەو شتانەی کە پێویستی بوو له بەرنامه و شەریعەتەکەی تاوەکو ببێته پەند و ئامۆژگاری بۆ قەومەکەی - ، ئایا لۆمەم دەکەی لەشتێک کە الله بەقەدەر لەسەرمی نووسیوه به چل ساڵ پێش درووستبوونم؟!) .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (آدم زاڵ بوو بەسەر موسی، آدم زاڵ بوو بەسەر موسی - واته بەڵگەی ئادەم بەهێزتر بوو - ) .

: **رواه البخاري (٣٤٠٩)، ومسلم (٦٨٣٥)** .

**٢٢٦** - حدثنا هشام بن عمار، قال: حدثنا سُليمان بن عُتبة، قال: سمعت يونس بن مَيسرة بن حَلبس، يُحدِّثُ عن أبي إدريس الخولاني، عن أبي الدَّرداء، عن النبي ﷺ قال: لا يَبلغُ العَبدُ حَقيقةَ الإيمانِ حَتَّى يَعلَمَ أنَّ ما أصابَهُ لم يَكُن لِيُخطِئهُ، وأن ما أخطأهُ لم يَكُن لِيُصِيبَهُ، ولا يَدخُل الجنَّةَ عاقٌّ، ولا مُدمِنُ خمرٍ، ولا مُكذِّبٌ بقدر .

**٢٢٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەندە ناگات بە حەقیقەت و ڕاستی ئیمان هەتاوەکو دەزانێت کەوا ئەوەی تووشی بووە لێی لانەدەدا، وە ئەوەشی لێی لاداوە و تووشی نەبووە هەرگیز تووشی نەدەبوو، وە ناچێتە بەهەشتەوە کەسێک ئازاری دایک و باوکی بدات، وە ئاڵوودەی عەڕەق و سەرخۆشکەرەکان بێت، وە کەسێک قەدەر بەدرۆبخاتەوە) .

---

: **رواه أحمد (٢٧٤٨٤)**، وە **الفريابي لە کتێبی (القدر ـ ٢٠٠، ٢٠١)** باسی کردووە .

**٢٢٧** - حدثنا محمود، قال: حدثنا مروان بن محمد، قال: ثنا رباح ابن الوليد، قال: حدثني إبراهيم بن أبي عَبلَةَ، عن أبي يزيد الأزدي، عن عُبادة بن الصَّامت، قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: أولُ ما خلقَ اللّهُ القلمَ، فقال له: اكتُب . فقال: يا ربِّ، وما أكتُبُ؟ قال: اكتُب مقادِيرَ كُلِّ شيءٍ .

**٢٢٧** - عبادة بن صامت ووتى گوێم لە رسول الله بوو ﷺ دەیفەرموو : (یەکەم شت کە الله درووستیکرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو : بنووسە، ووتی : ئەی پەروەردگارم چی بنووسم؟ فەرمووی : قەدەر و ئەندازەی هەموو شتەکان بنووسە) .

---

: **رواه أبو داود (٤٧٠٢)، والترمذي (٢١٥٥ و ٣٣١٩)** بە ڕێگەی تر باسیان کردووە، وە حەدیسەکە صحیحە .

**٢٢٨** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، قال : حدثنا بقيَّة بن الوليد، عن الأوزاعي، عن ابن جُريج، عن أَبي الزُّبير، عن جابر، قال : قال رسول الله ﷺ : إنَّ مجوسَ هذه الأُمَّة قَوم يُكذبون بأقدارِ الله، إن مَرِضوا فلا تَعودوهم، وإن لقيتُموهم فلا تُسلَمُوا عليهم، وإن مَاتُوا فلا تَشهدوهم .

**٢٢٨** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (مەجووسی ئەم ئوممەتە قەومانێکن کە قەدەرەکانی الله بەدرۆدەخەنەوە، ئەگەر نەخۆش کەوتن بەسەریان مەکەنەوە، وە ئەگەر پێیان گەیشتن سەلامیان لێ مەکەن، وە ئەگەر مردن شوێن جەنازەکانیان مەکەون) .

---

: ئینسادەکەی بە منقطع هاتووە .

**٢٢٩** - حدثنا سعيد بن عون، قال: ثنا جعفر بن سُليمان، عن مرزوق أبي بكر، عن أبي الزُّبير، عن جابر، قال: سألَ سُراقة بن جُعشُم، رسول الله ﷺ، قال: يا رسول الله ﷺ، أنعمل فيما جرت به الأقلام، وجفَّت به الكُتب؟ أم نعمل فيما نستأنِفُ؟

قال: تعملون فِيما جَرَت بِهِ الأقلامُ، وجَفَّت بِهِ الكُتُب.

قال: ففيم يعملُ العامِلون يا رسول الله ﷺ؟

قال: كُلٌّ مُيسَر للذي خُلِقَ لَهُ.

**٢٢٩** - سراقة بن جعشم پرسیاری کرد له رسول الله ﷺ ووتی: ئەی رسول الله ئایا ئێمە کار دەکەین لەشتێکدا کە قەڵەمەکان پێی ڕۆیشتوون، وە کتێبەکان پێی وشکبوونەتەوە؟ یاخود کاردەکەین بەوەی کە ئێمە دەستی پێدەکەین؟

فەرمووی: (کاردەکەن لەوەی کە قەڵەمەکان پێی ڕۆیشتوون، وە کتێبەکان - والله أعلم واته لوح المحفوظ - پێی وشکبوونەتەوە).

ووتی: ئەی کارکەرەکان لەچیدا کاردەکەن؟

فەرمووی: (هەموو کەسێک ئاسانکاریی بۆ دەکرێ بۆ ئەوەی بۆی دروستکراوە).

: واته هەموو كەسێك ئەو هۆكارانەی بۆ ئاسان دەكرێت كەبەرەو ئەو قەدەری دەبات كە بۆی دروستكراوە، جا بەهەشت بێت یان جەهەننەم، **رواه مسلم** (٦٨٢٨) .

**٢٣٠** - حدثنا أبو معن، قال : حدثنا أبو إسحاق، قال : حدثنا الأزرق بن يحيى، قال : ثنا عُبيد الله بن زياد، عن أبان، عن أنس بن مالك، أن رسول الله ﷺ قال : القدريُّ : أَوَّلُهُ مَجوسِيّ، وآخِرُهُ زِندِيق .

**٢٣٠** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (قەدەریی سەرەتاكەی مەجووسی یە، كۆتاییەكەی زەندیق ە) .

---

: حەدیسەكە صحیح نییە .

**٢٣١** - حدثنا محمد بن نافع، قال : ثنا الحَفَرِي، قال : حدثنا سفيان، عن عمر بن محمد، عن عمر مولى غُفرة، عن حُذيفة، عن رسول الله ﷺ : إنَّ قومًا يقولون : لا قَدَرَ، وهُم مَجوسُ هذهِ الأُمَّةِ، فلا تَشهدُوا لهُم جنازَةً، ولا تَعودُوا لهُم مَريضًا فإنَّهم شِيعة الدَّجَّال، وحَقّ على الله أن يُلحِقَهُم بالدَّجَّالِ .

**٢٣١** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی كۆمەڵێك دەڵێن : قەدەر نییە، ئەوان مەجووسی ئەم ئوممەتەن، شوێن هیچ جەنازەیەكیان مەكەون، وە هیچ

نەخۆشێکیشیان بەسەرمەکەنەوە، چونکە دۆستانی دەجال ن، وە حەق و مافە لەسەر اللە بیانلکێنێ بە دەجال ەوە) .

**٢٣٢** - حدثنا أبو معن، قال : حدثنا يزيد بن هارون، قال : حدثنا بشر بن نُمير، عن القاسم، عن أبي أُمامة، عن النبي عليه الصَّلاة و السَّلام قال : خَلقَ الله الخلقَ، وقضَى القضيَّةَ، وأخَذَ مِيثاقَ النَّبيينَ، وعرشُهُ على المَاءِ، فأهلُ الجَنَّةِ أهلُهَا، وأهلُ النَّارِ أهلُهَا .

قالوا : يا رسول الله ﷺ، ففيمَ العمل؟

قال : يعملُ كُلُّ قوم لِمنازِلِهِم .

**٢٣٢** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (اللە درووستکراوەکانی درووستکرد، وە مەسەلە و باسەکانی بڕاندەوە و کۆتایی پێهێنا، وە پەیمانی وەرگرت لە پێغەمبەران، وە عەرشەکەی لەسەر ئاوە، ئەهلی بەهەشت ئەهلی بەهەشتن، وە ئەهلی ئاگریش ئەهلی ئاگرن) .

ووتیان : ئەی رسول اللە ئەی لەسەرمانە لەچیدا کار بکەین؟

فەرمووی : (هەر کۆمەڵێک بۆ شوێن و مەنزڵگەیان کار دەکەن - واتە گەر شوێنی بەهەشت بێت ئەوا بۆ بەهەشت کار دەکات، وە گەر شوێنی دۆزەخ بێت ئەوا بۆ دۆزەخ کار دەکات - ) .

**٢٣٣** - حدثنا محمد بن أبي بكر، قال: حدثنا حسَّان بن إبراهيم، قال: ثنا سعيد بن مسروق، عن يوسف بن أبي بُردة، عن أبي بُردة، قال: أتيتُ عائشة، فقلتُ: يا أُمتاه، حدثيني بشيء سمعتيهِ مِن رسولِ الله ﷺ.

فقالت: قال رسول الله ﷺ: الطَّيرُ تَجرِي بقدَر.

وكان يُعجِبُهُ الفألُ الحسنُ.

**٢٣٣** - أبي بردة قوتى: چومە لاى عائشة رضي الله عنها، پێم قوت: ئەى دايكى ئيمانداران، شتێكم بۆ بگێڕەوە كە بيستوتە لە پێغەمبەر ﷺ؟

فەرمووى: پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: باڵندە بەقەدەر تێپەڕ دەبێت - واتە بۆى نوسراوە لە لايەن الله تعالى ەوە كە بڕوات و بفڕێت - .

ئەويش سەرسام بوو بەو قسە چاك و باشە.

---

: **رواه أحمد (٢٥٩٨٢)**، حەديسەكە صحيحة.

**٢٣٤** - حدثنا محمد بن الوزير، قال: ثنا مروان بن محمد، قال: حدثنا بقيَّة بن الوليد، قال: حدثنا حبيب بن عمر الأنصاري، عن أبيه، قال: سمعت واثلة بن الأسقع يقول: أمَّا أنا فلستُ أصلَي خلفَ قدريَ.

**٢٣٤** - حبيب بن عمر الأنصاري بۆی گێڕاینەوە لە باوکییەوە، ووتی : گوێم لە واثلة بن الأسقع بوو دەیووت : ئەمما من نوێژ ناکەم لە پشت قەدەریی .

**٢٣٥** - حدثنا الحُسين بن محمد السَّعدي، قال : ثنا ميمون بن زيد، قال : ثنا حرب بن سُريج، قال : قلت لأبي جعفر : إن لنا إمامًا قدريًّا؟

قال : أعد كُلَّ صلاة صليتَ خلفَهُ .

**٢٣٥** - حرب بن سريج بۆی گێڕاینەوە، ووتی : ووتم بە أبي جعفر : ئێمە ئیمامێکی قەدەریی مان هەیە؟

ووتی : هەر نوێژێک کردت لەدوایەوە دووبارەی بکەوە .

**٢٣٦** - حدثنا محمد بن الوزير الدَّمشقي، قال : حدثنا سلام بن سُليمان، قال : ثنا عُبيد الله بن أبي سُفيان، قال : سمعت ابن سيرين يقول : لا تأكلوا ذبائحَ القدريَّة .

**٢٣٦** - ابن سيرين دەیووت : سەر بڕاوی دەستی قەدەرییەکان مەخۆن .

**٢٣٧** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : ثنا عبد العزيز بن محمد، عن أبي سُهيل، قال : إذا سلَّمَ عليك القدريُّ، فقُل : وعليك .

**٢٣٧** - أبي سهيل ووتی : ئەگەر قەدەریی سەلامی لێ کردیت، تۆش بڵێ : وعلیک.

**٢٣٨** - حدثنا محمد بن عُمر بن علي، قال: حدثنا الحَسن بن حبيب، عن وائل بن زُريق، عن عبد العزيز بن عُمر، عن عُمر بن عبد العزيز قال: لا تَغزوا مع القدريَّة، فإنَّهم لا يُنصرون.

**٢٣٨** - عمر بن عبدالعزيز ووتی: غەزا و جیهاد مەکەن لەگەڵ قەدەریی، چونکە ئەوان سەرناخرێن - لە لایەن الله ەوە -.

**٢٣٩** - حدثنا محمد بن عُمر بن مُقَدَّم، قال: ثنا أبو عِصمة الحذّاء، عن أبي صالح، عن أبيهِ، قال: خُوصِم إلى عُبيد الله بن الحسن في غلام اشتُرِيَ مِن رجل، فقال: إني اشتريت هذا، وضَمِنَ لي: لا داءَ، ولا غائلة، بيع المُسلمِ المُسلم، وإني وجدته قدريًّا!

قال: وأيُّ داء أدوى منه. قال: فردَّهُ عليه.

**٢٣٩** - أبي صالح لەباوکییەوە دەگێڕێتەوە، ووتی: ناکۆکیی بردرا بۆ لای عبيد الله بن الحسن دەربارەی غولام و کۆیلەیەکدا کە کڕدرابوو لە پیاوێک، ووتی: من ئەمەم کڕی و زەمانەت و گرەنتیشی پێدام: نەخۆشی نییە، هیچ تێکچوون و خراپیەکی نییە، مامەڵەی مسوڵمان لەگەڵ مسوڵمان ە، وە بەڕاستی من بینیم قەدەریی بوو.

ئەویش ووتی: چ نەخۆشییەک لەوە زیاتر نەخۆشت دەکات.

وە وتی: بۆی گەڕاندەوە.

**٢٤٠** - حدثنا بِشْر بن مُعاذ، وعيسى بن سُليمان، قالا : حدثنا عبد الله ابن جعفر، قال : أخبرني أبو سُهيل نافع بن مالك، قال : شاورني عمر بن عبد العزيز، قال : ما ترى في القدريَّة؟

قال : قلتُ : أرى أن يُستتابوا، فإن تابوا وإلَّا ضربت أعناقهم .

فقال : عمرُ : أما إن تلك سيرةُ الحقَ .

**٢٤٠** - أبو سهيل نافع بن مالک ووتی : عمر بن عبدالعزیز ڕاوێژی پێکردم، ووتی : چی بەگونجاو دەبینی بۆ قەدەریی؟

ووتی : ووتم : وادەبینم تۆبەیان پێ بکرێ، ئەگەر تۆبەیان کرد باشە گەرنا لە ملیان دەدرێ .

عمر ووتی : ئەمما بەڕاستی ئەمەیە سوننەت و ڕێبازی حەق .

**٢٤١** - حدثنا أبو سُليمان يحيى بن عثمان، قال : حدثنا اليمان بن عَدِي، قال : سألتُ الضَّحاك بن حُمْرَة عن القدريَ؟

قال : يُستتاب فإن تابَ وإلَّا قُتِلَ .

**٢٤١** - اليمان بن عدي ووتی : پرسیارم لە الضحاک بن حمرة کرد دەربارەی قەدەری؟

ووتی : داوای تەوبەی لێدەکرێ ئەگەر تەوبەی کرد ئەگینا دەکوژرێت .

**٢٤٢** - حدثنا محمد بن الوازير، قال : ثنا مروان بن محمد، قال : ثنا مُعاوية بن يحيى، قال : ثنا أرطأة بن المنذر، عن حكيم بن عُمير، قال : ذُكِرَ عند عمر بن عبد العزيز أهل القدرِ .

فقال عمرُ : إن كان يتخذونه دِينًا، فهم أهل أن تُسلَّ ألسنَتُهم من أقفيتهم .

**٢٤٢** - حكيم بن عمير ووتى : له لاى عمر بن عبد العزيز باسى ئەهلى قەدەر كرا - ئەوانەى مشتومڕ و گومانيان هەيە لە قەدەرى الله تعالى - .

عمر ووتى : ئەگەر ئەوان ئەمەيان كردبێتە دينێك بۆخۆيان، ئەوا شايستەى ئەوەن زمانيان دەربهێنرێت لە پشتە مليان .

**٢٤٣** - حدثنا بِشْر بن مُعاذ، قال : حدثنا مُعتمِر، عن أبي مخزوم، عن سيار أبي الحكم، أن عُمر بن عبد العزيز قال : ينبغي للمُكَذَبةِ بالقدرِ أن يُستتابوا، فإن تابوا وإلَّا أُجلوا من ديارِ المُسلمين .

**٢٤٣** - عمر بن عبدالعزيز ووتى : پێويستە بۆ ئەوانەى كە قەدەر بەدرۆ دەخەنەوە، داواى تەوبەيان لێبكرێ، ئەگەر تەوبەيان كرد ئەگينا دووردەخرێنەوە لە وڵاتى مسوڵمانان .

**٢٤٤** - حدثنا محمد بن الوزير، قال : حدثنا مروان بن محمد، قال : سُئل مالك عن القدريِّ الذي يُستتاب؟

قال : الذي يقول : إنَّ الله لا يعلمُ ما العباد عامِلون حتَّي يعملوا .

قال أبو عبد الله : هؤلاء الذين أخرجوا الله مِن عِلمِهِ .

**٢٤٤** - مروان بن محمد ووتى : پرسيار كرا له مالك دەربارەى ئەو قەدەرييەى كە داواى تەوبەى لێدەكرێ؟ - واتە ئەو كەسەى لەبابەتى قەدەردا كەوتۆتە كوفرەوە بيروباوەڕى چۆنە؟ تاوەكو داواى تەوبەى لێبكرێت - .

ووتى : ئەوەى كە دەڵێت : الله تعالى نازانێ كە بەندەكانى چى دەكەن تاوەكو كاردەكەن .

أبو عبد الله - واتە ئیمام أحمد بن حنبل رحمه الله - ووتى : ئا ئەوانەن كە الله يان دەركردووە لەژێر عيلمى خۆى - واتە بيروباوەڕيان وايە الله عيلمى نييە بە ڕووداني كارەكان پێش ڕوودانيان، كە ئەمەش نەفيكردنى (عيلم) ە كە يەكێكە لە پايەكانى قەدەر - .

**٢٤٥** - حدثنا أبو معن، قال : حدثنا يحيى بن الفضل، قال : شَهِدت مِكنف الندبي سأل أبا يوسف القاضي، فقال : يا أبا يوسف، ما الحُكمُ في القدريَّةِ؟

قال : الحُكمُ أنَّه مَن جحدَ العلمِ استتبته، فإن تابَ وإلَّا قتلته .

**٢٤٥** - مكنف الندبي پرسيارى لە أبا يوسف القاضي كرد، ووتى : ئەى باوكى يوسف ئايە حوكمى قەدەرى چييە؟

ووتی : حوکمی ئەوانەی کە ئینکاری علیلمی الله دەکەن داوای تەوبەیان لێدەکەم، ئەگەر تەوبەی کرد ئەگینا دەیکوژم .

**٢٤٦** - حرب بن إسماعيل الحنظلي الكرماني، قال : حدثنا محمد بن أبي بكر، قال : حدثنا حسان بن إبراهيم، قال : حدثنا محمد ابن الفضل، عن كُرْز بن وبرة، عن محمد بن كعب القُرظي قال : لُعنت القدريَّة على لسانِ سبعين نبيًّا، منهم نبيا هذا، فإذا كان يوم القيامةِ نادى منُادي : ليَقُم خُصماءُ الله. فيقوم القدرية .

**٢٤٦** - محمد بن كعب القرظي ووتی : قەدەری نەفرەتیان لێکراوە لەسەر زمانی حەفتا پێغەمبەر، لەوانە پێغەمبەرمانە ﷺ، لەڕۆژی قیامەتدا بانگکارێک بانگ دەکات : بۆئەوەی ئەوانەی کە دوژمن و بەربەرەکانێکاری الله ن هەڵسن .

لەوکاتەدا قەدەریەکان هەڵدەستن .

**٢٤٧** - حدثنا محمد بن عُمر بن علي، قال : ثنا الحسن بن حبيب، عن الأصبغ بن زيد، عن أبي غياث، قال : سمعت أنس ابن مالك يقول : المُكذِّبون بالقدرِ المُشركون .

**٢٤٧** - أبي غياث ووتی : گوێم لە أنس بن مالک بوو دەیووت : ئەوانەی قەدەر بەدرۆ دەخەنەوە موشریکن .

**٢٤٨** - حدثنا محمد بن عمر، قال : حدثنا ابن نَدبة، عن عُمر بن محمد، قال : قال ابن عباس : الإيمان بالقدر نِظامُ[1] للتوحيدِ، فمن وحَّدَ الله وكذَّبَ بالقدر، كان تكذيبه بالقدرِ نقضًا للتوحيد .

**٢٤٨** - إبن عباس ووتى : ئيمان هێنان بەقەدەر نیزامێکە بۆ تەوحید، هەر کەسێک الله بەتاکو تەنها بزانێت و قەدەر بەدرۆ بخاتەوە، ئەوا بەدرۆ خستنەوەکەی بۆ قەدەر هەڵوەشێنەرەوەیە بۆ تەوحیدەکەی .

---

[1]: واتە بەدرۆخستنەوەی قەدەر تەوحید هەڵدەوەشێنێتەوە، والله اعلم .

**٢٤٩** - حدثنا أبو معن، قال : ثنا مُؤمَّل بن إسماعيل، ثنا عمر بن محمد العمري، قال : حدثنا سالم بن عبد الله، قال : قال ابن عمر : مَن زعم أنَّ مع الله بارِئًا، أو خالقًا، أو رازِقًا، أو قاضيًا، أو راضًيا، أو يملك لنفسه ضرًّا أو نفعًا، أو موتًا أو حياةً، أو نشورًا، بعثه الله أخرس لِسانه، وأعمى بصره، وجعل عمله هباءً منثورًا، وقطع به الأسباب، وأكبَّهُ في النَّارِ على وجهِهِ .

**٢٤٩** - إبن عمر ووتى : هەر کەسێک پێی وابێت لەگەڵ الله تعالى بارئ و درووستکار و ڕزق پێدەر و حوکم دەر و ڕازی، یان سوود یان زیان دەگەیەنێت بۆ نەفسی خۆی، یان ژیان و مردن و زیندووبوونەوە، الله زیندووی دەکاتەوە و زمانی لاڵ دەکات - زمانی قسە ناکات - و چاوەکانی کوێرن، وە کاروکردەوەکانی دەکاتە

تۆزی بابردوو، وە هەموو پەیوەندیی و هۆیەکی نێوانیان دەپچڕێێ، وە ڕایدەکێشێ بۆناو ئاگر لەسەر ڕووخساری .

**٢٥٠** - حدثنا حبان بن عمار، قال : ثنا عُمر بن يونس، قال : حدثنا أيوب بن النَّجار، عن ابن عون، عن محمد، قال : حُدِّثتُ أن القدريَّةَ يُمسخون في قبورهِم قِردةً وخنازير .

**٢٥٠** - محمد ووتی : بۆم گێڕدراوەتەوە کەوا بەڕاستی قەدەریەکان شێوەیان لەناو گۆڕدا دەگۆڕێت بۆ مەیمون و بەراز .

**٢٥١** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا حماد بن زيد، عن أبي مخزوم النهشلي، قال : قال عُمر بن عبد العزيز : يا أيها النَّاس، اتقوا الله، فإنَّه والله لا بُدَّ لأقوام أن يعملوا أعمالًا، كتبها الله عليهم، ووضعها في أعناقِهِم .

**٢٥١** - عمر بن عبدالعزيز ووتی : ئەی خەڵکینە، بترسن لە الله، چونکە بەڕاستی گومانی تێدا نییە کەوا هیچ کۆمەڵەیەک کار و کردەوانێک ناکەن، ئیللا الله لەسەری نوسیوون، پاشان دەیخاتەوە گەردنیان .

---

: دەیخاتەوە گەردنیان : واتە بەندەکان کردەوانێک دەکەن کە الله پێشوو بۆیانی نوسیوە، وە لەسەر ئەو کردەوەیە الله لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات، والله اعلم .

**٢٥٢** - حدثنا المُسيب بن واضح، قال : ثنا يوسف بن السَّفَر، عن الأوزاعي، عن الزُّهري، قال : القضاءُ هو القدر، والقدرُ هو العلم، والعلمُ نافذ في العبادِ فيما عملوا مِن خير أو شرَ، مكتوب في رِقابهم إلى أن يُفارِقوا الدنيا .

**٢٥٢** - الزهري وتى : بڕیارەکان قەدەرن، وە قەدەریش زانستە، وە زانستیش تەنفیز و جێبەجێ دەبێ لەسەر بەندەکان لەوەی کە چیان کردووە لە چاکە و شەڕ، لە گەردەنیان نوسراوە تاوەکو جیادەبنەوە لەدونیا .

**٢٥٣** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : ثنا أبو معشر، عن محمد بن كعب في قوله : ﴿**مَآ أَنتُم عَلَيهِ بِفَاتِنِينَ** (١٦٢) **إِلَّا مَن هُوَ صَالِ ٱلجَحِيم** (١٦٣)﴾ **[الصَّافات]**، قال : ما أنتم بمُضلَين أحدًا إلَّا مَن كتبتُ عليه أنَّه مِن أهلِ الجحيم .

**٢٥٣** - محمد بن كعب لە وتەی الله تعالى کە دەفەرموایێت : ﴿**مَآ أَنتُم عَلَيهِ بِفَاتِنِينَ** (١٦٢) **إِلَّا مَن هُوَ صَالِ ٱلجَحِيم** (١٦٣)﴾ **[الصَّافات]** .

هیچ یەکێکتان ناتوانن کەسێک گومڕا بکەن ئیللا ئەو کەسە نەبێ کە لەسەری نوسراوە لە ئەهلی دۆزەخە .

**٢٥٤** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا عبد الحميد بن سُليمان، عن أبي حازم، قال : ذُكِرَ عند ابن عُمر قوم يُكذَبون بالقدرِ، فقال : لا تجالسُوهم، ولا تسلَمُوا

عليهم، ولا تعودُوا مرضَاهُم، ولا تشهدُوا جنائزَهم، وأخبِروهُم أني منهم بريءٌ، وأنهم مِنَي براءَ، وهم مجوسُ هذه الأُمَّةِ .

**٢٥٤** - أبي حازم ووتى : لای إبن عمر باسی كۆمه‌ڵانێكم كرد كه قه‌ده‌ر به‌درۆ ده‌خه‌نه‌وه، ووتى : له‌گه‌ڵیاندا دامه‌نیشن، وه سه‌لامیان لێ مه‌كه‌ن، وه كاتێك نه‌خۆش كه‌وتن سه‌ردانیان مه‌كه‌ن، وه ئاماده‌ى جه‌نازه‌یان مه‌بن، وه هه‌واڵیان پێ بده‌ن كه‌وا من لێیان به‌ریم، وه ئه‌وانیش له‌من به‌رین، وه ئه‌وانه مه‌جوسى ئه‌م ئوممه‌ته‌ن .

**٢٥٥** - حدثنا كثير بن يحيى بن كثير، قال : حدثني منصور بن زيد العدوي، قال : حدثنا عُمر بن محمد بن زيد، قال : سألَ رجل سالم بن عبد الله قال : الزَنا بقدر؟

قال : نعم .

قال : قضاء قضاهُ الله عليه؟

قال : نعم، على رغم أنفك .

**٢٥٥** - عمر بن محمد بن زيد ووتى : پیاوێك پرسیارى له سالم بن عبد الله كرد ووتى : زینا به‌قه‌ده‌ر ڕووده‌دات؟

ووتى : به‌ڵێ .

ووتى : بڕیارێكه الله له‌سه‌رى بڕیارداوه؟

ووتی : بەڵێ، سەرەڕای ئەوەی کە پێشت ناخۆشبێ .

## باب : (٧)

## باب في الشهادة على قوم بالجنة

## دەربارەی شایەتیدان بەسەر خەڵکی بەوەی لە بەهەشتدان



**٢٥٦** - سمعت إسحاق بن إبراهيم يقول: مضتِ السُنَّةُ من النبي ﷺ والخُلفاءِ من بعده، واجتمعَ علماءُ الأمصار على ذلك: أن لا يشهدَ أحد على أحد بعدَ النبيَّ ﷺ أنَّه في الجنَّةِ لصلاحِهِ وفضلهِ وسوابقِهِ.

ولا أحد أنَّه مِن أهل النَّارِ لا رتكاب المعاصي والذُّنوب، ونكِلُ ذلك إلى الله، فإنَّه الذي يتولَّى السَّرائر.

قال: ويحقُّ عليك أن تعرِفَ وتستيقِنَ أن ما صَحَّ عن النبي ﷺ أنه قال في الجنَّةِ، فهو في الجنَّة.

كذلك الأمرُ عند أهلِ العلم مِن غيرِ أن ينصبَ الشَّهادة.

**٢٥٦** - گوێم لە إسحاق بن إبراهيم بوو دەیووت : سوننەتی پێشووی تێپەڕیوو لە پێغەمبەر ﷺ و جێنشینەکانی دوای ئەو، وە زانایانی وڵاتە جیاوازەکان کۆکن لەسەر ئەوەی :

هیچ کەس شایەتی لەسەر کەس نادات لە دوای پێغەمبەر ﷺ کەوا بۆ بەهەشتە بەهۆی چاکی و فەزڵی و باشییەکانی ڕابردووی .

وە شایەتی نادرێت لەسەر کەس کەوا لە ئەهلی ئاگرە بەهۆی ئەنجامدانی سەرپێچی و تاوانەکانی، ئەمانە دەبەینەوە بۆ لای الله تعالى، چونکە بەڕاستی ئەو بەنهێنیەکان زاناترە .

ووتی : حەقە لەسەرت بزانیت و یەقینت هەبێ کەوا ئەو کەسەی پێغەمبەر ﷺ وتویەتی لە بەهەشتە، ئەوا لەبەهەشتە - واتە ئەوەی بە دەلیل هاتووە و پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی لە بەهەشتە ئەوا بەدڵنیایی لە بەهەشتە - .

وە باسەکە بەهەمان شێوەیە لە لای ئەهلی عیلم بەبێ ئەوەی شایەتی دانەکە بەرز بکرێتەوە - والله اعلم مەبەستی ئەوەیە کە تەنیا ئەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ شایەتی بۆ داون لەبەهەشتن ئەوا بەڕاستی دەزانین و بێجگە لەو شایەتی بۆ هیچ کەسێک نادەین، یاخود بڵێی : ئەوان چاکەکار بوونە کەسێک چاکەکاربێ بەئەویش بڵێی تۆ ئەهلی بەهەشتی، کەواتە لە ئەوەندەی پێغەمبەر ﷺ شایەتی بۆ داون بەرز نابێتەوە - .

**٢٥٧** - حدثنا مالك بن سَعْد ابن أخي رَوح، قال: ثنا محمد بن يعلى، قال: حدثنا عُمر بن الصُّبح، عن خالد بن ميمون، عن نُفيع بن الحارث، عن زيد بن أرقم، قال: قال رسول الله ﷺ فيما يروي عن ربِّه تبارك وتعالى أنَّه قال: لا تُنزِلُوا عبادِي العارِفين المُوحَدِينَ المُقرِّينَ بالجنَّةِ ولا النَّارِ، حتَّى أكونَ أنا الذي أنزِلُهم بعلمي فيهم، ولا تكلَّفُوا ذلك ما لم تُكلَّفوا، ولا تُحاسِبُوا العبادَ دُون ربِّهم.

**٢٥٧** - رسول الله ﷺ له پەروەردگارەوە تبارك وتعالى ڕیوایەتی كردووە كە فەرموویەتی: (بەندە زانا و یەكخواپەرست و دانپێدەرەكانم - بە تەوحید - دامەبەزێنن بەوەی لەبەهەشتن یان دۆزەخ، تاوەكو من بە زانستی خۆم دایاندەبەزێنمە ناویان، كەس لەوەدا تەكلیفی لێ نەكراوە، هیچ كەس لێپێچینەوە ناكات لەگەڵ بەندەكان جگە لە الله تعالى).

---

: ئیسنادەكەی ضعیفە.

**٢٥٨** - حدثنا أبو معن، قال: حدثنا مُعتمر، عن ليث، عن جعفر العبدِي، قال: قال رسول الله ﷺ: وَيل لِلمُتألِّين مِن أُمَّتِي، الذِينَ يقولون: فُلان في الجنَّة، وفُلان في النَّارِ.

**٢٥٨** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (وەیل بۆ - متألي - لەئوممەتەكەم، ئەوانەی كە دەڵێن: فلان لەبەهەشتە و فلان لە ئاگرە).

## باب : (٨)

# الأمر في قريش ما بقي من الناس اثنان

# دەربارەی ئەوەی کەوا بەڕێوەبردنی کاروباری مسوڵمانان (خیلافەت) لەنێو قورەیش دایە تاوەکو دوو کەس مابێت لەسەر زەوی



**٢٥٩** - حدثنا أحمد بن عبد الله بن يونس، قال : حدثنا عاصم بن محمد، عن أبيه، قال : قال عبد الله بن عُمر، قال رسول الله ﷺ : لا يَزال هذا الأمرُ في قُرَيش ما بَقِي مِن النَّاسِ اثنان . وقال بيده هكذا .

**٢٥٩** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەم کارە - واتە بەڕێوەبردن و گرتنەدەست و حوکم کردنی کاروباری مسوڵمانان – لە قورەیشدا دەمێنێتەوە تا ئەوکاتەی دووکەس مابێت لەسەر زەوی) وە بە دەستی ئاماژەی پێدا بەوجۆرە .

---

: **رواه أحمد (٤٨٣٢)، والبخاري (٣٥٠١)، ومسلم (٤٧٣١)** .

**٢٦٠** - حدثنا أحمد بن حنبل، قال: حدثنا محمد بن جعفر، قال: ثنا شعبة، عن حبيب بن الزُّبير، قال: سمعت ابن أبي الهُذيل، قال: كان عَمرو بن العاص يتخوَّلُنا، فقال رجل من بكر بن وائل: لِئن لم تَنتهِ قريشٌ ليضعنَّ هذا الأمرَ في جُمهور من جماهير العربِ سِواهم.

فقال عَمرو بن العاص: كذبت، سمعت رسول الله ﷺ يقول: قُرَيشٌ وُلاةُ النَّاسِ في الخيرِ والشَّرَ إلى يوم القيامَةِ.

**٢٦٠** - گوێم لە ابن أبي الهذيل بوو دەیووت: عمرو بن العاص بەسەریدەکردینەوە و لەڕووی علمەوە سەرپەرشتی دەکردین، پیاوێکیش لە بکر بن وائل ووتی: ئەگەر قورەیش دەست هەڵنەگرن ئەوا الله ئەم کارە دەخاتە نێو کۆمەڵێک لە کۆمەڵان جگە لە عەرەب خۆیان.

عمرو بن العاص یش ووتی: درۆت کرد، من گوێم لە رسول الله ﷺ بوو دەیفەرموو: (قورەیش وەلی ئەمرو سەرۆکی خەڵکین لە باش و خراپدا تاوەکو رۆژی قیامەت).

---

: **رواه أحمد** (١٧٨٠٨).

**٢٦١** - حدثنا أبو معن، قال: ثنا عبد الملك بن عَمرو، قال: حدثنا كثير بن عبد الله، عن أبيه، عن جده، أن رسول الله ﷺ قال: يا مَعشرَ قُريش، إنَّكُم الولاةُ بَعدِي لهذا الأمر، فلا تموتُنَّ إلَّا وأنتم مُسلمون.

**٢٦١** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەی گرۆی قورەیش، بەڕاستی ئێوەن سەرۆک و کاربەدەست دوای من لەم کارەدا، بۆیە نەمرن ئیللا بە مسوڵمانێتی نەبێ) .

**٢٦٢** - حدثنا يحيى بن عبد الحميد، قال : حدثنا إبراهيم بن سعد، عن صالح بن كيسان، عن ابن شِهاب، عن عُبيد الله بن عبد الله بن عُتبة، عن ابن مسعود، قال : قال النبي ﷺ : يا معشرَ قُريش، إنَّ هذا الأمر فِيكُم ما لم تَعصوا الله، فإذا عَصيتموه، بعثَ اللهُ عليكم مَن يلحَاكُم كما يُلحى هذا القضيب .

وألْحَى قضيبًا في يدِهِ أبيض .

**٢٦٢** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەی گرۆی قورەیش، بەڕاستی ئەم کارە لە ئێوەدایە - واتە بەڕێوەبردن و گرتنەدەست و حوکم کردنی کاروباری مسوڵمانان - تا ئەو کاتەی سەرپێچی الله ناکەن، کاتێک سەرپێچیتان کرد، ئەوا الله کەسانێکتان بۆ دەنێرێت کە دوورتان بخاتەوە و لێتان دابڕێ لەم کاروبارە، وەک چۆن توێکڵێک لە لقەدارێک دادەبڕێ و جیادەبێتەوە) .

توێکڵە دارێکی سپی لێکردەوە کە لەدەستیدا بوو .

# باب : (٩)

## باب جامع في طاعة الإمام، وما يجب عليه للرعية

## كۆكراوەيەك دەربارەی گوێڕایەڵیی کردنی ئیمام وە ئەوەی لەسەریەتی بەرامبەر ژێردەستەکانی



**٢٦٣** - حدثنا سعيد بن منصور، قال: حدثنا أبو مُعاوية، قال: حدثنا جعفر بن قان، عن يزيد بن أبي نُشبة، عن أنس بن مالك، قال: قال رسول الله ﷺ: الجِهادُ ماض مُنذُ بعثني الله إلى أن يُقاتِلَ آخِرُ أُمَّتِي الدَّجَّالَ، لا يُبطِلُهُ جَوْرُ جائر، ولا عَدلُ عادِلٍ.

**٢٦٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (جیهاد و تێکۆشان لەپێناو الله هەر بەردەوامە و هەبووە لەو کاتەوەی الله منی ناردووە تاوەکو کۆتایی ئوممەتەکەم دەجەنگێ لەگەڵ دەجال، خراپی خراپەکارێک پوچەڵی ناکاتەوە، وە نە دادپەروەریی دادپەروەرێک) .

**٢٦٤** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا جعفر بن برقان، عن هشام، قال : أخبرنا مُغيرة، عن إبراهيم، قال : سُئل عن الغزوِ مع بني مروان، وذكر ما يصنعون!

قال : إن عرَّضَ بهِ إلّا الشَّيطان ليثبطهم عن جهادِ عدُوَهم .

**٢٦٤** - إبراهيم ووتی : پرسیار کرا دەربارەی جەنگ لەگەڵ بەنی مەڕوان وە باسی ئەو کارانە کرا کە چی دەکەن .

ووتی : کەس پیشانی نەداون ئیللا شەیتان نەبێت بۆ ئەوەی بێ ورەیان بکات و پاڵدەنەوە لە جیهاد و تێکۆشانی دوژمنەکەیان .

**٢٦٥** - حدثنا المُسيّب بن واضح، قال : حدثنا أبو إسحاق الفزاري، عن الأعمش، قال : كان عبد الرحمن بن يزيد، وأبو جُحيفة، وإبراهيم النَّخعي، وعمارة بن عمير : يغزون في إمرة الحجَّاج .

قلتُ : وأين كانوا يغزون؟

قال : خُراسَان، والدَّيلم، وغير ذلك .

فقال رجل من القومِ : أكانوا يُكرهون على ذلك؟

قال : لا، بل يخفّون فيه، ويُعجهم .

**٢٦٥** - الأعمش ووتی : عبدالرحمن بن يزيد و أبو جحيفة و إبراهيم النخعي و عمارة بن عمير جەنگیان دەکرد لەکاتی فەرمانبەرداری حەجاج .

ووتم : له كوێ جەنگیان دەكرد؟

ووتی : له خراسان و الدَّیلم، وه جگه لەوانەش .

پیاوێک له قەومەکه ووتی : ئایه زۆرییان لێ دەکرا لەمەدا؟

ووتی : نەخێر، بەڵکو پەلەیان دەكرد تێیدا، وه بەدڵیشیان بوو .

**٢٦٦** - قال : وحدثنا أبو إسحاق، قال : سألت هِشامًا عن الغزو مع هؤلاء الأئمَّة؟ وذكرت له ما طُعِنَ في الغزوِ معهم .

فقال : كان الحسن وابن سيرين يقولان : لك أجره، وذخره، وشرفه، وفضيلته، وعليهم مأثمهم .

قال : وكان الحسن يقول : بلغني أن النبي عليه صَّلاة والسَّلام كان يقول : ليؤيدنَّ اللّهُ هذا الدِّين بأقوام لاخلاقَ لهم .

وكان الحسن يقول : أربعٌ مِن أمر الإسلام إلى السُّلطانِ : الحُكمُ، والفَيءُ، والجِهادُ، والجُمعة .

قلتُ لِهشامٍ : وإن برُّوا أو فجروا؟

قال : وإن برُّوا أو فجروا .

**٢٦٦** - أبو إسحاق ووتی : پرسیارم له هیشام کرد دەربارەی جەنگ کردن لەگەڵ ئەم پێشەوایانە؟

وە ئەوەم بۆی باس کرد کە تانە دەدرێن لە جەنگ کردن لەگەڵیان .

ووتی : حسن و إبن سيرين دەڵێن : پاداشت و سەرمایە و شەرەف و فەزڵ و گەورەییەکەی بۆ تۆیە، وە تاوانەکەش بۆ ئەوانە .

ووتی : حسن دەڵێت : پێم گەیشتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (الله پشتگیری ئەم دینە دەکات بەکۆمەڵانێک کە لەدوارِۆژدا هیچ بەشێکییان نییە)

---

: **رواه أحمد (٢٠٤٥٤)** لە حەدیسی الحسن بن أبي بكرة رضي الله عنه .

وە حسن دەڵێت : چوار شت هەن لە ئیسلامدا بۆ فەرمانڕەوایە : حوکم، وە فيء - ئەو ماڵ وسامانەیە بەبێ جەنگ دەستی مسوڵمانان دەکەوێت - ، وە جیهاد کردن، وە نوێژی جومعە .

بە هیشامم ووت - واتە هشام بن حسان (١٤٧ ھ) رحمه الله - : ئەگەر فەرمانڕەواکان چاکەکاربوون یان خراپەکاریش بوون؟

وتی : ئەگەر چاکەکاربوون و خراپەکاریش بوون - لەفزەکە بەڵگەیە بۆ وتنی بەڵێ - ) .

**٢٦٧** - حدثنا المسيّب، قال : حدثنا أبو إسحاق، عن موسى بن عُقبة، قال : غزوت مع سالم بن عبد الله الرُّوم مع إمرةِ الوليد بن عبد الملك .

**٢٦٧** - موسى بن عقبة ووتى : جەنگم كرد لەگەڵ سالم بن عبدالله ى ڕۆم لەگەڵ فەرمانڕەوایی ولید بن عبدالملك .

**٢٦٨** - حدثنا المسيّب، قال : ثنا أبو إسحاق، عن الرَّبيع بن صَبيح، عن قيس بن سعد، قال : قيل لابن عمر : ما ترى في الغزوِ؟ فإن الأُمراء قد أحدثوا ما قد رأيتَ!

قال : اغزُ معهم، وليس عليك مِن إحداثهم شيء .

**٢٦٨** - قيس بن سعد ووتى : به إبن عمر وترا : چی دەڵێیت دەربارەی جەنگ کردن؟ لەکاتێکدا فەرمانڕەواکان بیدعەیان کردووە وەک ئەوەی کە دەیبینی؟

ووتی : جەنگ لەگەڵیاندا بکە، وە هیچ تاوانێک ناکەوێتە سەرت لە داهێنراوەکانیان .

**٢٦٩** - حدثنا محمد بن بشَّار، قال : ثنا عبد الرحمن، قال : ثنا عبد العزيز بن مُسلم، عن أبي سنان، عن عبد الله بن أبي الهذيل، قال : تذاكرنا ليالي المُختار الجُمعة، فاجتمع رأيهم على أن يأتوه، فإنَّما كَذِبه على نفسِهِ .

**٢٦٩** - عبد الله بن أبي الهذيل ووتی : باسی شەوەکانی موختارمان دەکرد لە جومعەدا - مختار الثقفي : سەرکردەیەکی سەربازیی بووە، بەدوای خوێنی إمامی الحسين بن علي ەوە بووە رضي الله عنهما، وە زۆرێک لە کوژراوانی کوفە ئەو کوشتوویەتی، دەستی گرت بەسەر کوفەدا،

وه پلانی دادەنا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەلەویی ڕافیزیی لە عێڕاق، لەسەردەستی هێزی مصعب بن زبیر لە کوفە کوژرا - ، بیروبۆچونەکانمان کۆک دەبوو لەسەرئەوەی بچین، چونکە بەڕاستی درۆکەی لەسەر خۆیەتی - واتە ئەگەر فەرمانڕەوا و ئیمامی سونی یان مبتدع یان دادپەروەر یان فاسق بێت نابێت وازبهێنیت لە ئامادەبوون لە نوێژی جومعە، ئەگەر درۆ و بوهتانیشی کرد تاوانەکەی لەسەرخۆیەتی - .

**٢٧٠** - حدثنا محمد بن بشَّار، قال: حدثنا سُفيان، عن الأوزاعي، عن عُمير بن هانئ، قال: كنتُ أسمع ابن عمر يقول لعبدِ الملك بن مروان، ولابن الزُّبير، ولنجدة: ذُباب النَّارِ. ثم تُقامُ الصَّلاةُ، فيُصلِّي مع هؤلاء، ومع هؤلاء.

**٢٧٠** - عمیر بن هانئ ووتی: گوێم لە إبن عمر بوو دەیووتە عبدالملک بن مروان و إبن زبیر و نجدة: مێشی ئاگر.

پاشان نوێژ بەرپادەکرا، نوێژی دەکرد لەگەڵ ئەمانە وە لەگەڵ ئەوانە.

---

عبدالملك بن مروان: پێنجەم خەلیفەی دەوڵەتی ئومەویی بوو، لە سەردەمی ئەودا خیلافەتی ئیسلامی لە سەختترین بارودۆخەکانیدا بوو، چونکە دابەش ببوو بۆ دوو بەش، بۆیە عبدالملک بن مروان حجاج بن یوسف الثقفي کردە والیی عێڕاق، کە پیاوێکی خوێنڕێژ و ترسناک بوو، هەڵسا بە گەمارۆدان و کوشتنی صحابەی بەڕێز عبد الله بن زبیر کوڕی گەورە صحابە زبیر بن عوام لە مەککە .

نجدة: یەکێک بووە لە سەرکردەکانی خەواریج لەماوەی خیلافەتی دەوڵەتی ئومەویی .

**٢٧١** - حدثنا محمد، قال : ثنا عبد الرحمن، قال : ثنا سفيان، عن بسام الصيرفي، عن أبي جعفر قال : كان الحسن و الحُسين يَسُبَّان مروان، ثم تُقام الصَّلاة فيبتدرانِ الصَّلاة خلفَهُ .

**٢٧١** - أبى جعفر ووتى : حسن و حسين جوێنیان دەدا بە مەڕوان، پاشان هەڵدەستان بۆ نوێژ بەخێرایی نوێژیان لەپشتیەوە دەکرد .

**٢٧٢** - حدثنا نصر بن علي، قال : حدثنا عمر بن أبي خليفة، قال : سألتُ عبد الكريم أبا أُمَيَّة عن الصَّلاةِ خلف بني أُميَّة؟

فقال : كان ابن عُمر يجيء في الليلةِ المُظلمة فيُصلَي خلفَ الحجَّاج .

**٢٧٢** - عمر بن أبي خليفة ووتى : پرسیارم لە عبدالكريم أبا أمية كرد دەربارەى نوێژ كردن لەپشت بەنى ئومەییە؟

ووتى : إبن عمر لەشەوێكى تاریك دەهات و نوێژى لەپشت حەجاج دەكرد .

**٢٧٣** - حدثنا إسماعيل بن عبد الحميد العجلي، قال : حدثنا لمازة ابن المُغيرة، عن عبد الرحيم بن زيد بن الحواري العمّيّ، عن عمِّهِ، قال : قال رسول الله ﷺ : سَبعٌ مِن الهُدى، وفيهِنَّ الجماعة، مَن خرجَ مِن شيء مِنهُنَّ خرجَ مِن الجمَاعةِ، ثُم قال : لا تشهَدُوا على أهلِ مِلَّتِكُم بِكُفر، ولا شِرك، ولانِفاق، وذرُوا سرائرَهُم إلى الله .

وصلوا على مَن صَلَّى القِبلة إذا مات .

وصلُوا الصَّلوات الخمس، والجمعات خلفَ كُلَ إمام بَرَ أو فاجِر .

وجاهِدُوا مع كُلَ خليفة، لكم جِهَادُكُم، وعليهم إثمُهُ .

وادعُوا لهُم بالصَّلاحِ والعافيةِ، ولا تَدعُوا عليهِم .

ولا تخرجوا على الأئمَّةِ بالسَّيف وإن جارُوا .

وجانِبوا الأهواءَ كُلَّها، فإنّ أوَّلَهَا وآخرها باطِلٌ .

**٢٧٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (حەوت شت لەهیدایەتن، وە لەوانە جەماعەتە، هەر کەسێک لەشتێکی ئەوان دەربچێت، ئەوا دەرچووە لە جەماعەت، پاشان فەرمووی : شایەتی مەدەن لەسەر هیچ کەسێکی میللەتەکەتان بەکوفر و شرک و نیفاق، نهێنیەکانیان بگەڕێننەوە بۆ لای الله .

کاتێک مردن نوێژ لەسەر ئەوانە بکەن کە ڕوو لەقیبلە نوێژیان کردووە - واتە کەسێک هیچ شرکێکت لێ نەدیوە و ڕوو لە قیبلە نوێژی کردووە، کاتێک مرد ئەوا نوێژی مردووی لەسەر بکە - .

وە پێنج نوێژەکان و جومعەکان لەپشت هەموو ئیمامێکی چاکەکار یان خراپەکار بکە .

وە جیهاد و تێکۆشان بکە لەگەڵ هەموو خەلیفەیەک، جیهادەکە بۆ ئێوەیە، وە تاوانەکەش بۆ خۆیەتی .

وە دوعایان بۆ بکەن بە چاکسازی بوون و سەلامەتی، نەوەک دوعایان لێ بکەن .

وە دەرمەچن بەسەر پێشەوای مسوڵمانان بە شمشێر ئەگەرچی خراپەکاریش بێت .

وە پشت بکەنە هەموو هەواو ئارەزوویەک، چونکە بەڕاستی یەکەم و کۆتاییەکەی باطلە) .

---

: حەدیسەکە ضعیفە، بەڵام سەلەف لە ئەثەرەکانیان باسیان کردووە، بەتایبەت قسە نەکردن لەسەر ئەوەی فڵانە کەس بۆ بەهەشتە و فڵانە کەس بۆ دۆزەخە، جگە لەوانەی کە رسول الله ﷺ شایەتی بەهەشتی بۆ داون .

**٢٧٤** - حدثنا أحمد بن يونس، قال : حدثنا مِندَل، عن حماد بن عبد الرحمن، قال : ثنا محمد بن عبد الله الشُّعيثي، قال : سمعت مكحولًا يقول في مَرَضِهِ الذي ماتَ فيه : أربعٌ لم أحدثكموهُنَّ عن رسول الله ﷺ، فأنا مُحدَثكموهُنَّ : لا تكفِّرُوا أهلَ مِلَّتِكُم وإن عملوا الكبائِرَ، والصَّلاةُ على كُلَ مَيت، والصَّلاةُ خلفَ كُلَ إمام، والجهادُ مَع كُلِّ أمير.

قال مكحولٌ : ثنتان مِن رأيي لم أذكُرهُما عن النبيِّ ﷺ : لا تقولوا في عليٍّ وعثمان إلَّا خيرًا : ﴿**تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ**﴾ [**البقرة : ١٣٤**] .

**٢٧٤** - محمد بن عبد الله الشعيثي ووتی : گوێم له مكحول بوو لەكاتی نەخۆشیەكەی كە بەهۆیەوە مرد دەیووت :

چوار شت كە لەپێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئێوەم نەگێڕاوەتەوە، من دەیگێڕمەوە بۆتان :

(خەڵكی میللەتەكەتان كافر مەكەن ئەگەرچی تاوانی گەورەیان ئەنجامدابێت، وە نوێژ كردن لەسەر هەموو مردوویەك، وە نوێژ كردن لەپشت هەموو ئیمامێك، وە جیهاد كردن لەگەڵ هەموو ئەمیرێك) .

مكحول ووتی : دووان بیروبۆچوونی خۆمە لە پێغەمبەرەوە ﷺ باسی ناكەم : قسە مەكەن دەربارەی علي و عثمان ئیللا بە باشە نەبێت : ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ [سورة البقرة : ١٣٤] .

واتە : ئەوانە ئوممەتێك بوون ڕۆشتن بەخۆیان و كردەوەی چاكیانەوە، ئێوەش هەرچی دەیكەن لە چاكە بۆ خۆتانە و بەرپرس نابن لە كارو كردەوەی ئەوان.

**٢٧٥** - حدثنا أبو معن، قال : حدثنا الضَّحاك، قال : حدثني زَمعة بن صالح، قال : حدثني سلمة بن وهرام، قال : قلتُ لطاووس : لا أؤدِّي عشور أرضي وأقسمها؟!

فقال : أولم تعشِّر أرضك؟!

قلت : بلى، أمَّا هؤلاء الأمراء فقد أخذوها، ولكن يضعونها في غيرِ حقِّها، فلا أدري يقضى ذلك عنِّي أم لا؟

قال : وما يُدريك؟! بل تقضي عنك، إيَّاك والبدع، وقُم للقردِ في زمانِهِ .

**٢٧٥** - سلمة بن وهرام ووتی : به طاوس م ووت : ئایا ده یه‌کی زه‌وییه‌که‌م نه‌ده‌م و دابه‌شی نه‌که‌م؟!

ووتی : ئایا زه‌وییه‌که‌ت نه‌کردۆته ده یه‌ک؟!

ووتم : به‌ڵێ، ئه‌مما ئه‌م کاربه‌ده‌ستانه بردیان، وه له‌غه‌یری مافی خۆی به‌فیڕۆی ده‌ده‌ن، منیش نازانم ئایا له‌سه‌رم لاچووه یان نا .

ووتم : تۆ چوزانی؟! به‌ڵکو له‌سه‌رت لاده‌چێ، وریابه له بیدعه، وه گوێڕایه‌ڵی بکه له‌چاکه‌دا .

**٢٧٦** - حدثنا هارون بن موسى، قال : حدثنا حماد بن زيد، عن كلثوم بن جَبر، عن قَزَعَةَ، أن ابن عُمر سُئِلَ عن الزَّكاةِ؟

فقال : ادفعوها إليهم .

فكأنَّهم رادُّوه .

فقال : ادفعُوها إليهم وإن تمزَّقوا بها لحوم الكلابِ على موائدِهم .

**٢٧٦** - پرسیار کرا له إبن عمر ده‌رباره‌ی زه‌کات؟

ووتی : پێیان بدەن .

وەک ئەوەی ڕەتی بکەنەوە .

ووتی : پێیان بدەن ئەگەرچی گۆشتی سەگیشی پێ پارچە بکەن لەسەر خوانەکانیان .

---

: **رواه أبو عبيد له (الأموال ـ ١٥٧٩)**، ئیسنادەکەی حسن ە .

**٢٧٧** - حدثنا هِشام بن عمار، قال : ثنا أبو سعيد الأنصاري، عن أبيه، عن خالد بن مَعدان، عن عبد الرحمن بن عَمرو السُّلمي، عن العِرباض بن سَارِية، قال : سمعت رسول الله ﷺ يقول : أوصيكُم بتقوى الله، والسَّمع والطَّاعَةِ، وإنْ عَبدا حبشيًّا، فإنَّهُ مَن يَبقَ بعدِي فسَيرَى اختلافًا كثيراً، فعليكم بِسُنَّتي، وسُنَّةِ الخُلفاءِ الرَّشِدين المهديّين، وعَضُّوا عليها بالنَّواجِذِ، وإيَّاكُم ومُحدَثاتِ الأمُورِ، فإنَّ كُلَّ بدعَة ضلالَة .

**٢٧٧** - رسول الله ﷺ دەفەرموویت : (وەسێتتان دەکەم بە پارێزکاریی کردنی الله تعالى، وە بیستن و گوێڕایەڵی کردن، ئەگەر بەندەیەکی حەبەشیش بێت، چونکە بەڕاستی هەر کەسێک لەدوای منەوە بمێنێ ڕا جیاوازیەکی زۆر دەبینێت، دەست بگرن بە سوننەتەکانم، وە سوننەتی خەلیفە ڕێنیشاندراوەکان و هیدایەتدراوەکان، بە کاکیلەکان توند قەپی پێدابگرن، وە ئاگاداربن لە کارە بیدعە و داهێنراوەکان، چونکە هەموو بیدعەیەک گومڕاییە) .

---

: **رواه أحمد (١٧١٤٢)، والترمذي (٢٦٧٦)** وه دەڵێ : حەدیسەکە ئیسنادەکەی حسن صحیحه .

**٢٧٨** - حدثنا أبو معن، قال : حدثنا وهب بن جرير، قال : ثنا أبي، قال : سمعت غيلان بن جرير يُحدِّث عن أبي قيس بن رياح، عن أبي هريرة، عن النبي ﷺ قال : مَن خرجَ مِن الطَّاعَةِ، وفارقَ الجماعةَ، فماتَ، مِيتَتُهُ جَاهِلية .

**٢٧٨** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەسێک دەربچێت لە گوێڕایەڵی -واتە چیتر گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای مسوڵمانان نەکات- ، وە جیابێتەوە لە جەماعەت، بمرێت ئەوا مردنەکەی مردنێکی جاهیلیە) .

---

: **رواه مسلم (٤٨١٤)** .

**٢٧٩** - حدثنا عُبيد الله بن مُعاذ، قال : ثنا أبي، قال : حدثنا شُعبَة، عن قتادة، قال : سمعت أبا مِراية، قال : سمعت عِمران بن حصين يُحدَث عن النبي ﷺ أنه قال : لا طاعةَ لأَحد في معصِيةِ الله .

**٢٧٩** - عمران بن حصين حەدیسێکی لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕایەوە کە فەرموویەتی : (گوێڕایەڵی بۆ هیچ کەسێک ناکرێ لە تاوان و سەرپێچی الله تعالى)

---

: **رواه أحمد (١٩٨٣٢)**، حەدیسەكە صحیحە، واتە هەر كەسێك فەرمانی پێكردیت بە تاوان و سەرپێچی كردنی فەرمانی الله ئەوا نابێت جێبەجێی بكەیت، تەنانەت گەر فەرمانڕەوای مسوڵمانانیش بێت .

**٢٨٠** - حدثنا عبد الوهاب بن الضَّحاك، قال : حدثنا إسماعيل بن عيَّاش، عن عبد العزيز بن عُبيد الله، عن شهر بن حوشب، عن عبد الله بن عَمرو بن العاص، عن رسول الله ﷺ أنَّه قال : كائِنٌ بَعدِي أُمراءٌ يُعرِّفُونكم ماتُنكرون، ويُنكرونَ عليكم مَا تَعرِفُون، فلا طاعَةَ لهُم عليكُم، فلا تَعتلُّوا بالله .

يعني : إن أمروكم بالمعصِيةِ فلا تُطيعوهُم .

**٢٨٠** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (لەدوای مندا كاربەدەستانێك پەیدا دەبن ئەو كارە چاكانەی دەیكەن بەخراپی دادەنێن، وە ئەو كارە خراپانەشی دەیكەن بەچاكی دادەنێن، بۆیە هیچ گوێڕایەڵی كردنێكی ئەوان لەسەر ئێوە نییە، بۆیە گوێڕایەڵییان مەكەن لەتاواندا بەبیانووی ئەوەی پەروەردگارتان ئیزنی پێداون)

واتە ئەگەر فەرمانیان پێكردی بەسەرپێچی ئەوا گوێڕایەڵیان مەكە .

---

: ئیسنادەكەی ضعیفە

## باب : (١٠)

## باب في الأمر بالإمساك في الفتنة

## فرمانكردن به خۆگرتنەوە لە كاتی فیتنەدا



**٢٨١** - حدثنا بِشْر بن هلال، قال : ثنا جعفر بن سُليمان، عن هِشام، عن ابن سيرين، قال : قال شُريحٌ : كانت الفتنةُ تسع سنين ما خُبِّرتُ فيها، ولا استخبرتُ، وما سلِمتُ .

قيل : وكيف ذاك يا أبا أُميَّة؟

قال : ما التقت فِئتان إلَّا وهواي مع أحدهما .

**٢٨١** - شریح ووتی : نۆ ساڵ فیتنە بوو، نە هیچ كەسێكم لێ ئاگادار كردەوە، نە پرسیاریشم كرد دەربارەیەوە، وە سەلامەت نەبووم لێی .

وترا : ئەوە چۆن ئەی باوكی أمیة؟

ووتی : دوو كۆمەڵ و تاقم بەیەك نەگەیشتوون ئیللا هەواو ئارەزووم لەگەڵ یەكێكیانە .

**٢٨٢** - حدثنا عَمرو بن عُثمان، قال: حدثنا أبي، قال: حدثنا شِهاب ابن خِراش، عن القاسم بن غزوان، عن إسحاق بن راشد الجزري، عن سالم، قال: حدثني عمرو بن وابِصة الأسدي، عن أبيه وَابصة، قال: حدثني ابن مسعود، عن رسول الله ﷺ قال، سمعته يقول: إنَّ فِتنةً مُظلمةً مُضِلَّةً، جائية، القاعِدُ فيها خيرٌ مِن القائم، والقائمُ فيها خير من الماشي، والماشي فيها خيرٌ مِن الرَّكِب، والرَّكِبُ فيها خَيرٌ مِن المجري، قتلاها كُلُّهم في النَّارِ.

قلت: ومتى ذاك يا ابن مسعود؟

قال: تلك أيامُ الهرجِ، حيثُ لا يأمنُ الرَّجلُ جَلِيسَهُ.

قلت: فما تأمُروني إن أدركني ذلك الزَّمان؟

قال: تكفُّ لسانَك ويدَك، وتكن حِلسًا مِن حلاسِ بيتِك.

**٢٨٢** - إبن مسعود بۆی گێڕامەوە کە رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (فیتنەیەکی تاریک و گومڕاکەر دێت، ئەوەی دانیشتووە تێیدا باشترە لەوەی وەستاوە، وە ئەوەی وەستاوە تێیدا باشترە لەوەی بەپێ دەڕوات، وە ئەوەی بەپێ تێیدا دەڕوات باشترە لەوەی بەسواریی دەڕوات، وە ئەوەی بە سواریی دەڕوات تێیدا باشترە لەوەی لەگەڵ فیتنەکە دەڕوات، کوژراوەکانی گشتیان لە ئاگردان).

وترا: ئەمە کەیە ئەی ابن مسعود؟

ووتی: ئەمە ڕۆژانی هرج ە - واتە کوشتنی زۆر - ، ئەوکاتەی پیاو ئەمین نابێ لەو کەسەش کە هاوەجلیسییەتی.

ووتم : فەرمانی چیم پێدەکەن کاتێک گەیشتم بەو ڕۆژگارە؟

ووتی : زمان و دەستت دەگریتەوە، وە پابەند دەبیت بە ماڵەکەتەوە .

---

: رسول الله ﷺ وشەی حلس ی بەکارهێناوە کە بەواتای ئەم پارچە قوماشە دێت کە لەسەر پشتی وڵاخ دادەنرێ لەژێری بۆئەوەی جێگیربێ، **رواه أحمد** (٤٢٨٦) .

**٢٨٣** - حدثنا سعيد بن سُليمان، قال : ثنا حماد بن سَلمة، عن ليث، عن طاووس، عن زِياد سيمين كوش، عن عبد الله ابن عَمْرو، أن رسول الله ﷺ قال : تكونُ فِتنةٌ تستنظِفُ العربُ، قَتلاها في النَّارِ قالها ثلاثًا، اللَسانُ فيها أشَدُّ مِن وقعِ السَّيفِ .

**٢٨٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (فیتنەیەک دەبێت لەداهاتوودا گشت عەرەب دەبات، کوژراوەکانی لەئاگردان، سێ جار فەرمووی، زمان تێیدا بەهێزترە لە پێکدادانی شمشێرەکان) .

---

: **رواه أحمد** (٦٩٨٠) .

**٢٨٤** - حدثنا عبد الله بن خُبيق الأنطاكي، قال : سمعت يوسف بن أسباط يقول :

أمَّا أهلُ السُّنَّةِ فإنَّهم لا يرون السَّيفَ على أحدٍ مِن أهل القِبلةِ .

وهُم يرون الصَّلاة والجمعة خلفَ الأئمَّة .

والجهاد معهم قائمٌ تامّ إلى يوم القيامة، لا ينقصه جورهم،

ولا يزيده عدلهم .

ولا يُكفِّرون أحدًا مِن أهل القبلة بذنبٍ .

ولا يشهدون عليه بشرك .

وهم يقولون : الإيمانُ قولُ وعملُ .

والإيمانُ يزيدُ وينقصُ .

وهم يَستثنون في إيمانِهم مَخافة أن يُزَكُّوا أنفسَهم .

**٢٨٤** - یوسف بن اسباط دەیووت : ئەمما ئەهلی سوننە بەڕاستی شمشێر بەدرووست نازانن لەسەر ملی هەر کەسێک لە ئەهلی قیبلە .

وە ئەوان نوێژ و ئامادەبوون لە هەینی بەدرووست دەزانن لە پشت ئیمامەکانەوە .

وە جیهاد بەرپاکردن بەتەواوی لەپشتییانەوە بەدرووست دەزانن تاوەکو ڕۆژی قیامەت، وە ستەم و خراپەی ئەوان کەمی ناکاتەوە، وە دادپەروەریشییان زیادی ناکات .

وە هیچ کەسێک لە أهلی قیبلە کافر ناکەن بەهۆی تاوانێکەوە ئەنجامیان دابێت .

وە شایەتیی هاوەڵ بڕیاردانیشی بۆ نادەن .

وە ئەوان دەڵێن : ئیمان وتە و کردەوەیە .

وە ئیمان زیاد و کەم دەکات .

وە ئەوان إستثناء دەکەن لە ئیمان دا لەترسی ئەوەی تەزکییەی نەفسی خۆیان بکەن .

**٢٨٥** - حدثنا أبو بكر محمد بن يزيد، قال : حدثنا عبد الأعلى بن سُليمان الزَّرَّاد، قال : حدثنا غالب القطَّان، قال : لقيني الأشياخ من عبد القيس فقالوا لي : ما شهادتك على مالك بن المنذر، وعلى يزيد بن المهلَّب، وعلى الحجَّاج بن يوسف؟ إن لم تشهد عليهم أنَّهم مُنافقين، بُراء من الإيمان، من أهلِ النَّارِ، فإنَّك شكَّاك في كتاب الله .

فأتيت الحسن فأخبرته بمقالة الأشياخ .

فقال الحسنُ : ابن أخي، رويدك بالشَّهادةِ، تُجزئك المعرفة، إنَّك مِن أهلِ دين لا يَحلُّ لأحد أن يشهدَ عليك أنَّك مِن أهلِ النَّارِ .

فأتيت محمد بن سيرين فأخبرته بمقالة الأشياخ، فقال لي : أمَّا مالك بن المُنذر، فأقرب ما كان مِنك جوارًا، وأعظمه عليك حقًّا تشهد عليه، لا آمُرُك بالشَّهادةِ عليهِ .

وأما يزيد بن المُهلَّب، فتعرف ركب الأزد، فإن شئت فتَعرَّض له .

وأما الحجَّاج بن يوسف، فالمسكين الحجاج، المسكين أبو محمد، انتهك الحُرمة، وركب المعصية، فإن يُعذبه، فبذنبِهِ .

وإن يغفر له، فإنَّا لا نُنفِسُ عليه المغفرة .

قال : فأتيت بكر بن عبد الله المُزني، فأخبرته بمقالة الأشياخ .

قال : لو أن النَّاس اجتمعوا يوم الجمعة، فقالوا لي : أتعرف أفضل هؤلاء رجلًا وحدًا؟

لقلتُ : أتعرفون أنصحهم لهم؟

فلو قيل له : إنَّه هذا . فعرفت أنه كذلك، لقلت : هذا أفضلهم .

ولو قيل : أتعرفُ أشرَّهم رجلًا واحِدًا؟

لقلتُ : أتعرفون أغشَّهم لهم؟

فلو قيل له : هذا، فعرفت أنَّه كذلك، لقلتُ : هذا أشرُّهم .

ولو قيل لي : اشهد لأفضلهم أنَّه مِن أهل الجنَّةِ، لم أشهد .

ولو قيل لي : اشهد على أشرِّهم أنَّه مِن أهل النَّارِ، لم أشهد .

فإذا كان رجائي لشرِّهم، فكيف رجائي لخيرِهم؟!

وإذا خشيتي على خيرهم، فكيف خشيتي على شرَهم؟!

**٢٨٥** - غالب القطَّان بۆی گێڕاینەوە، ووتی : شێخەکان پێم گەیشتن لە عبد القیس، پێیان ووتم : شایەتیی تۆ چییە لەسەر مالک بن منذر، وە لەسەر یزید بن مهلب، وە لەسەر حجاج بن یوسف؟ ئەگەر شایەتی نەدەی بەوەی ئەوان لە منافقانن، بەرین لە ئیمان، لە ئەهلی ئاگرن، ئەوا تۆ شک و گومانت هەیە لە کتابی اللە عزوجل .

منیش چوومە لای حسن و قسەی شێخەکانم پێ ڕاگەیاند .

حسن یش ووتی : ئەی کوڕی برام، بەدوای شەهادەت بگەڕێ بەشێکی مەعریفەتە، بەڕاستی تۆ لە ئەهلی دین یت، هیچ کەسێک بۆی حەڵاڵ نییە شایەتیت لەسەربدات بەوەی تۆ لە ئەهلی ئاگریت .

چووم بۆلای محمد بن سیرین و قسەی شێخەکانم پێ ڕاگەیاند .

محمد بن سیرین ووتی : مالک بن منذر نزیکترین جیرانی تۆ بووە، وە مافی بەسەرتەوە لەوە گەورەترە کە شایەتی لەسەر بدەیت، فەرمانت پێ ناکەم شایەتی لەسەر بدەیت .

ئەمما یزید بن المهلب، سواربوونی پشتی أزد - جۆرێکە لە شێر - ئەزانی، ئەگەر ویستت خۆت ڕووبەڕووی ئەوە بکەرەوە .

ئەمما حجاج بن يوسف، حجاج ی داماو، داماوه ئەی باوكی محمد، سنووری بەزاند، وه تاوانی ئەنجامدا، ئەگەر الله سزای بدا، ئەوا بەهۆی تاوانییەوەتی، وه ئەگەریش لێی خۆشبێ، ئەوا ئێمە چرووكی لەسەر ناكەین بەوەی الله لێی خۆشبووه .

ووتی : چووم بۆلای بكر بن عبد الله المزني، و قسەی شێخەكانم پێ ڕاگەیاند .

ووتی : ئەگەر خەڵكی هەموو كۆببنەوه لە ڕۆژی جومعە، وه پێم بڵێن ئایا باشترینی یەكێك لەو پیاوانە دەزانی؟

منیش دەڵێم : ئایا باشترین ئامۆژگاریكار بۆ ئەوان دەزانن؟

ئەگەر پێی وترا : ئەمەیانە. ئەوكات دەمزانی بەوجۆرەیە، منیش دەمووت : ئەمە باشترینییانە .

وه ئەگەر وترا : ئایا خراپترینی یەكێك لەو پیاوانە دەزانی؟

منیش دەڵێم : ئایا فێڵبازترینییان لێیان كامیانە؟

ئەگەر پێی وترا : ئەمەیانە. ئەوكات دەمزانی بەو جۆرەیە، منیش دەمووت : ئەوە خراپترینییانە .

وه ئەگەر پێم وترا : شایەتی بدە بەباشترینییان كەوا لەبەهەشتە، ئەوا شایەتیی نادەم .

وه ئەگەر پێم وترا : شایەتی بدە بە خراپترینیان كەوا لە دۆزەخە، ئەوا شایەتیی نادەم .

وە ئەگەر ئومێدم هەبێ بۆ خراپترینییان، ئەی چۆن ئومێدم نابێ بۆ باشترینیان؟!

وە ئەگەر ترسم هەبێ لەسەر باشترینییان، چۆن ترسم نابێ لەسەر خراپترینییان؟

**٢٨٦** - حدثنا أبو معن، قال : ثنا أبو داود، قال : ثنا القاسم بن الفضل، قال : حدثنا عبد الكريم بن المُعَلِّم، عن طاووس، قال : كنت عند ابن عُمر، فأتاه رجل، فقال : يا أبا عبد الرحمن، قوم يحكمون بالهوى، ويقتلون في المغضبة، ويستأثرون بالفيء، أكفَّار هم؟

قال : لا .

قال : قومٌ يشهدون علينا بالكُفرِ، ويسفكون دماءنا تقرُّبًا إلى الله، أكفار هم؟

قال : لا .

قال : فما الكُفر؟

قال : أن يجعل مع الله إلهين مثنى .

**٢٨٦** - طاووس ووتی : لە لای ابن عمر بووم، پیاوێک هاتە لای، ووتی : ئەی باوکی عبد الرحمن، قەومانێک بە هەواو ئارەزوو حوکم دەدەن، وە لە کاتی تووڕەبووندا دەکوژن، وە دەست دەگرن بەسەر فيء دا، ئایا ئەوانە کافرن؟

ووتی : نەخێر .

ووتی : کەسانێک شایەتی دەدەن لەسەرمان بە کوفر، وە خوێنمان دەڕێژن بۆ خۆنزیک کردنەوە لە اللە عزوجل، ئایا ئەوان کافرن؟

ووتی : نەخێر .

ووتی : ئەی کەواتە کوفر چییە؟

ووتی : ئەوەیە لەگەڵ اللە دوو خوای تر بپەرستیت .

## باب : (١١)

## باب الصلاة خلف الجهمي و الرافضي

## دەربارەی نوێژ کردن لەدوای جەهمی و ڕافیزە



**٢٨٧** - حدثنا إبراهيم بن عبد الله الأنصاري، عن أبي عُبيد، قال : ما أُبالي صليتُ خلفَ الجهمي والرَّافضي، أم صَليتُ خلفَ اليهودي والنَّصراني .

ولا يُصلَّي خلف من لا يُقدِّم أبا بكر على الخلق أجمعينَ بعد رسول الله ﷺ .

**٢٨٧** - أبي عبيد ووتی : گوێ پێنادەم گەر نوێژ بکەم لەدوای جەهمی و ڕافیزە، یاخود نوێژ بکەم لەدوای جولەکە و گاور - واتە هیچ جیاوازییەکییان نییە نوێژ لەدوای ڕافیزە و جەهمی بکەی یان لەدوای گاور و جولەکە - .

وە نوێژ ناکرێ لەدوای کەسێک کە أبا بکر پێش نەخات بەسەر هەموو درووستکراوەکان لە دوای رسول الله ﷺ .

وە هەروەها نوێژ کردن لەدوای قەدەری و خەواریج و مورجیئە، هیچ پێم خۆش نییە، وە بەگونجاوی نابینم .

**٢٨٨** - سمعتُ أحمد بن يونس، قال : سمعت زائدة يقول : لو كان رافضيًّا ما صليتُ وراءَهُ .

**٢٨٨** - أحمد بن يونس ووتى : گوێم له زائدة بوو دەیووت : ئەگەر کەسێک ڕافیزە بووایە ئەوا نوێژم لەدوایەوە نەدەکرد .

**٢٨٩** - حدثنا أحمد بن يونس، قال : سمعت رجلًا يقول لسفيان الثَّوري : الرَّجلُ يُكذَبُ بالقدرِ أَصلَي وراءَهُ؟

قال : لا تُقدَموه .

**٢٨٩** - أحمد بن یونس ووتی : گوێم لە پیاوێک بوو دەیوتە سفیان الثوري : پیاوێک قەدەر بەدرۆ دەخاتەوە ئایە نوێژی لەدواوە بکەم؟

ووتی : نەخێر، پێشی مەخە .

**٢٩٠** - حدثنا محمد بن الوزير، قال : حدثنا مروان، قال : سألتُ مالكًا : هل يُصلَى خلفَ القدري؟

قال : لا

**٢٩٠** - مروان ووتی : پرسیارم لە مالک کرد : ئایە نوێژ دەکرێت لەدوای قەدەری؟

ووتی : نەخێر .

**٢٩١** - حدثنا عُبيد الله بن يوسف، قال : حدثني فِطر بن حماد، قال : سألتُ مُعتمر بن سُليمان، فقلت : إمامٌ لقوم يقول : القرآن مخلوق، أُصلِّي خلفه؟

قال : أُصلَي خلف مُسلم أحبّ إليَّ .

قال : فِطر : فأتيت يزيد بن زُريع، فقلت : إمامٌ لقومٍ يقول : القرآنُ مخلوق، أُصلِّي خلفَهُ؟

قال : لا، ولا كرامة .

**٢٩١** - فِطر بن حماد ووتی : پرسیارم لە معتمر بن سلیمان کرد، ووتم : پێشەوای قەومێک دەڵێت : قورئان درووستکراوە، ئایە نوێژی لەدواوە بکەم؟

ووتی : نوێژ بکە لەدوای مسوڵمان لەلام خۆشەویسترە - ئاماژەیە بەوەی هەرکەسێک بڵێت قورئان درووستکراوە کافرە - .

فطر ووتی : یزید بن زریع هاتە لام، پێم ووت : پێشەوایەک بەقەومەکەی دەڵێت : قورئان درووستکراوە، ئایا نوێژی لەدوای بکەم؟

ووتی : نەخێر، هیچ ڕێزێکیشی بۆ نییە .

**٢٩٢** - حدثنا يحيى بن عثمان، قال : حدثنا ابن حِمير، قال : حدثني بشر بن جَبلة، عن أبي المُقوَّم، عن عبد الله بن عَمرو قال : إن لكُلِّ أُمَّة مجوسًا، وإنَّ مجوسَ هذه الأُمَّة أهلُ القدرِ، فإن مرضوا فلا تعودوهم، وإن ماتوا فلا تُصلُّوا عليهم، ولا تُسلِّموا عليهم .

**٢٩٢** - عبد الله بن عمرو ووتى : بەڕاستى بۆ هەموو ئوممەتێک مەجوسێک هەیە، مەجوسی ئەم ئوممەتەش قەدەریەکانن، ئەگەر نەخۆش کەوتن مەچونە لایان و سەردانیان مەکەن، وە ئەگەر مردن نوێژیان لەسەر مەکەن، وە سەلامیشیان لێ مەکەن .

---

: ئیسنادەکە ضعیفە .

**٢٩٣** - حدثنا أبو معن، قال : حدثنا مُعاذ، قال : ثنا سُليمان التيمي، عن مكحول، عن أبي هريرة قال : قال رسول الله ﷺ : إنَّ لكُلِّ أُمَّة مجوسًا، وإنَّ مجوسَ هذه الأُمَّة القدريَّة، فإن مَرِضُوا فلا تعودُوهُم، وإن ماتُوا فلا تَشهدوهُم .

**٢٩٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی بۆ هەموو ئوممەتێک مەجوسێک هەیە، مەجوسی ئەم ئوممەتەش قەدەریەکانن، ئەگەر نەخۆش کەوتن مەچونە لایان و سەردانیان مەکەن، وە ئەگەر مردن ئامادەی جەنازەیان مەبن) .

---

## باب : (١٢)

## باب في الدجال

## دەربارەی دەجال



**٢٩٤** - حدثنا عُبيد الله بن مُعاذ، عن أبيه، عن سُليمان بن المغيرة، قال : حدثنا حميد بن هلال، قال : قال هشام بن عام : سمعت رسول الله ﷺ يقول : ما بينَ خلقِ آدمَ إلى أن تقومَ السَّاعةُ فِتنةٌ أكبرُ مِن الدَّجَّالِ .

**٢٩٤** - رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : (لە نێوان درووستبوونی ئادەم تاوەکو هەڵسانی ڕۆژی قیامەت، فیتنەیەک گەورەتر نییە لە دەجال) .

: رواه أحمد (١٦٢٦٥)، ومسلم (٧٥٠٥) .

**٢٩٥** - حدثنا عُبيد الله، قال : حدثنا أبي، قال : حدثنا شُعبة، عن حبيب بن الزُّبير، عن عبد الله بن أبي الهذيل، عن عبد الرحمن بن أبزى، عن عبد الله بن خبَّاب،

عن أبي بن كعب، عن النبيِّ ﷺ قال : الدَّجَّالُ عينُهُ خضراءُ كأنَّها زُجاجَةٌ، وتعوَّذُوا باللهِ مِن عذابِ القبرِ .

**٢٩٥** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (دەجال چاوی سەوزە هەروەکو کاسەی شوشە، وە پەنا بگرن بە اللە لە سزای گۆڕ) .

---

: **رواه أحمد (٢١١٤٦)**، ئیسنادەکەی صەحیحە .

**٢٩٦** - حدثنا مُسدَّد، قال : حدثنا يحيى بن سعيد، عن هِشام بن حسَّان، عن حُميد بن هلال، عن أبي الدَّهماء، عن عِمران ابن حُصين، قال : قال رسول الله ﷺ : مَن سَمِعَ بالدَّجالِ فليَنأ منهُ مرَّتين أو ثلاثة فإنَّ الرَّجُلَ يأتيه فيحسَبُ أنَّهُ مؤمِنٌ، فيرى ما مَعَهُ مِن الشُّبُهات فيتَّبِعُهُ .

**٢٩٦** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەسێک گوێی لە دەجال بوو - واتە زانی کە دەجال هاتووە - ئەوا با خۆی لێ بەدوور بگرێت، دووجار یان سێ جار ئەمەی فەرموو، چونکە پیاوێک دێتە لای دەجال گوایە ئیماندارە، دەبینێت کە چی لەگەڵدایە لە گومان و شوبهە، ئەوا ئەویش شوێنی دەکەوێت) .

---

: واتە گوایە ئیماندارە و دەچێت بەڕووی دەجال دەوەستێ، بەڵام کە شووبهەکانی دەجال دەبینێت ئیتر ئەویش شوێنی دەکەوێت، **رواه أحمد (١٩٨٧٥)**، ئیسنادەکەی صەحیحە .

**٢٩٧** - حدثنا محمد بن إبي بكر، قال: حدثنا يحيى بن سعيد، عن عُيينة بن عبد الرحمن، عن أبي بكرة، أن النبي ﷺ قال: الدَّجَّالُ مكتوبٌ بين عينيهِ: كافِرٌ، يقرأهُ الأُمِّي والكاتِب.

**٢٩٧** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دەجال لە نێوان چاوەکانی نوسراوە کافر، هەموو کەسێکی خوێندەوار و نەخوێندەوار دەتوانێت بیخوێنێتەوە).

---

: **رواه أحمد (٢٠٤٠١)**، ئیسنادەکەی صەحیحە.

**٢٩٨** - حدثنا هِشام بن عَمَّار، قال: حدثنا يحيى بن حمزة، قال: حدثنا الأوزاعي، عن إسحاق بن عبد الله بن إبي طلحة، عن أنس بن مالك، أن رسول الله ﷺ قال: يتَّبعُ الدَّجَّالَ مِن يهودِ أصبهانَ سبعون ألفًا، عليهم الطَّيالِسَة.

**٢٩٨** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (لە أصبهانەوە حەفتا هەزار کەس لە یەهود شوێنی دەجال دەکەون، عەبای تەیاڵیسیان بەسەر شانەوەیە).

---

: الطيالسة عەبایەکی سەوزە وردەکاریی و درووماني زۆری پێوەنیە، شێخ و زانایان لەبەری دەکەن، **رواه مسلم (٧٥٠٢)**.

**٢٩٩** - حدثنا عُبيد الله بن محمد بن حفص، قال: حدثنا عبد العزيز ابن مسلم، عن الأعمش، عن عطية، عن أبي سعيد الخدري، قال: قال رسول الله ﷺ يحدثنا عن الدَّجَّالِ: ألستُ بربِّكَ؟

فيقول: كذبتَ، ما كُنتَ قطُّ أكذبَ مِنكَ السَّاعة.

قال: فما كُنَّا نراهُ إلَّا عن عُمر بن الخطاب.

**٢٩٩** - أبي سعيد الخدري فەرمووى: رسول الله ﷺ دەربارەى دەجال بۆى باس دەكردين، فەرمووى: (دەجال دەسەڵاتى دەبێت بەسەر كەسێك كە دەيكوژێت، پاشان زيندووى دەكاتەوە، فەرمووى: دەجال دەڵێت: ئايە من پەروەردگارت نيم؟

دەڵێت: درۆت كرد، هەرگيز وەك ئەم ساتەى ئێستات درۆزن نەبوويت).

ووتى: هيچ جارێكى تر ئەم وەسفەمان نەدەبينى ئيللا لە عمر بن الخطاب ەوە نەبێ رضي الله عنه.

# باب : (١٣)

# باب في فتنة القبر

# دەربارەی تاقیکردنەوەی گۆڕ



**٣٠٠** - حدثنا أبو خالد يزيد بن مِهران الخبَّاز، قال: حدثنا أبو بكر ابن عياش، عن الأعمش، عن أبي سفيان، عن جابر، قال: قال لي رسول الله ﷺ: إذا أُدخِلَ العبدُ قبرَهُ أتاهُ ملكان، فينتهرانِهِ، فيقومُ يهبُّ كما يهبُّ النَّائمُ، فيقولانِ له: مَن ربُّك؟ فيُجِيبُ. فيقالُ: صدقتَ، كذلك كُنتَ، افرِشُوه مَن الجنَّةِ، وأَلبِسُوهُ مِنها، فيقول: دَعوني أُخبر أهلي. فيقالُ له: اسكُن.

**٣٠٠** - جابر وتی: رسول الله ﷺ پێی فەرمووم: (کاتێک بەندە دەخرێتە ناو گۆڕەکەیەوە دوو فریشتە دێنە لای، دەیبەن، بەتوندی هەڵیدەسێنن, ئەویش هەڵدەستێ وەک چۆن کەسێک لەخەو هەڵدەستێ، پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێیە؟ ئەویش وەڵام دەداتەوە.

پێی دەڵێن : ڕاستت کرد، بەم شێوەیە بوویت، لە ڕایەخی بەهەشتی بۆ ڕاخەن، وە لە جل و بەرگی بەهەشت بەبەریدا بکەن، ئەویش دەڵێت : لێمگەڕێن با هەواڵ بدەمە کەسوکارم، پێی دەوترێ : ئارام بە و لەشوێنی خۆت بمێنەوە) .

---

: **رواه ابن أبي عاصم (السنة : ٨٩٢)** کە حەدیسەکە صەحیحە .

**٣٠١** - حدثنا يحيى الحِمَّاني، قال : حدثنا حماد بن شُعيب، قال : أخبرني يُونس بن خبَّاب، قال : أخبرني من سَمِعَ ميَتًا يُسألُ في القبر، فقيل له : مَن رَبُّك؟ ومَا دِينُك؟

**٣٠١** - یونس بن خبَّاب ووتی : هەواڵم پێگەیشتووە هەر کەسێک گوێی لەمردوو بێت، ئەوا لەناو گۆڕ پرسیاری لێ دەکرێت، پێی دەوترێ : پەروەردگارت کێیە؟ وە دینت چییە؟

**٣٠٢** - حدثنا أحمد بن يُونس، قال : حدثنا ليث بن سعد، عن نافع، عن عبد الله، عن رسول الله ﷺ أنَّه قال : ألَا إنَّ أحدَكُم إذا ماتَ عُرِضَ عليهِ مقعَدُهُ بالغدَاةِ والعشيِّ، إن كان مِن الجنَّةِ، فمِن الجنَّةِ، وإن كانَ مِن النَّارِ، فمِن النَّارِ، حتَّى يبعثَهُ اللّهُ يومَ القيامَةِ .

**٣٠٢** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (بزانن هەریەک لەئێوە کاتێ مرد ئەوا شوێنەکەی پیشان دەدرێت بە بەیانیان و ئێواران، ئەگەر لە بەهەشت بێت، ئەوا

شوێنەکە خۆی دەبینێت لەبەهەشت، وە ئەگەر لەدۆزەخ بێت، ئەوا شوێنەکەی خۆی دەبینیت لە دۆزەخ، تاوەکو الله تعالی ڕۆژی قیامەت زیندووی دەکاتەوە) .

: رواه مسلم (٧٣١٣)، والبخاري (١٣٧٩) .

## باب : (١٤)

# باب في حوض

# دەربارەی حەوز



**٣٠٣** - حدثنا محمود بن خالد، قال : ثنا مروان بن محمد، قال : ثنا محمد بن مُهَاجِر، قال : حدثني العباس بن سالم، عن أبي سلام الحبشي، قال : ثنا ثوبان مولى رسول الله ﷺ، أنَّ رسول الله ﷺ قال : إنَّ حوضي ما بين عدنَ إلى أيلةَ، أشدُّ بياضًا مِن اللَّبنِ، وأحلى مِن العسلِ، أكاوِيبهُ كعددِ نُجومِ السَّماءِ، مَن شَرِبَ منهُ شربةً لم يَظمأ بعدَها أبدًا .

**٣٠٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (حەوزی من فراوانیەکەی وەک نێوان عدن تاوەکو أيلة یە، کە سپی ترە لە شیر، وە شیرینترە لە هەنگوین، ژمارەی کوپەکانی وەک ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە، هەرکەسێک یەکجار لێی بخواتەوە دوای ئەوە هەرگیز تینووی نابێتەوە) .

---

: رواه أحمد (٢٢٣٦٧) .

٣٠٤ - حدثنا يحيى بن عثمان قال : ثنا أبو المُغيرة، ثنا الأُحمُوسي عُمر بن عَمرو، قال : حدثنا المُخارِق بن أبي المُخارِق، عن عبد الله بن عُمر، أنَّه سمِعه يقول : إن النبيَّ قال ﷺ : إِنَّ حوضي كما بين عدنَ وعمَّانَ، أبردُ من الثَّلجِ وأحلى مِن العسلِ، وأطيِبُ رِيحًا مِن المسكِ، أَكوابُهُ مَثلُ نُجومِ السَّماءِ، مَن شرِبَ مِنه شربَةً، لم يَظمأ بعدَها ابدًا .

٣٠٤ - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (حەوزی من فراوانیەکەی وەکو نێوان عدن و عمان ە، لە بەفر ساردترە، وە لە هەنگوین شیرینترە، وە بۆنەکەی لە میسک خۆشترە، وە ژمارەی کوپەکان بەوێنەی ئەستێرەکانی ئاسمانە - واتە ئەوەندە ژمارەیان زۆرە، بەقەد ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانە - ، هەر کەسێک یەکجار لێی بخواتەوە ئەوا بۆ هەمیشە تینووی نابێت) .

---

: رواه أحمد (٦١٦٢) .

## باب : (١٥)

## باب في الصراط

## دەربارەی پردی صیراط



**٣٠٥** - حدثنا محمد بن الوزير الدمشقي، قال : ثنا الوليد بن مُسلم، قال : ثنا ابن جابر، قال : حدثني ابو سعيد، جليس لأبي هريرة، قال : سمعت أبا هريرة، يقول : قال رسول الله ﷺ : الصِّراطُ بين ظهريّ جهنَّم، دَحضُ مَزلَّة، الأنبياءُ والملآئكةُ عليهم السَّلام عليه يقولون : اللَّهم سَلِّم سَلِّم، والنَّاس يمرُّون كلمعِ البرقِ، وكطرفِ العينِ، وكجيادِ الخيلِ، والرَّكابِ، والبِغالِ، وشدًّا على الأقدامِ، فناج مُسلَّم، ومخدُوش مُرسل، ومَطروح فيها، ولها سبعةُ أبواب، لكُلِّ باب مِنهم جُزءُ مقسُوم .

**٣٠٥** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (پردی صراط لەسەر پشتی جەهەننەمە، شوێنی پێ خلیسكانە، فریشتەكان و پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت دەفەرموون : خوایە سەلامەتمان بكە خوایە سەلامەتمان بكە، وە خەڵكی بەسەریدا تێپەڕدەبن وەك ترووسكەی بروسك و چاو تروووكان، وە وەك غاردانی ئەسپ و وشتر و ماین، وە بەقورسی لەسەر پێیەكان - واتە هەیە قورسە لەسەر پێیەكانی

كە بەسەریدا تێپەڕ دەبێت - ، هەیە ڕزگاربووە و سەلامەتكراوە، وە هەیانە بریندار بووە، وە هەیانە دەخرێتە ناویەوە، حەوت دەرگای هەیە، بۆ هەر دەرگایەكیش دەستەیەك لە پەیڕەوانی شیطانی بۆ دیاریكراوە) .

**٣٠٦** - ثنا بشر بن مُعاذ، قال: حدثنا عبد الواحد بن زياد، قال: ثنا عبد الرحمن بن إسحاق، عن النُّعمان بن سعد، قال: سمعت المُغيرة بن شُعبة يقول على المنبر، عن النبي عليه الصَّلاة والسَّلام قال: شِعَارُ المُسلِمين يَومَ القيامَةِ على الصِّراطِ: اللَّهم سَلِّم سَلِّم .

**٣٠٦** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (شیعار و درووشمی مسوڵمانان لەڕۆژی قیامەت لەسەر پردی صراط بریتییە لە: اللهم سلِّم، اللهم سلِّم) .

---

: یا الله سەلامەتم بكە، یا الله سەلامەتم بكە، **رواه الترمذي (٢٤٢٣)** .

# باب : (١٦)

# باب في الميزان

# دەربارەی تەرازوو



**٣٠٧** - حدثنا زَيْد بن يزيد، قال ثنا مُؤمَّل بن إسماعيل، قال : ثنا عبَّاد، قال : ثنا ابو الزُّبير، عن جابر بن عبد الله، قال : قال رسول الله ﷺ : يُوضع المِيزانُ يَوْمَ القِيامَةِ، فتُوزنُ الحسناتُ والسِّيئاتُ، فَمن رَجَحت حسناتهُ على سيئاتِهِ خردَلَةً دخلَ الجنَّةُ، ومن رَجَحت سَيئاته على حسناتِهِ مِثقالَ خَردَلة دَخلَ النَّار .

فقال رجلٌ : يا رسول الله ﷺ : فمَن استوت حسناتُه وسيئاته؟

قال : أولئكَ أصحابُ الأعرافِ لم يدخُلوها وهُم يَطمعون .

**٣٠٧** - رسول الله ﷺ فەرموويەتی : (تەرازوو لەڕۆژی قیامەت دادەنرێت، چاکەکان و خراپەکان دەکێشرێت، هەر کەسێک بەقەد یەک دەنکە خەردەلە چاکەکانی لە خراپەکانی زیاتربێ ئەوا دەخرێتە بەهەشتەوە، وە هەر کەسێک بەقەدەر یەک مسقاڵ لە خەردەلە خراپەکانی زیاتر بوو لە چاکەکانی ئەوا دەخرێتە ناو ئاگر) .

پیاوێک ووتی : یا رسول الله ﷺ کێ هەیە کە چاکەکان و خراپەکانی یەکسان بن؟

فەرمووی : (ئەوانە هاوەڵانی ئەعراف ن کە ناخرێنە ناویەوە و بەتەمان بچنە ناویەوە - ناو بەهەشت - ، چونکە خوا تەماحی ناوەتە بەریان) .

**٣٠٨** - حدثنا هِشام بن عمَّار، قال : ثنا سعيد بن يحيى، عن عبدالملك بن ابي سُليمان، عن عَمرو، عن الحسن، أنَّهُ سُئل عن المِيزان؟

فقال : نعم، له للسانٌ وكفَّتان .

**٣٠٨** - حسن پرسیاری لێکرا دەربارەی تەرازوو؟

ووتی : بەڵێ تەرازوو حەقە و ڕاستە، وە زمان و دوو تای هەیە .

---

: **روى اللالكائي** (٢٢١٠) .

## باب : (١٧)

## باب في الصور

## دەربارەی نەفخی صور



**٣٠٩** - حدثنا أبو الرَّبيع الزهراني، قال: حدثنا يحيى بن سعيد بن أبان بن سعيد بن العاص، قال: حدثنا الأعمش، عن عطيَّة العوفي، عن أبي سعيد الخدري، قال: قال رسول الله ﷺ: جِبريلُ عن يَمِينِهِ، ومِيكائِيل عن شِمَالِهِ، وإِسرافِيل صَاحِبُ الصُّورِ.

**٣٠٩** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (جبریل لە لای ڕاستە، وە میکائیل لە لای چەپ، وە إسرافیل خاوەنی نەفخی صور ە).

---

: واتە لە لای ڕاستی الله سبحانە وتعالی جبریلە، وە لە لای چەپی میکائیلە، علیهما السلام، والله اعلم، **رواه أحمد** (١١٠٦٩)، **وأبو داود** (٣٩٩٨)، ئیسنادەکەی ضعیفە.

**٣١٠** - حدثنا محمد بن أبي بَكر، قال : ثنا بِشر بن المُفَضَّل، عن عوف، عن أبي منهال، عن آبي العالية، عن ميمون الكِندي، قال : إن صاحِبَ الصُّورِ قد دُفِعَ إليه الصُّورُ، وقد قَدَّمَ إحدى رَجليهِ، وأخَّر الأُخرَى، مُستَعِدٌ متى يؤمرُ فينفخُ فيه .

**٣١٠** - ميمون الكندي ووتى : بەڕاستی خاوەنی صور - قۆچێکە فووی پیادەکات - صورەکەی پێدراوە، وە قاچێکی پێشخستووە هێناویەتییە پێشەوە، وە قاچەکەی تری پاشخستووە لەدواوە، ئامادەیە تاوەکو هەرکاتێک فەرمانی پێکرا فووی پیا بکات .

---

لە ابن عباس ـەوە رضي الله عنهما : ﴿**فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ**﴾ [**المدثر** : ٨] :

رسول الله ﷺ فەرمووی : (چۆن لە ناز و نیعمەتدا بژیم، کە خاوەنی کەڕەنا و شەیپوور - واتە ئیسرافیل - شەیپووری بەدەستەوەیە و خۆی چەماندۆتەوە ، و گوێ دەگرێ بۆ ئەوەی بزانێت کەی فەرمانی پێ بکرێ و فووی پیادا بکات) .

پاشان هاوەڵانی رسول الله ﷺ وتیان : ئەی چی بڵێین؟

فەرمووی : (بڵێن الله مان بەسە و باشترین کەسە کارەکانمانی پێ بسپێرین، وە پشتمان بەو بەستووە)، **رواه أحمد** (٣٠٠٨)، **وابن أبي شيبة** (٣٠٠٨١)، حەدیسەکە صحیحە .

# باب : (١٨)

# باب في القلم

# دەربارەی قەڵەم



٣١١ - حدثنا هِشام بن عمَّار الدَّمشقي، قال : حدثني الجرَّاح بن مليح، قال : ثنا أرطأة بن المنذر، عن جعفر بن إياس، عن مجهاد، عن ابن عباس، قال : أولُ ما خلقَ الله القلمَ، فأخذه بيمينِهِ، وكِلتا يديه يمينٌ، ثُمَّ خلق النُّون وهي الدَّواةُ، ثُمَّ خلقَ الألواحَ، فكتبَ فيها الدنيا وما يكونُ فيها، حتَّى تنفى من خلق مخلوق، أو عمل معمول، برًّ أو فجور، أو رزق مِن حلال أو حرام، أو أثر أو رطب أو يابس، ثُم ألزم كُلّ شيء من ذلك شأنَّه وبقاءه فيها وفناءه حتَّى يفنى، ثُم جعلَ على ذلك الكتاب حفظةً مِن الملائكة، وعلى الخلقِ حفظةً، فتأتي ملائكةُ الخلقِ ملائكة ذلك الكتابِ، فيُلقون إليهم النُّسَخَ بما يكون في كلَّ يوم وليلة مِن ذلك، فتهبط ملائكة الخلقِ إلى الخلقِ فيحفظونهم بأمرِ الله، ويسوقونهم إلى ما في أيديهم مِن تلك النُّسَخِ، حتَّى إذا استكملَ كلُّ شيء مِن ذلك شأنهُ في كلِّ يوم وليلة انقطعَ، فلم يكن لها مقامٌ ولا بقاء .

ثم تلا : ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنْسِخُ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ [الجَاثيَة : ٢٩] .

فقال رجلٌ : يا أبا عباس، ماكُنَّا نرى النَّسخَ إلاَّ فيما تحفظ علينا الملائكةُ في كُلِّ يوم وليلة؟

قال : ألستُم قومًا عَربًا؟! تكون نُسخةٌ إلاَّ من كتاب قد سبقَ؟

ثُمَّ قرأ : ﴿**وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ**﴾ **[الأنعَام : ٥٩]** .

فقال : جمع الرَّطبُ واليابسُ كُلَّ شيء .

**٣١١** - إبن عبّاس ووتی : یەکەم شت کە الله درووستی کرد قەڵەم بوو، بە دەستی ڕاستی گرتی، وە هەردوو دەستەکانی ڕاستن، پاشان نونی درووست کرد کە ئەویش قوتووی مەرەکەبەکەیە، پاشان ئەلواحی درووست کرد، هەموو ئەو شتانەی نوسی کە لە دونیادایە نووسی وە ئەوەشی کە تێدا ڕوودەدات، تاوەکو کۆتایی پێ دێت لە ڕەفتاری درووستکراو، یان کردەوەیەکی کردەوە پێکراو، چاکە یان خراپە، یاخود ڕزق و ڕۆزی لە حەڵاڵ یان حەرام، یان شوێنەوارێک یان تەڕێک یان وشکێک، پاشان هەر یەکێک لەمانەی پابەندکرد بە کاروباری خۆی و مانەوەی تێیدا و لەناچوون و نەمانی تێیدا هەتا ئەو کاتەی کە نامێنێت، پاشان لەسەر ئەم کتێبە - لوح المحفوظ - فریشتەی پارێزەری دانا، وە لەسەر درووستکراوەکانیش پارێزەری دانا، پاشان فریشتەکانی درووستکراوەکان دەچنە لای فریشتەکانی کتێبەکە، ئەوانیش نەسخ و لەبەرگرتنەوەی هەموو ئەوانەیان پێدەدەن کە لە هەر ڕۆژ و شەوێکدا دەبێت و ڕوودەدا، فریشتە درووستکراوەکانیش دەچنەوە لای درووستکراوەکان و دەیانپارێزن بە ئەمر و فەرمانی الله، وە پەلکێشیان دەکەن بۆلای ئەوشتەی کە لەژێر دەستیانە لەم

نەسخ و لەبەرگیراوانە، هەتا ئەو كاتەی هەموو شتێك تەواو دەبێ لەوەی كە لە هەموو ڕۆژ و شەوێكدا دەبێت و ڕوودەدات دوای ئەوە دەپچڕێت، بۆیە چیتر هیچ پێگەیەك وە مانەوەیەكی بۆ نامێنێت .

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿**إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ**﴾ [**الجاثِية : ٢٩**] .

پیاوێكیش ووتی : ئەی باوكی عباس، ئێمە وا دەمانبینی نەسخ كردن نیە ئیللا لەوەی فریشتەكان لەسەرمان دەینووسن و دەیپارێزن لەهەموو ڕۆژ و شەوێكدا ؟

ووتی : ئایا ئێوە قەومی عەرەب نین؟! ئایا نوسخە و كۆپی كردن لەشتێكدا دەبێ ئیللا لە كتێبێك نەبێ كە پێشتر هەبووە؟

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿**وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ**﴾ [**الأنعَام : ٥٩**] .

پاشان ووتی : كۆكراوەی تەڕ و وشك هەموو شتێك .

---

: رواه **ابن بطة له (الإبانة الكبرى له بابى القدر : ١٣٧٥)، والآجري له (الشريعة : ٣٣٩)** لە ابن عمر رضي الله عنه لە پێغەمبەر ﷺ، وە ئیسنادەكەی صحيحه .

**٣١٢** - حدثنا أبو معن الرَّقاشي، قال : حدثنا مُعتمر بن سُليمان، قال : سمعت عِصمة أبا عاصم، يُحَدِّث عن عطاء بن السَّائب، عن مِقسَم، عن ابن عباس، قال: أوَّل

ما خلقَ اللَّهُ القلمَ مِن هِجاء : (ق، ل، م)، قال : فتصوَّرَ قلمًا مِن نُور، طوله كما بين السَّماءِ والأرضِ، فقال : اجرِ في اللوح المحفوظ .

قال : ربِّ بماذا؟

قال : بكُلِّ شيء يكون إلى قيامِ السَّاعةِ .

فلمَّا خلقَ اللَّهُ خلقَ، ووكَّل ملائكةً يحفظون أعمالهم، فإذا كان يوم القيامةِ عُرضت اعمالهم عليهم، قيل : ﴿**هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ**﴾ [**الجَاثية : ٢٩**] مِن اللَّوحِ المحفوظ .

فَعُرِضَ بين الكتابين فإذا هما سَواء .

**٣١٢** - ابن عباس ووتی : يەكەم شت الله قەڵەمی دروستكرد لە ئەلفوبێ (ق، ل، م)، وتی : وێنەی قەڵەمێک لە نور و ڕووناکی وێنابکە لەخەیاڵت، درێژییەکەی وەک نێوان ئاسمان و زەوییە، پاشان الله فەرمووی : برۆ لە لوح المحفوظ دا .

قەڵەم ووتی : ئەی پەروەردگارم بەچی برۆم؟

الله فەرمووی : بە هەموو شتێک کە ڕوودەدا و دەبێ هەتا بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت .

کاتێک الله دروستکراوەکانی بەدیهێنا، وە فریشتانێکی ڕاسپارد کارو کردەوەکانیان بپارێزن و هەڵیبگرن، هەتا کاتێک ڕۆژی قیامەت هات کارو

کردەوەکانیان نیشاندەدرێتەوە، وترا : ﴿هَٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ [الجاثِية : ٢٩] .

واتە : ئەمە ئیتر نامەی کردەوەکانتانە کە تۆمارمان کردووە لەسەرتان، خۆی گوایە قسە دەکات و حەق بێژە - دیارە کردەوەکانمان تۆمار کراوە لەسەر دەزگای زۆر پێشکەوتوو - چونکە بەڕاستی ئێمە کاتی خۆی ئەوەی ئێوە دەتانکرد لەبەرمان دەگرتەوە، لە لوح المحفوظ دا .

وە هەردوو کتێبەکە نیشاندەدرێن دەبینن وەک یەکن

---

: مەبەست لە دووکتێبەکە والله اعلم کتێبی کاروکردەوەکانیان لەگەڵ لوح المحفوظ، **رواه ابن بطة له (الإبانة الكبرى له بابی قەدەر : ١٣٧٦)، والآجري له (الشريعة : ١٨٤ و ٣٤٨)**، ئیسنادی حەدیسەکە صحيحه .

**٣١٣** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : هُشيم، قال : أخبرنا منصور بن زاذان، عن الحكم بن عُتَيبة، عن أبي ظبيان، عن إبن عباس، قال : أوّلُ ما خلقَ اللَّهُ القلمَ، فأمرَهُ أن يكتُبَ ماهو كائنٌ، فكتبَ فيما كتبَ :

﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ [المسد : ١]

**٣١٣** - ابن عباس ووتی : یەکەم شت الله قەڵەمی درووستکرد، فەرمانی پێکرد ئەوە بنووسێ کە ڕوودەدا و دەبێ، لەو شتانەی کە نووسی ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ [المَسَد : ١] .

واتە : دەستەکانی بشکێت ئەبو لەهەب و ڕسوا بێت، ئاشکرایە کە هەر ڕسوایش دەبێت و - لەناو دەچێت - .

---

: **رواه عبد الله (السنة : ٨٤٨)**، **والخلال (السنة : ١٨٨٩)**، ئیسنادەکەی صحیحە .

# باب : (١٩)

# باب في الشفاعة

# دەربارەی شەفاعەت



**٣١٤** - حدثنا محمد بن الوزير، قال: ثنا الوليد بن مُسلم، قال: حدثنا ابن جابر، أنه سمع سُليم بن عامر الكَلاعي يُحدَّث عن عوف بن مالك الأشجعي، انَّهُ سمعه يقول: سمعت رسول الله ﷺ: ذكرَ ما أعطاهُ الله مِن الشَّفاعةِ، فقلت: نشدتُكَ يا رسول الله والصَّحابة لمَاَ سألت الله أن يجعلني مِن أهلِها.

قال: يا عوفُ إنَّ شفاعتي يومَ القيامةِ لكُلِّ مُسلم.

**٣١٤** - عوف بن مالک الأشجعي دەڵێت: رسول الله ﷺ باسی ئەوەی کردووە کەچی پێ بەخشراوە لە شەفاعەت، ووتم: داوات لێدەکەم یا رسول الله بەوەی کە داوا لە الله تعالی بکەی کە من بگێڕێت لە ئەهلەکەت.

فەرمووی: (ئەی عوف، بەڕاستی شەفاعەتی من لەڕۆژی قامەتدا بۆ هەموو مسوڵمانێکە).

: **رواه أحمد** (٢٤٠٠٢)، **والترمذي** (٢٤٤١)، ئیمام حرب رحمه الله لەپێشوودا ئاماژەی بەوەدا كە ئیجماعی سەلەف هەیە لەسەر جێگیر كردنی شەفاعەت .

لە مالك بن الأشجعي رضي الله عنه كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (شەوێكیان نیشانەیەك هاتە لام لەلایەن پەروەردگارمەوە، سەرپشكی كردم لە نێوان ئەوەی كە نیوەی ئومەتەكەم بچنە بەهەشت یان شەفاعەت، من شەفاعەتم هەڵبژارد) .

وتمان : داوات لێدەكەین بەوەی كە داوا لە الله تعالى بكەی بەوەی ئێمە بگێڕێت لە ئەهلی شەفاعەتی تۆ .

فەرمووی : (ئێوە لە ئەهلی شەفاعەتی منن) .

وە فەرمووی : (من شایەتیتان بۆ دەدەم بەوەی كە شەفاعەتی من لە ئومەتەكەم بۆ ئەوانەیە كە بەهیچ شێوەیەك شیركی بۆ الله دانەناوە) .

**رواه ابن خزيمة** (٣٨٦)، حەدیسەكە صحیحە .

## باب : (٢٠)

# باب في الموت

# دەربارەی مردن



**٣١٥** - حدثنا سعيد بن منصور، قال: حدثنا أبو مُعاوية عن الأعمش، عن أبي صالح، عن أبي سعيد الخدري، قال: قال رسول الله ﷺ: يُجاءُ بالموتِ يومَ القيامةِ كأنَّه كبشٌ أملحُ، فيُوقفُ بين الجنَّةِ والنَّارِ، فيقال: يا أهل الجنَّةِ أتعرفون هذا؟ فيشرَئِبُّون، وينظرون فيقولون: نعم، ويقال: يا أهلَ النَّارِ، أتعرفون هذا؟ فيشرَئِبُّون، وينظرون، ويقولون: هذا الموتُ، فيؤمرُبه فيُذبحُ، ثم يقال: يا أهلَ الجنَّةِ، خلودٌ فلا موت، ويا أهلَ النَّارِ، خلودٌ فلا موتَ.

ثم قرأ رسول الله ﷺ: ﴿**وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ**﴾ [مريم: ٣٩].

**٣١٥** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا مردن دەهێنرێت لەسەر شێوەی بەرانێکی خۆڵەمێشی، دەوەستێنرێت لەنێوان بەهەشت و دۆزەخ، دەوترێت: ئەی ئەهلی بەهەشت ئایا ئەمە دەناسن - مەبەست پێی مردنەکەیە کە ئەیناسن - ؟

ئەوانیش سەریان بەرز دەکەنەوە و سەیری دەکەن دەڵێن : بەڵێ .

وە بە هلی دۆزەخ دەوترێت : ئایە ئەمە دەناسن؟ ئەوانیش سەریان بەرز دەکەنەوە و سەیری دەکەن دەڵێن : ئەمە مردنە، فەرمان دەکرێت بە سەربڕینی، پاشان دەوترێ : ئەی ئەهلی بەهەشت، بمێننەوە بۆ تا هەتایی مردن نییە، وە ئەی ئەهلی ئاگر بمێننەوە بۆ تا هەتایی و مردن نییە) .

پاشان رسول الله ﷺ ئەمەی خوێندەوە : ﴿**وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ**﴾ **[مريم : ٣٩]** .

واتە : ئەی پێغەمبەر ﷺ، ستەمکاران ئاگادار بکە لە ڕۆژی ئاهو ناڵە و پەشیمانی کاتێک کار لە کار ترازاوە، لەکاتێکدا ئەوانە لە غەفڵەتدان و باوەڕ ناهێنن .

---

: **رواه البخاري** (٤٧٣٠)، **ومسلم** (٧٢٨٣) .

**٣١٦** - حدثنا محمد بن عبد الأعلى، قال : حدثنا مُعتمر بن سليمان، قال : سمعتُ محمد بن عمرو، عن أبي هريره، آن نبي الله ﷺ قال : يؤتى بالموتِ يومَ القِيامَةِ فيُوقَفُ على الصَّراطِ فيُقالُ : يا أهل الجنَّةِ فيطَّلِعون خائفين وجِلينَ أن يُخرجوا مِن المكانِ الذي هُم به .

ثُم يُقالُ : يا اهل النَّارِ، فيطَّلِعُون فرِحين مُستبشِرِين أن يخرجوا مِن المكانِ الذي هم فيهِ .

فيُقالُ : هل تعرِفون هذا؟

فيقولون : نعم ربَّنا، هذا الموتُ .

فيؤمرُ به فيذبحُ على الصَّراطِ، ثُم يُقالُ : للفرِيقين كلاهُما : خلودٌ فيها تَجِدون لا موتَ فيها ابدًا .

**٣١٦** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (لە ڕۆژی قیامەتدا مردن دەهێنرێت و دەوەستێنرێت لەسەر پردی صیراط، دەوترێت : ئەی ئەهلی بەهەشت، ئەوانیش بەترسەوە سەیر دەکەن و دەترسن دەربهێنرێن لەو شوێنەی کە ئەوان لەوێن .

پاشان دەوترێت : ئەی ئەهلی دۆزەخ، ئەوانیش سەیر دەکەن بەدڵخۆشی و مژدەوە کەوا دەرچن لەو شوێنەی کە تێیدان .

پێیان دەڵێن : ئایە ئەوە دەناسن؟

دەڵێن : بەڵێ ئەی پەروەردگارمان، ئەوە مردنە .

بۆیە فەرمان دەکرێت پێی و سەردەبڕدرێ لەسەر صیراط، پاشان بە هەریەکە لە دوو گرووپەکە دەوترێت : بۆ تا هەتایی دەمێننەوە لەوەی تێیدان هەرگیز مردنی تێدا نییە) .

: **رواه أحمد** (٧٥٤٦)، **وابن ماجه** (٢٦٤/٤)، حهديسهكه صحيحه .

## باب : (٢١)

# باب في الجنة والحور العين

# دەربارەی بەهەشت و حۆرییەکان



**٣١٧** - حدثنا المُسيّب بن واضح، قال : حدثنا الحكم بن محمد، عن عطاء، قال حرب : هو الحكمي، عن ليث، عن مجاهيد، قال : الحورُ العين خُلقنَ مِن الزَّعفران .

قال المُسيّب : فقلت للحكم : فيأكلن، و يشربن اليوم؟

فقال : لا، ليس، يأكُلنَ، ولا يشربنَ حتَّى يأتى اليومُ الذي يأكُلنَ فيه، ويشربنَ، وينعمنَ مع أهلِ الجنَّة .

قال : ولا يموتون، ولا ينصعقون يوم القيامة، ولا يموت شيء في الجنَّةِ، ولا يموتُ شيء مما خلق الله فيها، إنَّما يموتُ ما خُلِقَ في هذه الدَّارِ الفانية، وأمَّا تلك الدَّاران الجنَّة والنَّار، فإنَّه يزيد كُلُّ شيء فيهما، ولا يُنتقص منهما شيء .

**٣١٧** - مجاهد ووتى : حۆرییەکان درووستکراون لە زەعفەران .

مسیب یش ووتى : ووتم بە حكم : ئایا ئەمڕۆ دەخۆن و دەخۆنەوە؟

ووتی : نا، ناخۆن، وه ناخۆنەوه هەتا ئەو ڕۆژه دێ کە دەخۆن و دەخۆنەوە، وه بەهەرەوەر دەبن لەگەڵ ئەهلی بەهەشت .

ووتی : وه ناشمرن، وه ئەو کاتەش کە فوو دەکرێ بەصوردا و بوونەوەران دەمرن ئەوان نامرن، وه هیچ شتێک لەبەهەشتدا نامرێ، وه هیچ شتێک لەوانەی الله دروستیکردوون تێیدان نامرن، بەڕاستی تەنها ئەوانە دەمرن کە لەم ماڵە لەناوچووەدا دروستکراون، ئەمما ئەم دوو ماڵەش بەهەشت و دۆزەخ، بەڕاستی هەموو ئەوانەی تێیدان زیاد دەکەن، وه هیچ شتێک تێیاندا کەم ناکەن .

**٣١٨** - حدثنا إسحاق بن إبراهيم، قال حدثنا جرير، قال : حدثنا العلاء بن المُسيب، عن فُضيل بن عَمرو، عن عائشة بنت طلحة، عن عائشة، قالت : قال رسول الله ﷺ : إِنَّ الله خلقَ الجنَّةَ، وخلقَ لها أهلاً، وخلقَ النَّارَ، وخلقَ لها أهلاً .

**٣١٨** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (الله تعالى بەهەشتی دروست کردووه، وه بۆ بەهەشت کۆمەڵێکی دروست کردووه - واتە بۆ ئەوەی بچنە ناویەوە - ، وه دۆزەخیشی دروست کردووه، وه بۆ دۆزەخ کۆمەڵێکی دروست کردووه) .

---

: **رواه مسلم** (٦٨٦٢) .

**٣١٩** - حدثنا ابو الرَّبِيع الزهراني، قال : حدثنا يعقوب، قال : أخبرنا حفص بن حُميد، عن شِمر بن عطيَّة، قال : خلقَ اللَّهُ جنَّةَ الفِردوسِ بيدِهِ، فهو يفتحُها في كُلِّ خمسٍ، فيقول : ازدادي طيبًا لأوليائي .

**٣١٩** - شمر بن عطية ووتى : الله تعالى بەهەشتى فیردەوسی بەدەستی خۆی درووست كردووە، هەموو پێنجشەممەیەك دەیكاتەوە، دەفەرمووێ : جوانتر و خۆشتربە بۆ دۆست و ئەولیائەكانی من .

**٣٢٠** - حدثنا أبو معن، ثنا مؤمَّل، قال : حدثنا سُفيان في قوله : ﴿**كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَه**﴾ [**القصص** : ٨٨] .

قال : ما أُرِيدَ به وجهه .

**٣٢٠** - مؤمل ووتى : سفیان بۆی گێڕاینەوە دەربارەی ئەم وتەی الله تعالى : ﴿**كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ**﴾ [**القصص** : ٨٨] .

وتی : تەنها ئەوە نەبێت كە مەبەست پێی ڕووی الله یە .

---

: لەم ئایەتەدا صیفەتی ڕووخسار بۆ الله تعالى جێگیر دەكات .

**٣٢١** - حدثنا عُبيد الله بن مُعاذ، قال: حدثنا أبي قال: حدثنا محمد بن عَمرو، عن أبي سَلمة، عن أبي هريرة، قال: قال رسول الله ﷺ: لَمَا خلقَ اللَّهُ الجنَّةَ دعا جبرِيلَ، فقال: اذهب إلى الجنَّةِ فانظر إليها إلى ما أعددت لأهلِهَا فيها.

فجاءَ فنظر إليها، وإلى ما أعدَّ اللَّهُ لأهلها فيها، فرجعَ إليه، فقال: وعزَّتِكَ لا يسمعُ بها أحدٌ إلاَّ دخلها. فأمرَ بها فحُجِبت بالمكارِهِ، ثم قال: ارجع إليها فانظر اليها، والى ما أعددت لأهلِها فيها.

فرجع إليها، فإذا هي قد حُجِبت بالمكارِهِ، فرجعَ إليهِ، فقال: وعزَّتِكَ لقد خشيتُ أن لا يدخلها أحدٌ.

قال: اذهب إلى النَّارِ فانظر إليها، وإلى ما أعددتُ لأهلِها فيها، فإذا هي تَركبُ بعضُها بعضًا، فرجع إليه.

فقال: وعِزَّتِكَ لا يسمعُ بها أحدٌ فيدخلها.

فأمرَ بها فحُفّت بالشَّهواتِ، ثُم قال: ارجع إليها فانظُر إليها، وإلى ما أعددتُ لأهلِهَا فيها.

فرجع إليها فإذا هي قد حُفّت بالشَّهواتِ، فرجع إليه، فقال: وعِزتِكَ لقد خِفتُ ألاَّ ينجو منها أحدٌ إلاَّ دخلها.

**٣٢١** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (کاتێک الله بەهەشتی درووستکرد بانگی جبریل ی کرد، پێی فەرموو: بڕۆ ناو بەهەشت سەیری بکە، وە سەیری ئەو شتانەش بکە کە ئامادەم کردووە بۆ دانیشتووەکانی ناوی، جبریل یش چوو، سەیری کرد

وه سەیری ئەو شتانەشی كرد كە الله ئامادەی كردووە بۆ دانیشتووەكانی تێیدا، دواتر گەڕایەوە بۆلای الله، ووتی : سوێند بێ بە عیززەتی تۆ هیچ كەسێك نییە ببیستێ دەربارەی ئیللا دەچێتە ناویەوە، پاشان الله فەرمانی بە بەهەشت كرد ئەویش دەوردەدرا بەناخۆشی، پاشان بە جبریلی فەرموو : بگەڕێوە بۆی، سەیری بكە، وە سەیری ئەوشتانەش بكە كە ئامادەم كردووە بۆ دانیشتووەكانی ناوی، جبریل یش گەڕایەوە بۆ بەهەشت، سەیری كرد دەوردەدراوە بە ناخۆشی، پاشان گەڕایەوە لای الله و ووتی : سوێند بێ بە عیززەتی تۆ ترسام هیچ كەسێك نەچێتە ناویەوە .

پاشان الله تعالى فەرمووی : بڕۆ بۆلای دۆزەخ، سەیری بكە، وە سەیری ئەو شتانەش بكە كە ئامادەم كردووە بۆ دانیشتووەكانی ناوی، سەیری كرد بەشێكی دەچێتەوە سەر بەشێكی تری، پاشان گەڕایەوە بۆلای الله .

ووتی : سوێند بێ بە عیززەتی تۆ هیچ كەسێك نییە دەربارەی دۆزەخ ببیستێ پاشان بچێتە ناویەوە .

پاشان الله فەرمانی كرد بە دۆزەخ و پاشان دەوردەدرا بە شەهەوات و ئارەزووەكان، پاشان فەرمووی : بڕۆ سەیریكە، وە سەیری ئەوەش بكە كە ئامادەم كردووە بۆ دانیشتووان و خەڵكەكەی تێیدا .

پاشان جبریل سەیریكرد كە دەوردەدراوە بە شەهەوات و ئارەزووەكان .

پاشان گەڕایەوە لای الله، ووتی : سوێند بێ بە عیززەتی تۆ ترسام هیچ كەسێك لێی ڕزگاری نەبێ و ئیللا بچێتە ناویەوە) .

---

: **رواه أحمد** (٨٦٤٨)، **وابو داود** (٤٧٤٤)، **والترمذي** (٢٥٦٠) وه ده‌ڵێت : كه‌وا حه‌دیسێكی حسن صحيحه .

# باب : (٢٢)

# باب في كلام الله

# دەربارەی کەلام و وتەی الله



**٣٢٢** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا أبو مُعاوية، عن الأعمش، عن مُسلم، عن مسروق، قال : قال عبد الله : إذا تكلَّم الله بالوحي سمعَ أهل السَّماوات للسَّماوات صَلصَلةً كجرِّ السَّلسِلة على الصَّفا، فيصعَقُون، فلا يزالون كذلك حتَّى يأتيهم جبريل، فإذا أتاهم جبرِيل فَزِّعَ عن قلوبهم، فيقولون : يا جبريلُ، ماذا قال ربُّنا؟ فيقول : الحق فينادون : الحقَّ الحقَّ .

**٣٢٢** - عبدالله - مەبەستی عبد الله إبن مسعود ە - ووتی : کاتێک الله بەوەحی قسە دەکات - واتە کاتێک وەحی دەکات - ئەهلی ئاسمانەکان گوێیان لە زرینگانەوەیەکی ئاسمانەکان دەبێ وەک ڕاکێشانی زنجیر لەسەر بەردێکی لووسەوە، لەوکاتەدا وڕدەمێنن بەوجۆرە دەمێننەوە تاوەکو جبریل دێتە لایان، کاتێک جبریل چووە لایان سام و ترس لەدڵیان دادەمرکێ، وە دەڵێن : ئەی جبریل پەروەردگارمان چی فەرموو؟ ئەویش دەفەرمووێ : حەق و ڕاستی فەرموو، ئەوانیش بانگ دەکەن : حەق حەق .

: له كتێبی (**الرد على المبتدعة لإبن البناء : ١٥٣**) هاتووه دەڵێت :

وه له عبدالله بن مسعود ەوه رضي الله عنه وتی : كاتێك كه الله قسه دەكات به وەحی ئەوا ئەهلی ئاسمان گوێيان له دەنگەكەی دەبێت، ئینجا سوجده دەبەن .

هەتاوەكو ئەوكاتەی ترسەكەيان له دڵ نامێنێت .

ياخود وتی : دڵيان هێمن دەبێتەوه،

بەشێك له ئەهلی ئاسمان بەشێكی دیكه له ئەهلی ئاسمان بانگ دەكەن : پەروەردگارتان چی فەرمو ؟

وتيان : حەق بەم شێوەيه و بەو شێوەيه .

**البخاري له [صحيح]** كەيدا ئەم ئەثەرەی دەرهێناوه .

**٣٢٣** - حدثنا يحيى بن حبيب بن عربي، قال : أبو محمد : يحيى بن حبيب بن عربي، بصريٌّ ثقة، قال : ثنا موسى بن إبراهيم، قال : سمعت طلحة بن خِراش، يقول : سمعت جابر بن عبد الله يقول : لقيني رسول الله ﷺ فقال : يا جابرُ، مالي أراك مُنكسِرًا ؟

قال : يا رسول الله ﷺ، استُشهِدَ أبي وترك عِيالًا ودينًا، قال : أفلا أُبشِّرك بما لَقيَ اللَّهُ به أباك ؟ قال : بلى يا رسول الله ﷺ، قال : ما كلَّمَ اللَّهُ أحدًا قطُّ إلاَّ مِن وراءِ حِجاب، وأحيا أباك، فكلَّمهُ كِفاحًا، وقال : يا عبدي تمنَّ عليَّ أُعطِك .

قال : يا ربِّ تُحييني فأُقتل فيك الثَّانية .

قال الرَّبُّ تبارك وتعالى : إِنَّه قد سبقَ مِنِّي أَنَّهم إليها لا يُرجعون، قال : وأنزل الله تبارك وتعالى هذه الآية : ﴿**وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ**﴾ [**آل عمران : ١٦٩**] .

**٣٢٣** - جابر بن عبد الله دەڵێت : رسول الله ﷺ پێم گەیشت و فەرمووی : (ئەی جابر، چیتە وادەتبینم تێکشکاوی)؟

ووتی : ئەی رسول الله باوکم شەهیدبووە و ماڵ و مناڵ و قەرزی دوای خۆی جێهێشتووە .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئایا مژدەت پێ نەدەم دەربارەی ئەوەی باوکت پێی گەیشتووە لە لای الله وە؟) .

ووتی : بەڵێ ئەی رسول الله .

رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله قسەی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردووە ئیللا لەپشت پەردەوە نەبێ، وە الله باوکتی زیندووکردەوە و قسەی لەگەڵ کرد بەبێ پەردە، وە فەرمووی : ئەی بەندەکەم، ئاوات بخوازە لەسەرم پێت دەبەخشم - واتە داوای ئەوەبکە کە حەزت پێیەتی پێت دەبەخشم - .

باوکی جابریش ووتی : ئەی پەروەردگار ئاواتم ئەوەیە زیندووم بکەیتەوە و لەپێناوی تۆدا بکوژرێم جارێکی تر .

پەروەردگار تبارک و تعالی فەرمووی : پێشتر لە لایەن منەوە بڕیاردراوە و بڕاوەتەوە کە جارێکی تر هەرگیز بۆی ناگەڕێنەوە) .

ووتی : الله تعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ [آل عِمرَان : ١٦٩] .

واته : هەرگیز وامەزانن و وادامەنێن ئەوانەی لەپێناوی الله دا شەهید بوون و کوژران، مردوون، نەخێر وانییە، بەڵکو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگاریان لە ڕزق و ڕۆزیی - هەمە جۆر و تایبەت - بەهرەوەرن .

---

: رواه الترمذي (٣٠١٠) .

**٣٢٤** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : ثنا أبو مُعاوية، عن الأعمش، عن عبد الله بن مُرَّة، عن مسروق، قال : سُئل عبد الله عن قوله : ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ [آل عمران : ١٦٩]؟

قال : أما إنَّا قد سألنا عن ذلك فقيل : أرواحُهم كطير خُضر تسرحُ في الجنَّةِ في أيِّها شاءت، ثُم تأوي إلى قنادِيلَ مُعلَّقة بالعرشِ، فبينا هم كذلك، وإذا اطلع عليهم ربُّك اطِّلاعة، فقال : سلوني ماشِئتُم . قالوا : يا ربنا، ماذا نسألُك ونحنُ في الجنَّةِ نسرحُ في أيِّها شِئنا؟ فَبينا هم كذلك إذا اطَّلع عليهم ربُّك اطِّلاعة، فقال سلوني ما شِئتُم .

قالوا : يا ربنا، ماذا نسألُك ونحن في الجنَّةِ نسرحُ في أيِّها شِئنا؟ فلمَّا رأوا أنَّهم لن يُتركوا مِن أن يسألوا، قالوا : نسألُكَ أن تردَّ أرواحنا في أجسادِنا حتَّى نُقتلَ في سبيلِك مرَّةً أُخرى، فلمَّا رأى انهم لايسألون، إلاَّ هذا تُرِكوا .

**٣٢٤** - مسروق دەگێڕێتەوە، عبد الله - مەبەستی عبد الله إبن مسعود ه - پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەم ئایەتە : ﴿**وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ**﴾ [**آل عِمرَان : ١٦٩**] ؟

وتی : ئەمما ئێمە پرسیارمان کرد دەربارەی ئەوە وترا : (ڕۆحەکانیان وەک باڵندەیەکی سەوزە بڵاوە دەکات و دەفڕێ لەبەهەشت لەهەر کامێکیان بیەوێت، لە کاتێکدا لەو حاڵەتەدان، پەروەردگاریان لەناکاوێکدا دەچێتە لایان، دەفەرمووێت : هەرچییەک ویستتان داوام لێ بکەن، دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان، داوای چیت لێبکەین لەکاتێکدا ئێمە لەبەهەشتین و لەهەرکوێیەکی ویستمان دەفڕین و بڵاوەی پێدەکەین؟ کاتێک دەبینن وازیان لێناهێنرێ لەوەی داوابکەن، دەڵێن : داوا دەکەین ڕۆحەکانمان بگێڕدرێتەوە بۆ لاشەمان تاوەکو دووبارە لەپێناو تۆدا بکوژرێینەوە، بۆیە کاتێک دەبینن هیچی تر داوا ناکەن جگە لەوە، وازیان لێدەهێنرێ) .

---

: **رواه مسلم (٤٩١٩) .**

**٣٢٥** - حدثنا محمد بن الوزير، قال : حدثنا مروان بن محمد، قال : حدثنا ابن لهيعة، عن يزيد بن أبي حبيب، عن أبي الخير، عن عُقبة ابن عامر، قال : سمعت النبي ﷺ يقرأ : ﴿**سَمِيعًۢا بَصِيرًا**﴾ قال : فوضعَ النبي ﷺ أُصبعيهِ على عَيْنَيهِ .

**٣٢٥** - عقبة بن عامر دەگێڕێتەوە، وتی : گوێم لە رسول اللە ﷺ بوو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە : ﴿**سَمِيعًۢا بَصِيرًا**﴾ **[النِّسَاء : ٥٨]**

ووتی : رسول اللە ﷺ پەنجەکانی خستە سەر چاوەکانی .

---

**: رواه عبد الله له كتێبی (السنة - ١٢٠٥) .**

**٣٢٦** - حدثنا اسحاق بن ابراهيم، اخبرنا جرير، عن الأعمش، عن تميم بن سلمة، عن عُروة، عن عائشة، انَّها قالت : الحمدُللّه الذي وَسِعَ سَمعُهُ الاصوات، لقد خولة الى رسول الله ﷺ، تشكُو زوجَها، فكان يخفي عليَّ كلامُها فأنزل الله : ﴿**قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ**﴾ **[المجادلة : ١]** .

**٣٢٦** - عائيشە اللە رضي اللە عنها دەيفەرموو : حەمد و سوپاس بۆ ئەو خودایەی بیستنی تەواوی دەنگەکانی داگرتووە، خەولە هات بۆ لای رسول اللە ﷺ گلەیی لە هاوسەرەکەی دەکرد، قسەکانی لێم شاراوە بوو، اللە تعالی ش ئەم ئایەتەی دابەزاند : ﴿**قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا ۚ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ**﴾ **[المُجادَلة : ١]** .

واته : ئەی محمد ﷺ بێگومان الله بیستی و وەریگرت وتووێژی ئەو ئافرەتەی کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات دەربارەی هاوسەرەکەی، سکاڵای خۆیشی بۆلای الله دەبات، الله ش گفتوگۆکەیانی بیست، بەڕاستی الله بیسەرو بینایە .

---

: **رواه أحمد** (**٢٤١٩٥**)، حەدیسەکە صحیحە .

**٣٢٧** - حدثنا احمد بن حنبل، قال : ثنا اسماعيل بن عبدالكريم، قال : حدثني عبدالصَّمد بن مَعقِل، قال : سمعت وهب بن مُنَبِّه، يقول : قال الله الموسى : أدنيتُك، وقرَّبتُك، حتَّى سمعت كلامى، وكُنت بأقرب الامكنة مِنِّى، فانطلق برسالتي، فإِنَّك بعيني وسمعي، وان معك ايدي وبصري .

**٣٢٧** - وهب بن منبه دەڵێت : الله بە موسى عليه السلام ى فەرموو : نزیکم کردییەوە هەتاوەکو گوێت لە قسەم بوو، وە تۆ لە نزیکترینی شوێنەکان بوویت لێمەوە، تۆش دەربچۆ بە نامە و پەیامی من، تۆ لەژێر چاودێری و بیستنی منی، وە دوو دەستەکانم و بینینم لەگەڵ تۆیە .

**٣٢٨** - حدثنا عبدللَّه بن الزُّبيرالحُميدى، قال : حدثنا سفيان، قال : ثنا الزُّهري عن سعيد بن المُسيّب، عن ابي هريرة، قال : قال رسول الله ﷺ : قال الله عزوجل، ﴿**يُؤذيني ابنُ آدمَ يسُبُّ الدَّهر، وانا الدَّهر، بيدي الامر، أُقلِّبُ الليلَ والنَّهارَ**﴾ .

**٣٢٨** - رسول الله ﷺ فەرمووی : ﴿الله عَزَّ وَجلَّ فەرمووی : نەوەی ئادەم ئازارم دەدات جنێو بە ڕۆژگار و کات دەدات، لەکاتێکا من ڕۆژگارم - واتە لەژێر دەستی الله دایە و هەڵیدەسوڕێنێ - ، کاروبار بەدەستی منە، شەو و ڕۆژ هەڵدەگێڕمەوە﴾ .

---

: رواه مسلم (٦١٧١)، والبخاري (٤٨٢٦) .

**٣٢٩** - حدثنا سعيد بن منصور ، قال : ثنا ابو مُعاوية، عن لاعمش، عن سعيد بن جُبير عن ابي عبدالرحمن السُّلمي، عن ابي موسى الاشعرى، قال : قال رسول الله ﷺ : ما احدٌ أصبرَ على اذىً سَمِعَهُ مِن اللَّه، هو يُشركُ به، ويُجهلُ له ولدًا، وهو يُعافيهم ويرزُقُهم .

**٣٢٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هیچ کەسێک ئارامگرتر نیە لە الله عَزَّ وَجلَّ لە ئازاردانێک کە بیبیستێ، الله تعالى شەریک و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدرێ، وە کوڕی بۆ دادەنرێ، الله ش تەندرووستیان دەکات و ڕزقیان پێ دەبەخشێت) .

---

: رواه البخاري (٦٠٩٩)، ومسلم (٧١٨٤) .

**٣٣٠** - حدثنا يحيى بن عثمان ، قال : حدثنا محمد بن كثير، عن الاوزاعي، عن حسَّان بن عطية، قال : ثمانية مقتَهُم اللَّهُ، وقذرَتهم نفسُهُ، وميَّزهم مِن خلقِهِ، :

السَّقَّارون، وهم القتَّالون، والمُستكبرون . والذين اذا دُعوا الى الله وأمره، كانوا بُطآء، واذا دُعوا الى الشَّيطان وامره، كانوا سِرَاعاً والذين يستحقُّو بأيمانهم مالم يُحقَّقهُ اللَّهُ لهم .

والذين ينكزون البغَضةَ الاخوانهم في صدورِهِم، فإذا لقولهم تَخلَّقوا لهم .

والمشَّاؤون بالنَّميمةِ، والمُفرِّقون بين الأحِبَّة .

والباغون دَحَضَةَ البريء .

**٣٣٠** - حسَّان بن عطية وتى : هەشت كەس هەن الله ڕقى لێیانە و لەنەفسى ئەودا بێزراون، وە جیاى كردوونەتەوە لە درووستكراوەكانى، ئەوانیش بریتین لە : لەعنەتكاران بەناحەق ئەوانەن كە بكوژى لەڕادەبەدەرن، وە لوتبەرزەكان .

وە ئەو كەسانەى كاتێک بانگ دەكرێن بۆلاى الله و فەرمانەكانى الله، زۆر هێواش و لەسەرخۆن، وەكاتێک بانگ دەكرێن بۆلاى شیطان و فەرمانەكانى، زۆر بەپەلە و خێران .

وە ئەو كەسانەى بە ئیمان و باوەڕەكەیان ئەو شتانە بەڕاست و حەق دەزانن بۆخۆیان كە الله بە ماف و ڕاستى دانەناوە بۆیان .

وە ئەوكەسانەى لە دڵ و سینەكانیاندا ڕق و كینە كۆدەكەنەوە بۆ براكانیان، وە كاتێكیش كە پێیان دەگەن بوختان و درۆیان بۆ هەڵدەبەستن .

وە ئەوانەى قسە دەهێنن و دەیبەن، وە ئەوانەى نێوان خۆشەویستان لێک جودا دەكەن .

وه ئەوانەی حەز بە پێخلیسكانی بێ تاوانان دەكەن .

**٣٣١** - حدثنا شاذ بن فياض، قال : ثنا عُمر بن إبراهيم، عن قتادة، عن أنس بن مالك، قال : قال رسول الله ﷺ : اللَّهُ أشدُّ فرحًا بتوبةِ عبدِهِ مِن أحدِكُم حِين يَسقُطُ على بعيرِهِ قد أَضَلَّهُ بأرض فلاة .

**٣٣١** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (الله تەوبە كردنی بەندەكەی پێ خۆشترە لەو كەسەی كە دەگاتەوە بە وشترەكەی و دەیدۆزێتەوە دوای ئەوەی لێی ون بووبوو لە زەوییەكی بیابان و فراوانی چۆڵی بێ ئاودا) .

---

: رواه البخاري (٦٣٠٩)، ومسلم (٢٧٤٧) .

**٣٣٢** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا مُغيرة بن عبد الرحمن، وعبد الرحمن بن أبى الزِّناد، عن أبي الزِّناد، عن الأعرجِ، عن أبي هريرة، قال: قال رسول الله ﷺ : مَن أحَبَّ لِقاءَ اللَّه أَحَبَّ اللَّهُ لِقاءَهُ، ومَن كَرِهَ لقاءَ اللَّه كَرِهَ اللَّهُ لِقاءَهُ .

**٣٣٢** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر كەسێك حەز بە دیداری الله بكات، الله ش حەز بە دیداری دەكات، وە هەر كەسێك ڕقی لە دیداری الله ببێتەوە الله ش ڕقی لە دیداری ئەو دەبێتەوە) .

---

: رواه البخاري (٧٥٠٤)، ومسلم (٦٩١٨) .

**٣٣٣** - حدثنا سعيد بن منصور، قال: ثنا عبد الرحمن بن أبي الزِّناد، ومُغيرة بن عبد الرحمن، عن أبي الزِّناد، عن الأعرجِ، عن أبي هريرة، قال: قال رسول الله ﷺ: يمينُ اللَّه ملأى لا يَغيضُها نفقةٌ، سحَّاءُ الليلِ والنَّهارِ، وقال: أرأيتُم ما أنفقَ مُنذُ خلقَ السَّمواتِ والأرضَ؟ فإنَّه لم يَغِضْ ما في يمينِهِ، وعرشُهُ على الماءِ، وبيدِهِ الأُخرى الميزانُ يَخفِضُ ويرفعُ .

**٣٣٣** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (دەستی ڕاستی الله تعالى پڕە هیچ بەخشینێك توندی ناكات و نایگرێتەوە لە بەخشین، بەخشەری شەو و ڕۆژە، پاشان رسول الله ﷺ فەرمووی: ئایا نابینن دەبەخشێت لەوەتەی ئاسمان و زەوی بەدیهێناوە؟ هیچ شتێك دەستی الله ی نەگرتۆتەوە لە بەخشین، عەرشەكەی لەسەر ئاوە، وە بە دەستەكەی تری تەرازوو نزم دەكاتەوە و بەرز دەكاتەوە) .

---

: رواه البخاري (٤٦٨٤)، ومسلم (٢٢٧١) .

**٣٣٤** - حدثنا سعيد، قال : ثنا مُغيرة بن عبد الرحمن، عن أبي الزِّناد، عن الأعرج، عن أبي هريرة، عن النبي عليه الصَّلاة والسَّلام قال : لَمَّا خلقَ اللَّهُ الخلقَ كتبَ في كِتابِهِ وهو عِندَهُ فوقَ العرشِ : إنَّ رَحمَتي غلبتْ غضبِي .

**٣٣٤** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (کاتێک الله درووستکراوەکانی بەدیهێنا، لە کتێبەکەی - لوح المحفوظ - نووسی کە لە لای خۆیەتی لە سەرووی عەرشەوە، کەوا ڕەحمەت و بەزەیی من پێش تووڕەبوونم کەوتووە) .

---

: رواه البخاري (٣١٩٤)، ومسلم (٧٠٦٩) .

**٣٣٥** - حدثنا عيسى بن محمد، قال : ثنا مُحاضر بن المورِّع، عن الأعمش، عن عَمرو بن مُرَّة، عن أبي نصر، عن أبي ذرِّ، قال رسول الله ﷺ : كِثَفُ السَّماءِ مسيرةُ خمسمائة عام، وبينَ الأرضِ العُليا والسَّماءِ الدُّنيا خمسمائة عامٍ، وكِثفها خمسمائة عام، وكِثفُ الثَّانيةِ مثل ذلك، وما بينَ كلِّ أرضين مِثلُ ذلك، وكِثفُ السَّماءِ مسيرة خمسمائة عام، وبين السَّماءِ الدنيا والثَّانيةِ خمسمائة عام، وكِثفُ السَّماءِ مسيرةُ خمسمائة عام، ثم كُلُّ سماءٍ مثل ذلك، حتَّى تَبلغَ السَّابعةَ، ثم ما بين السَّماءِ السَّابعةِ والعرشِ مَسيرة ما بين ذلك كُلِّهِ .

**٣٣٥** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (ئەستووریی ئاسمان بە ئەندازەی ڕێ کردنی پێنج سەد ساڵە، وە لە نێوان بەرزترین زەوی - واتە حەوتەمین زەوی لە سەرەوە - و ئاسمانی

دونیا پێنج سەد ساڵە، وە ئەستووریەکەشی پێنج سەد ساڵە، وە ئەستووریی ئاسمانی دووەمیش بە هەمان شێوەیە، وە لە نێوان هەردوو زەوییەک بە هەمان شێوەیە، وە ئەستووری ئاسمان بە ئەندازەی ڕێ کردنی پێنج سەد ساڵە، وە لە نێوان ئاسمانی یەکەم و دووەم پێنج سەد ساڵە، وە ئەستووریی ئاسمان بە ئەندازەی ڕێ کردنی پێنج سەد ساڵە، پاشان هەموو ئاسمانێک بەو جۆرەیە، هەتا دەگات بە حەوتەم، پاشان لە نێوان ئاسمانی حەوتەم هەتا عەرش بە ئەندازەی هەموو ئەم نێوانەیە) .

---

: رواه أحمد (١٧٧٠)، وأبو داود (٤٧٢٣) .

## باب : (٢٣)

## باب في قول الله عز وجل : ﴿مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ﴾ [المجادلة : ٧]

## دەربارەی ئەم ووتەی الله تعالى : ﴿ هەر سێ کەسێك لەگەڵ یەکتردا چپە بکەن ئەوا الله چوارەمینیانە ﴾



**٣٣٦** - سألتُ إسحاق بن إبراهيم، قلتُ : قول الله تبارك وتعالى : ﴿مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ﴾ [المجادلة : ٧]، كيف تقول فيه؟

قال : حيثُ ماكُنتَ هو أقربُ إليك مِن حبلِ الوريدِ، وهو بائنٌ من خلقِهِ .

قلتُ لإسحاق : على العرشِ بحدٍّ؟

قال : نعم بِحدٍّ .

وذكرَ عن ابنِ المُبارك، قال هو على عرشِهِ بائنٌ مِن خلقِهِ بحدٍّ .

**٣٣٦** - پرسیارم له إسحاق كرد ووتم: ووتەی الله تعالى كە فەرموویەتی: ﴿**مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ**﴾ [**المجادلة** : ٧]، دەربارەی چی دەڵێیت؟

ووتی: لەهەر شوێنێک بیت ئەو نزیکترە لێت لە شادەماری گەردنەوە، وە ئەو جیایە لە دروستکراوەکانی.

بە إسحاق م ووت: لەسەر عەرشە و سنووری هەیە؟

ووتی: بەڵێ سنووری هەیە.

وە باسی إبن مبارک ی كرد كە وتوویەتی: الله تعالى لەسەر عەرشە جیایە لە دروستکراوەکانی وە سنووری هەیە - واتە هیچ کات تێکەڵی دروستکراوەکانی نابێت -.

**٣٣٧** - حدثنا سعيد بن نوح، قال: ثنا أبي: نوح بن المَضروب، قال: ثنا بُكير بن معروف، عن مُقاتِل بن حيَّان، عن الضَّحاك بن مُزاحم في قول الله تعالى: ﴿**مَا يَكُونُ مِنْ نَجْوَىٰ ثَلَاثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ**﴾ [**المجادلة** : ٧].

قال: هو تبارك وتعالى على العرشِ، وعِلمُهُ معَهُم.

**٣٣٧** - الضحاک بن مزاحم لە ووتەی الله تعالى: ﴿**مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ**﴾ [**المجادلة** : ٧].

وتی: الله تبارک وتعالى لەسەر عەرشە، وە زانستەکەی لەگەڵیانە.

**٣٣٨** - حدثنا أبو بكر محمد بن يزيد، قال : أخبرنا علي بن الحسن، قال : قلتُ لابن المُبارك : يا أبا عبد الرحمن، كيف نعرفُ ربنا؟

قال : هو على العرشِ فوقَ سبع سماوات، وعلمُهُ وأمرُهُ في كُلِّ موضِعٍ .

قال : قلتُ : بِحَدٍّ؟

قال : بِحَدٍّ، ولا نقولُ كما تقولُ الجهمية : إنَّه هاهنا، وهاهنا في الأرض .

**٣٣٨** - علي بن الحسن ووتی : به إبن مبارک م ووت : ئەی باوکی عبدالرحمن چۆن پەروەردگارمان بناسین؟

ووتی : ئەو - واته الله تبارک وتعالى - لەسەر عەرشە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە، وە زانستەکەی و فەرمانەکانی لەهەموو شوێنێکە .

ووتم : سنووری هەیە؟

ووتی : سنووری هەیە، وە هەمان قسەی جەهمییەکان ناڵێین، کە دەڵێن : الله لێرەیە، وە لێرەیە لە زەوی .

**٣٣٩** - حدثنا أحمد بن حنبل، قال : حدثنا سُريج بن النُّعمان، قال : حدثنا عبدلله بن نافع ، قال : قال مالك : اللَّهُ تبارك وتعالى في السَّماءِ ،وعِلمُهُ في كلِّ مكان، لا يخلو مِن علمِهِ مكان .

**٣٣٩** - مالك ووتى : الله تبارك وتعالى له ئاسمانه، وه زانسته‌كه‌ى له هه‌موو شوێنێكه، هيچ شوێنێ خاڵى نييه له زانستى ئه‌و .

**٣٤٠** - حدثنا أبو بكر محمد بن يزيد، قال : سمعت عُبيداللَّه بن موسى، قال : سُئل سُفيان عن قوله : ﴿**وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ**﴾ [**الحديد : ٤**] .

قال : عِلمُهُ .

**٣٤٠** - عبيدالله بن موسى ووتى : پرسيار كرا له سفيان ده‌رباره‌ى ووته‌ى الله تعالى : ﴿**وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ**﴾ [**الحَديد : ٤**] .

ووتى : زانسته‌كه‌ى - واته الله تعالى له‌گه‌ڵ هه‌موومانه به زانسته‌كه‌ى، وه له هه‌موو شوێنێكه به زانسته‌كه‌ى - .

## باب : (٢٤)

# باب في العرش

# دەربارەی عەڕش



**٣٤١** - حدثنا أبو عَمرو عُثمان بن طالوت، قال: حدثنا مُعاذ بن هِشام، عن أبيه، عن قتادة، عن كثير بن أبي كثير، عن أبي عياض، عن عبد الله بن عَمرو، قال: إنَّ العرشَ لمطوَّقٌ بحيَّةٍ، وإنَّ الوحي لينزل بالسَّلاسِل.

**٣٤١** - عبدالله بن عمرو ووتی: بەڕاستی عەڕش دەورەدراوە بە مارێک، وە بەڕاستی وەحی بە زنجیر دادەبەزێت.

**٣٤٢** - حدثنا هِشام بن عمار الدِّمشقي، قال: ثنا عبد الله بن يزيد، قال: ثنا شُعيب بن أبي حمزة، عن عبد الأعلى بن أبي عَمرة، عن عُبادة بن نُسَي، عن عبد الرحمن بن غَنْم، عن مُعاذ بن جبل، عن النبي عليه الصَّلاة والسَّلام قال: المَجرَّةُ التي في السَّماءِ عَرَقُ الأفعى التي تحت العَرشِ.

**٣٤٢** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (خولگە لە ئاسمانە، عەرەقی ئەو مارەیە کە لەژێر عەرشە) .

---

: ابن قیم لە (**المنار المنيف، لاپەڕە ٤٩**)، کە دەربارە حەدیسە موضوعەکان قسە دەکات و دەڵێت : لەوانە کە حەدیسەکە لەخودی خۆی باتڵە، باتڵیەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوە کەلامی رسول الله ﷺ نییە، وەک حەدیسی : (خولگە لە ئاسمانە، عەرەقی ..)] .

**٣٤٣** - حدثنا عَمرو بن عثمان، قال : ثنا بقيَّة بن الوليد، عن بَحِير بن سعد، عن خالد بن معدان، قال : قال أبو عائشة : إن نفرًا مِن اليهود أتوا رسول الله ﷺ فقالوا : مَن يحمِلُ العرشَ؟

قال : تحمِلُهُ الهَوَامُّ بقُرُونِها، والمجرَّةُ التي في السَّماءِ مِن عَرقِهِم .

قالوا : نشهَدُ أنَّك رسول الله .

**٣٤٣** - أبو عائيشە ووتی : کۆمەڵێک لە جولەکە هاتن بۆ لای رسول الله ﷺ ووتیان : کێ عەرش هەڵدەگرێت؟

رسول الله ﷺ فەرمووی : (الهوام - جۆرە حەشراتێکە - بە قۆچەکانیان هەڵیدەگرن، وە ئەو خولگانەی لە ئاسمانن لە عەرەقی ئەوانن) .

ووتیان شایەتی دەدەین کەوا تۆ نێردراوی اللە ی .

: ئەمە حەدیسێکی مرسل ی ضعیف ە .

**٣٤٤** - حدثنا إسحاق، قال: أخبرنا جرير، عن عطاء بن السَّائب، عن ميسرة في قول الله: ﴿**وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ**﴾ [**الحَاقَّة**: ١٧].

قال: أرجلهم في التُّخُوم، لا يستطيعون أن يرفعوا أبصارهم مِن شُعاعِ النُّور.

**٣٤٤** - میسرة دەربارەی ئەو ئایەتەی الله عَزَّوَجَل: ﴿**وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ**﴾ [**الحَاقَّة**: ١٧].

ووتی: قاچەکانیان لەسەر سنوورێکە کە بۆیان دانراوە، ناتوانن چاوەکانیان بەرزبکەنەوە لەبەر تیشکی ڕووناکی.

**٣٤٥** - حدثنا عبد الرحمن بن محمد، قال: ثنا أبو أسامة، عن إسماعيل بن أبي خالد، قال: سمعتُ سعدًا الطَّائي يقول: العرشُ ياقوتَةٌ حمراء.

**٣٤٥** - سعدي طائي دەڵێت: (عەرش یاقوتێکی سوورە).

**٣٤٦** - حدثنا عَمرو بن عثمان، قال: ثنا أبو المُغيرة، عن أُمِّ عبد الله بنت خالد بن معدان، قال أبو القاسم: اسمها عبدة عن أبيها، أنَّه كان يقول: إنَّ الرَّبَّ سبحانَهُ

ليثقُلُ على حملةِ العرشِ مِن أوَّل النَّهارِ إذا قامَ المشركون، فإذا قامَ المسبِّحون خُفِّفَ عن حملةِ العرش .

**٣٤٦** - عبدة له باوكييهوه دهگێڕێتهوه كه دهیووت : پهروهردگاری پاك و بێگهرد قورسی دهكات لهسهر ههڵگرانی عهڕش له سهرهتای ڕۆژ، كاتێك هاوبهشدانهران ههڵدهستن، پاشان كاتێك به پاك ڕاگران - ئهوانهی تهسبیحات دهكهن - ههڵدهستن سوكی دهكات لهسهر ههڵگرانی عهڕش .

## باب : (٢٥)

# باب في الاستواء

# دەربارەی الاستواء



**٣٤٧** - أملى عليَّ إسحاقُ : إنَّ اللَّهَ تبارك وتعالى وصفَ نفسَهُ في كتابه بصِفاتٍاستغنى الخلقُ أن يصِفوهُ بغير ما وصفَ به نفسَهُ،

مِن ذلك : قوله : ﴿**هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ**﴾ [**البَقَرَة** : ٢١٠] .

وقوله : ﴿**وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ**﴾ [**الزُّمَر** : ٧٥] .

وآيات مثلها يصِفُ العرشَ .

وقد ثبتت الرِّواياتُ في العرشِ، وأعلى شيء فيهِ وأثبته : قولُ الله : ﴿**الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ**﴾ [**طه** : ٥] .

**٣٤٧** - إسحاق قسەی دەكرد تا بنوسم : بەڕاستی الله تبارك و تعالى وەسفی خۆی كردووە لە كتابەكەیدا بە سیفەتانێك كە درووستكراوەكانی بێ

پێویست کردووه لەوەی کە وەسفی بکەن بە جگە لەوانەی خۆی پێ وەسفکردووە .

لەوانە ئەم وتەیەی الله عَزَّوَجَل : ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ وَالْمَلَائِكَةُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ ۚ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾ [البقرة : ٢١٠] .

وە ئەم وتەیەی : ﴿وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ﴾ [الزُّمَر : ٧٥] .

وە ئایەتانێکی هاوشێوەی ئەوە کە وەسفی عەرش دەکەن .

وە گێڕانەوەکان دەربارەی عەرش جێگیربوون، وە بەرزترین و جێگیرترین شت تێیدا : ئەم قەولەی الله تعالى یە : ﴿الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾ [طه : ٥] .

**٣٤٨** - وسمعتُ أبا جعفر أحمدُ بن سعيد، قال أبو محمد : هذا أحمد بن سعيد الدَّرامي خراساني، وليس هذا الرِّباطي، وقد كتبتُ عن الرّباطي أيضًا يقول : سمعتُ أبي يقول : سمعتُ خارِجةَ بن مُصعب يقول : الجهميةُ كُفَّارٌ، لا تنكحوا إليهم، ولا تُنكِحوهم، ولا تعودوا مرضاهم، ولا تشهدوا جنائزهم، وبلِّغوا نساءهُم أنهُنَّ طوالِق، وأنَّهُنَّ لا يحللن لأزواجِهنَّ .

ثم قرأ : ﴿طه (١) مَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ (٢)﴾ [طه] .

إلى قوله عَزَّوَجَل : ﴿الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾ [طه : ٥]، وهل يكونُ الاستواءُ إلَّا الجلوس .

**٣٤٨** - خارجة بن مصعب دەڵێت: جەهمییەکان کافرن، کچیان لێ مەخوازن و کچیان پێ مەدەن، وە سەردانی نەخۆشەکانیان مەکەن، وە ئامادە مەبن لەکاتی بەڕێکردنی لاشەکانیان بۆ گۆڕستان، وە هەواڵبدەن بەئافرەتەکانیان کەوا ئەوان تەڵاقدراون، وە بەڕاستی ئەوان حەڵاڵ نین بۆ هاوسەرەکانیان، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿**طه (١) مَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ (٢)**﴾ [**طه**]

هەتا ئەم وتەیەی الله عَزَّوَجَل: ﴿**الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ**﴾، ئایا إستواء کردن چی دەبێ ئیللا دانیشتن نەبێ.

**٣٤٩** - حدثنا محمد بن مُصفَّى الحمصي، عن وهب بن جرير، عن أبيه، عن محمد بن إسحاق، عن يعقوب بن عُتبة، عن محمد ابن جُبير بن مُطعم، عن أبيه، قال: قال رسول الله ﷺ: العرشُ على السَّماوات مِثلُ القُبَّةِ، واللَّهُ على العرشِ، وللعرشِ أَطِيطٌ.

**٣٤٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی: (عەرش لەسەر ئاسمانەکان وەک گومبەز وایە، الله ش لەسەر عەرشە، عەرشیش دەنگێکی هەیە - اطیط: دەنگێکە بەهۆی شتی قورسەوە درووست دەبێت کاتێک هەندێکی بخرێتە سەر هەندێکی تری -، وە اطیط ی وشتر ناڵەیەتی بەهۆی قورسیی بارەکەیەوە).

---

: حەدیسێکی صحیحە.

**٣٥٠** - وقال إسحاق في حديث أبي رَزِين العُقيلي، قوله: في عماء، ما فوقَهُ هواء، وما تَحتَهُ هواء، معناه:

أنَّه كان في عماء قبل أن يخلقَ السَّماوات والأرضين، وتفسيره عند أهل العلم: أنه كان في عماء، يعني: سحابة.

**٣٥٠** - إسحاق دەبارەی ئەم حەدیسەی أبي رزين العقيلي ووتی: لە - عماء: هەور - دایە، ئەوەی لە سەرەوەیەتی هەوایە، وە ئەوەشی لە ژێریەوەیەتی هەوایە.

واتە بەڕاستی اللّٰه لە - عماء: هەور - دابوو پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەویەکان درووست بکات، وە تەفسیر و ڕاڤەکەی لای ئەهلی عیلم بریتییە لەوەی کە: بەڕاستی اللّٰه لە - عماء: هەور - دابوو، واتە: هەورێک.

**٣٥١** - حدثنا عُبيد الله بن مُعاذ، قال: ثنا أبي، قال: ثنا حماد بن سلمة، عن يعلى بن عطاء، عن وكيع بن حدُس، عن أبي رَزِين العُقيلي، قال: قلت: يا رسول اللَّه ﷺ، أين كان ربُّنا قبل أن يخلقَ السَّماوات والأرض؟

قال: كان في عَمَاء، ما فوقَهُ هواءٌ، وما تَحتَهُ هواءٌ، ثُمَّ خلقَ عرشَهُ على المَاءِ.

**٣٥١** - أبي رزين العقيلي ووتی: ووتم: ئەی رسول اللّٰه ﷺ، پەروەردگارمان لە کوێ بوو پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی بەدی بهێنێت؟

فەرمووی : (لە - عماء : هەور - دابوو، ئەوەی لە سەرەوەیەتی هەوایە، وە ئەوەی لە ژێریەوەیەتی هەوایە، پاشان عەرشەکەی خۆی درووست کرد لەسەر ئاو) .

---

: رواه أحمد (١٦١٨٨)، والترمذي (٣١٠٩) .

## باب : (٢٦)

## باب في الحجب

## دەربارەی الحجب (پەردە)



**٣٥٢** - حدثنا إسحاق بن إبراهيم، قال : أخبرنا روح بن عبادة، قال : ثنا موسى بن عُبيدة، قال : ثنا أبو حازم، عن سهل بن سعد السَّاعدي، قال : قال رسول الله ﷺ : إنَّ دونَ اللَّه سبعينَ ألفَ حِجاب مِن نُور، ما مِن نفس تسمعُ حِسَّ شيء مِن تِلك الحُجُبِ إلَّا زهقت نفسُهُ .

**٣٥٢** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (لەبەردەم الله حەفتا هەزار پەردە لە نور هەیە، هەر کەسێک گوێی لە هەستی شتێک لەم پەردانە بێت ئیللا نەفسی دەردەچێت) .

**٣٥٣** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : ثنا عبد العزيز بن أبي حازم، قال : حدثني أبي، عن عمر بن الحكم بن ثوبان، عن عبد الله ابن عمرو، قال : والذي نفسي بيده إن بين النَّاسِ يوم القيامة وبين الرَّبِّ تبارك وتعالى لسبعين ألف حِجَاب، منها حُجُبٌ مِن

ظُلمةِ، لا ينفذها شيءٌ، ومنها حُجُبٌ من نُور، لا يستطيعها شيءٌ، ومنها حُجُبٌ مِن ماء، لا يسمعُ حسَّ ذلك الماء أحدٌ فلا يُربط على قلبهِ إلَّا انخلعت أفئدته .

**٣٥٣** - عبدالله إبن عمرو وتی : سوێند بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە بەڕاستی لەڕۆژی قیامەت نێوانی خەڵک و الله تبارک وتعالی حەفتا هەزار پەردەیە، لەوانە پەردەیەکی تاریکیە، هیچ شتێک تێناپەڕێ بەناویدا، وە لەوانە پەردەی ڕووناکی کە هیچ شتێک توانای نییە بەسەریدا، وە لەوانە پەردەیەکە لەئاو، هیچ کەسێک نیە دەنگی ئەو ئاوە ببیستێ و دڵەکەی توند و بەهێز و چەسپاو نەکرابێ ئیللا دڵی دەردەچێ و دێتەدەرەوە .

**٣٥٤** - حدثنا محمد بن أبي بكر، قال : حدثنا مؤمَّل، قال : ثنا حماد، عن أبي عمران الجَوني، عن زُرارة بن أوفى، أن النبي ﷺ قال لجبريل : هل رأيت ربَّك؟ فانتفضَ جبريلُ وانتفضَ، وقال : إنَّ بيني وبينَهُ سبعين حِجَابًا مِن نورٍ، لو أدنو إلى أدناها لاحترقتُ .

**٣٥٤** - پێغەمبەر ﷺ بە جبریلی فەرموو : (ئایا پەروەردگارت بینیوە؟ جبریل علیه السلام کەوتە لەرزین - لەترسی ئەو پرسیارە و گەورەیی الله تعالی - فەرمووی : نێوانی من و الله تعالی حەفتا پەردەیە لەڕووناکی، ئەگەر نزیک ببمەوە لە دوورترینییان ئیللا دەسووتێم).

---

: رواه الدارمي له (النقض : ٢٤٩)، وابن أبي شيبة له (العرش : ٧٧) .

## باب : (٢٧)

# باب في النزول

# دەربارەی دابەزین



**٣٥٥** - سألت إسحاق بن إبراهيم، قلت : حديث النبي عليه الصَّلاة والسَّلام : ينزلُ اللَّهُ كلَّ ليلةِ إلى السَّماءِ الدُّنيا؟

قال : نعم، ينزلُ اللَّهُ كلَّ ليلة إلى السَّماءِ الدنيا كما شاء، وكيف شاء، وليس فيه صِفة .

وقال إسحاق : لا يجوزُ الخوضُ في أمرِ اللَّه، كما يجوز الخوض في فعلِ المخلوقِين، يقول الله تبارك وتعالى : ﴿**لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ**﴾ **[الأنبيَاء : ٢٣]** .

ولا يجوز لأحدِ أن يتوهَّم على الخالقِ بصفاته وفعاله توهُّم ما يجوز التَّفكر والنَّظر في أمرِ المخلوقين، وذلك أنَّه يمكن أن يكون موصوفًا بالنُّزول كُلّ ليلة إذا مضى ثلثها إلى السَّماءِ الدنيا كما شاء، ولا يُسأل : كيف نزله، لأنَّه الخالق يصنع ما شاء كما شاء .

**٣٥٥** - پرسیارم له إسحاق بن إبراهیم کرد، ووتم : حەدیسی پێغەمبەر ﷺ : (الله لە هەموو شەوێکدا دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا)؟

فەرمووی : بەڵێ، هەموو شەوێک الله تعالى دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، وەک خۆی بیەوێت، وە هەر چۆنێک بیەوێت، وە هیچ سیفەتێکی دەربارەی نییە - واتە چۆنیەتی دابەزینی الله تعالى نابێت وەسف بکرێت - .

وە إسحاق ووتی : درووست نییە ڕۆچون لە ناو کاروبارەکانی الله، هەر وەکو کە درووستە بچیتە ناو کردەوەکانی بەندە - واتە کردەوەکانی الله دروست نییە تیایدا ڕۆبچیت جیایە لە کردەوەکانی بەندە، والله اعلم - ، الله تبارک وتعالى دەفەرموێت : ﴿لَا يُسْئَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْئَلُونَ﴾ [الأنبياء : ٢٣] .

بۆ هیچ کەسێک درووست نییە کە خەیاڵی ئەوە بکات لەسەر درووستکار بە سیفەتەکانی و کردەوەکانی وە خەیاڵ بکات دەربارەی ئەوەی بۆ بەندەکان شیاوە لە بیرکردنەوە و بیر و بۆچوون لە کاروبارەکانیاندا، وە الله تعالى وەسفکراوە بە دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا هەموو شەوێک کاتێک سێ یەکەکەی تێدەپەڕێ بەو جۆرەی کە ویستی لەسەرە، وە پرسیار ناکرێ کە : دابەزینەکەی چۆنە، لەبەر ئەوەی ئەو بەدیهێنەر و درووستکارە ئەوەی ویستی لەسەربێ دەیکات بەو شێوەیەی کە دەیەوێت .

**٣٥٦** - حدثنا محمد بن إسماعيل، قال : حدثنا إسماعيل ابن عُليَّة، عن هشام الدَّستوائي، عن يحيى بن أبي كثير، عن هلال بن أبي ميمونة، عن عطاء بن يسار، عن

رِفاعة الجهني، قال : قال رسول الله ﷺ : إذا مضى نِصفُ الليلِ أو قال : ثلثا الليلِ نزلَ اللَّهُ إلى السَّماءِ الدُّنيا يقولُ : لا أسألُ عن عِبادي أحدًا غيرِي، مَن ذا الذي يَستغفِرُوني أغفرُ له، مَن ذا الذي يدعوني أستجيبُ له، مَن ذا الذي يسألُني أُعطِيهِ، حتَّى ينفجرَ الصُّبح .

**٣٥٦** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (کاتێک نیوە شەو تێپەڕ دەبێ، یان ووتی : سێیەکی شەو، ئەوا الله تعالى دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا دەفەرمووێت : لە هیچ یەکێک لە بەندەکانم داوا مەکەن جگە لە من نەبێت، کێ دەیەوێت لێی خۆشبم تاوەکو لێی خۆشببم، کێ لێم دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە، کێ داوام لێدەکات تاوەکو پێی ببەخشم، تاوەکو بەیانی دادێت) .

---

: رواه **أحمد** (١٦٢١٥ - ١٦٢١٦)، ئیسنادەکەی صحیحە .

**٣٥٧** - حدثنا أبو الوليد الطَّيالسي، قال : ثنا حماد بن سلمة، عن علي بن يزيد، عن الحسن، عن عثمان بن أبي العاص، عن النبي ﷺ أنَّه قال : ينزلُ اللَّهُ إلى السَّماءِ الدُّنيا كُلَّ ليلة، فيقول : هل مِن دَاعٍ فأستَجيبَ له، هل مِن سائل فأُعطِيهُ، هل مِن مُستَغفِر فأغفِرَ له .

**٣٥٧** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الله تعالى لە هەموو شەوێکدا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا و دەفەرمووێت : ئایا بانگکەرێک هەیە تا وەڵامی بدەمەوە، ئایا هیچ

داواكارێك هەیە پێی ببەخشم، ئایا كەسێك هەیە داوای لێخۆشبوون بكات تا لێی خۆشبم) .

---

: **رواه أحمد** (١٧٩١٢ - ١٧٩١٥)، وه بەهەمان شێوه لە **البخاري** (٧٤٩٤)، **ومسلم** (١٧٢١) لە حەدیسی أبي هريرة رضي الله عنه، ڕیوایەت كراوه .

## باب : (٢٨)

## باب في القرآن

## دەربارەی قورئان



**٣٥٨** - سمعت أحمد بن حنبل وذُكِرَ عنده كلامُ النَّاسِ في القرآنِ أنَّه مخلوقٌ . فقال : كُفرٌ ظاهِرٌ . مرَّتين .

**٣٥٨** - گوێم لە أحمد بن حنبل بوو کە لای ئەو باسی قسەی خەڵکیان دەکرد دەربارەی قورئان کە درووستکراوە .

ووتی : کوفرێکی ئاشکرایە، دووجار ئاوای ووتەوە .

**٣٥٩** - سألت إسحاق، قلت : يا أبا يعقوب، أليس تقول : القرآنُ كلامُ اللَّه تكلَّم به، ليسَ بمخلوق؟

قال : نعم، القرآن كلامُ اللَّه ليسَ بمخلوق، ومن قال : إنَّه مخلوقٌ، فهو كافِر .

**٣٥٩** - پرسیارم لە إسحاق کرد ووتم : ئەی باوکی یعقوب ئایە ناڵێیت : قورئان ووتەی الله یە و قسەی پێکردووە، دروستکراو نییە؟

ووتی : بەڵێ، قورئان ووتەی الله یە و دروستکراو نییە، وە هەرکەسێک بڵێت : قورئان دروستکراوە، ئەوا کافرە .

**٣٦٠** - وسألتُهُ عن الرَّجلِ يقول : القرآنُ كلامُ اللَّه ويقف؟

قال : هو عندي شرٌ مِن الذي يقول : إنَّه مخلوق، لأنَّه يَقتدي به غيره .

**٣٦٠** - وە پرسیارم لێی کرد - واتە لە إسحاق، هەمان کەسی اثری ٣٥٩ - دەربارەی پیاوێک کە دەڵێت : قورئان ووتەی الله یە و دەوەستێت؟ - واتە تەنیا دەڵێت ووتەی الله یە و ناڵێت دروستکراو نییە - .

ووتی : ئەوە لە لای من خراپترە لەو کەسەی کە دەڵێت : قورئان دروستکراوە، چونکە خەڵکانی تر ئەو دەکەنە پێشەنگی خۆیان و چاوی لێدەکەن .

**٣٦١** - وسمعت أبا بكر محمد بن يزيد، قال : القرآنُ كلامُ اللَّه ليسَ بمخلوقٍ، مَن قال : إنَّه مخلوقٌ، فهو كافِر .

ومَن وقفَ لا يدري أن اللَّه يتكلَّم، أو لا يتكلَّم فهو كافِر، والواقفة عندي شرٌّ مِن الجهمية .

**٣٦١** - گوێم له أبا بكر محمد بن يزيد بوو ووتی : قورئان وتەی اللّٰه يه و درووستكراو نییه، هەركەسێك بڵێت : قورئان درووستكراوه، ئەوا كافره .

وه هەركەسێك بوەستێت نازانێت كه اللّٰه قسه دەكات يان قسه ناكات، ئەوا كافره، الواقفة له لای من خراپتره له الجهمية .

**٣٦٢** - وسمعت عبدة بن عبد الرحيم بن حسَّان، قال : مَن زعم أنَّ القرآنَ مخلوقٌ، فهو كافِر، ومَن وقفَ فهو شرٌّ منه .

قال عبدةُ : ليس بين أحد مِن أهل العلمِ اختلافٌ أن من قال : القرآن مخلوق فهو كافِر .

**٣٦٢** - گوێم له عبدة بن عبد الرحيم بن حسَّان بوو ووتی : هەركەسێك پێی وابێت قورئان درووستكراوه، ئەوا كافره، وه هەركەسێك بوەستێت ئەوا لەو خراپتره .

عبدة ووتی : هیچ جیاوازیەك نییه له نێوان ئەهلی عیلم كەوا هەركەسێك بڵێت : قورئان درووستكراوه ئەوا كافره - واته ئەهلی عیلم ئیجماعیان لەسەر ئەوەیه كه : هەر كەسێك بڵێت قورئان درووستكراوه ئەوا كافره - .

**٣٦٣** - حدثنا إبراهيم بن الحارث، قال: سألت أبا عبد اللَّه أحمد بن حنبل، قلت: يا أبا عبد اللَّه، يكون مِن أهلِ السُّنَّةِ مَن قال: لا أقولُ: القرآن مخلوق، ولا أقول: ليس بمخلوق؟

قال: لا، ولا كرامة، لا يكون مِن أهلِ السُّنَّة، قد بلغني عن ذاك الخبيثِ ابن مُعذِّل أنه يقول بهذا القول، وقد فُتِنَ به قومٌ كثير مِن أهلِ البصرة.

**٣٦٣** - إبراهيم بن الحارث ووتى: پرسيارم له أبا عبد الله بن حنبل - واته أحمد بن حنبل - كرد ووتم: ئەی باوكی عبد الله دەكرێت لەناو ئەهلی سوننە هەبێت كە بڵێت: ناڵێم قورئان درووستكراوە، وە ناڵێم قورئان درووستكراو نییە؟

ووتی: نەخێر، هیچ ڕێزێكی بۆ نییە، هیچ كەسێك لە ئەهلی سوننە وناكات، دەربارەی ئەمە پێم گەیشتووە لەكەسێكی پیس - إبن معذِّل - كە هەمان ئەو قسەیە دەڵێت، وە زۆرێك لە ئەهلی بصرة ی تووشی فیتنە كرد.

**٣٦٤** - سمعتُ إسحاقَ يقول: مَن قال: إنَّ القرآن مُحدثٌ على معنى: مخلوق، فهو كافرٌ باللَّه العظيم.

قلتُ: مامعنى قوله: ﴿**مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ**﴾ [**الأنبيَاء: ٢**]؟

قال: مُحدث مِن العرشِ، آخر مَن نزلَ مِن الكتبِ مِن العرشِ.

ثم راجعتُه في ذلك، فقال: أحدثُ الكتبِ عهدًا بالرحمن.

**٣٦٤** - گوێم لە إسحاق بوو دەیووت : هەر کەسێک بڵێت : قورئان نوێیە و تازەیە، لە سەر ئەو مانایەی کە درووستکراوە، ئەوا کافرە بە الله تعالى .

ووتم : مانای ئەو ووتەی الله تعالى کە فەرموویەتی : ﴿**مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ**﴾ [**الأنبيَاء : ٢**]؟

ووتی : تازەیە لە عەرشەوە - واتە تازەیە لە عەرشەوە نەک تازەیە لە لایەن پەروەردگارەوە، پەنا بە الله - ، دواهەمین کتێبە کە لە عەرشەوە دابەزی .

پاشان پێداچوونەوەم لەوەدا کرد، ووتی : نوێترین کتێب لە لای الله ەوە .

**٣٦٥** - حدثنا إبراهيم بن الحارث، قال : حدثنا زُهير بن حرب، قال : كُنَّا في طريق مكة، ومعنا مُثنَّى الأنماطي، فجعل يقول : القرآن مجعول مخلوق . فقلتُ : بيني وبينك وكيع .

فأتيناهُ، فقلنا : يا أبا سُفيان، إنَّ هذا يزعم أن القرآنَ مجعول مخلوق؟

فقال : وكيع : سبحان اللَّه، هذا كُفر، هذا كُفر .

فقال له المُثنى : أليس الله يقول : ﴿**مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ**﴾؟

فقال وكيع : هذا كُفرٌ .

**٣٦٥** - زُهير بن حرب ووتی : لە ڕێگادا بووین بۆ مەککە، مثنى الأنماطي مان لەگەڵ بوو، دەیووت : قورئان درووستکراوە مەخلوقە .

منيش وتم : له نێوان من و تۆدا وكيع ه .

ئێمەش گەیشتین بە مەككە، ووتمان : ئەی أبا سفيان، ئەوە بانگەشەی ئەوە دەكات كەوا قورئان مەخلوقە؟

وكيع ووتی : سبحان الله، ئەمە كوفرە، ئەمە كوفرە .

مثنى ش پێی وت : ئایا الله نافەرمووێ : ﴿**مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ**﴾؟

وكيع وتی : ئەمە كوفرە .

**٣٦٦** - حدثنا إبراهيم بن الحارث، قال : حدثني القاسم بن يزيد، قال : سمعت وكيع بن الجراح يقول : من زعمَ أن القرآن مخلوق فقد زعم أن القرآن مُحدثٌ، ومَن زعمَ أن القآانَ مُحدث، فقد كفرَ بما أُنزِلَ على محمد، يُستتاب، فإن تابَ وإلاَّ ضُرِبت عُنقه .

**٣٦٦** - وكيع بن الجراح دەڵێت : هەر كەسێك بانگەشەی ئەوە بكات قورئان مەخلوقە ئەوا بانگەشەی ئەوەی كردووە كە قورئان تازەیە و نوێیە، وە هەر كەسێكیش بانگەشەی ئەوە بكات قورئان نوێیە، ئەوا كافر بووە بەوەی دابەزیوەتە سەر محمد ﷺ، داوای تەوبەی لێدەكرێت، ئەگەر تەوبەی كرد ئەگەر نا لە ملی دەدرێت .

٣٦٧ - سمعتُ إسحاقَ يقول : ليس بين أهلِ العلم اختلافٌ أن القرآن كلام اللَّه، وليس بمخلوقٍ، وكيف يكون شيءٌ مِن الرَّبِّ عزَّ ذكره مخلوقًا؟

ولو كان ما قالوا، لكان يلزمهم أن يقولوا : عِلمه، وقُدرته، ومشيئته مخلوقة .

فإن قالوا ذلك، لزمهم أن يقولوا : كان اللَّه تبارك وتعالى اسمه ولا علم، ولا قُدرة، ولا مَشيئة، وهو الكفر المحض الواضح، لم يزل اللَّه عالمًا، مُتكلِّمًا له المشيئة والقُدرةُ في خلقِهِ .

والقرآنُ كلام اللَّه، وليس بمخلوقٍ، فمن زعم أنَّه مخلوق، فهو كافر، ومن وقف فهو شرٌّ مِنه .

٣٦٧ - گوێم لە إسحاق بوو دەیووت : لە ناو ئەهلی عیلمدا هیچ ڕاجیایی و ئیختلاف نییە کەوا قورئان ووتە و کەلامی الله یە و درووستکراو نییە، چۆن دەبێ شتێک لە پەروەردگار درووستکراو بێت؟

ئەگەر واشیان وتبا، ئەوا ناچار دەبن بڵێن : زانستەکەی و تواناکەی و ویستەکەی درووستکراون .

ئەگەر ئەمەیان ووت، ئەوا ناچار دەبن بڵێن : الله تبارک و تعالی هەبووە و زانست و توانا و ویستی نەبووە، کە ئەمە کوفرێکی پوخت و ڕوونە .

الله هەموو کات زانا بووە، قسەکار بووە و ویست و توانای هەبووە لە درووستکراوەکانیدا .

وە قورئانیش ووتە و كەلامی اللە یە و درووستكراو نییە، بۆیە هەركەسێك پێی وابێت قورئان درووستكراوە، ئەوا كافرە ئەوەشی بوەستێت - لەوەی بڵێ نازانم قورئان درووستكراوە یاخود نا - ئەوا لەو خراپترە .

**٣٦٨** - حدثنا إبراهيم بن الحارث، قال : قال أحمد بن حنبل القرآنُ كلامُ اللَّه، ومَن قال : إنَّه مخلوقٌ، فهو كافِر .

والقرآنُ مِن عِلم اللَّه، وفيهِ أسماؤهُ، وعِلمُ اللَّه ليس بمخلوق، وقال الله : ﴿**الرَّحْمَٰنُ** (١) **عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ** (٢) **خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ** (٣) **عَلَّمَهُ الْبَيَانَ** (٤)﴾ [**الرحمن**] .

فالقرآنُ مِن عِلمِ اللَّه، وعِلمُ اللَّه ليس بمخلوق، فيه أسماؤه .

**٣٦٨** - أحمد بن حنبل ووتی : قورئان ووتە و كەلامی اللە یە، وە هەركەسێك بڵێ : درووستكراوە، ئەوا كافرە .

وە قورئان لە عیلم و زانستی اللە یە، وە ناوەكانی اللە ی تێدایە، وە زانستی اللە درووستكراو نییە، وە اللە دەفەرمووێت : ﴿**الرَّحْمَٰنُ** (١) **عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ** (٢) **خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ** (٣) **عَلَّمَهُ الْبَيَانَ** (٤)﴾ [**الرحمن**] .

قورئان لە عیلم و زانستی اللە یە، زانستی اللە ش درووستكراو نییە، ناوەكانی اللە ی تێدایە .

**٣٦٩** - قال إبراهيم: وسألتُ إبراهيم بن نصر عن القران؟

فقال: القرآنُ كلامُ اللَّه ليس بمخلوق، ولم يزل اللَّه بكلامه تبارك وتعالى قبل أن يخلقَ الخلق خلقَهُ، ومَن قال: مخلوقٌ، فهو كافر، يُقتل ولا يُستتاب.

**٣٦٩** - إبراهيم ووتى: پرسيارم كرد له إبراهيم بن نصر دەربارەی قورئان؟

ووتى: قورئان ووته و كەلامى الله يە، دروستكراو نييە، وە الله پێش دروستكردنى دروستكراوەكانيشى هەبووە بە ووتەكانييەوە، بۆيە هەركەسێك بڵێ: دروستكراوە، ئەوا كافرە، دەكوژرێ و داواى تەوبەی لێ ناكرێ.

**٣٧٠** - سمعت إسحاق بن إبراهيم، قال: القرآنُ كلامُ اللَّه، تكلَّمَ به، من قال: إنَّه كعبادِ اللَّه، فهو كافِر.

**٣٧٠** - گوێم له إسحاق بن إبراهيم بوو ووتى: قورئان ووتەى الله يە، قسەى پێ كردووە، هەركەسێك بڵێ وەك بەندەكانى الله يە - واتە بڵێ قورئان وەك بەندەكان دروستكراوى الله يە - ، ئەوا ئەو كەسە كافرە.

**٣٧١** - حدثنا أبو موسى هارون بن زياد، عن أبي بكر بن عيَّاش، قال: مَن زعمَ أنَّ القرآنَ مخلوقٌ، فهو كافِر.

قال أبو مُوسى : وأنا أقولُ : من زعمَ أن القرآنَ مخلوقٌ، فهو كافِر .

**٣٧١** - أَبي بكر بن عيَّاش ووتی : هەرکەسێک پێی وابێت قورئان درووستکراوە، ئەوا کافرە .

أَبو موسى ووتی : وە منیش دەڵێم : هەرکەسێک پێی وابێت قورئان درووستکراوە، ئەوا کافرە .

**٣٧٢** - حدثنا عبدة بن عبد الرحيم، قال : سمعت وكيع بن الجراح يقول : مَن قال : القرآن مخلوقٌ، فهو كافِر .

**٣٧٢** - وكيع بن الجراح دەڵێت : هەرکەسێک بڵێت : قورئان درووستکراوە، ئەوا کافرە .

**٣٧٣** - حدثنا أبو موسى هارون بن زياد، قال : سمعت الفريابي وسأله رجلٌ عمن قال : القرآنُ مخلوق؟

قال : سألتُ سُفيان الثوري عمن قال : القرآن مخلوق؟

قال : كافِر بالله العظيم .

**٣٧٣** - الفريابي، کە پیاوێک پرسیاری لێکرد دەربارەی ئەو کەسەی کە وتوویەتی : قورئان درووستکراوە؟

ووتی : پرسیارم لەسفیان الثوري كرد دەربارەی ئەوەی كە وتوويەتی : قورئان دروستكراوە؟

وتی : كافرن بە اللە ی مەزن .

**٣٧٤** - حدثنا أبو علي الحسن بن الصَّباح البزَّار، قال : عن سعيد الضُّبَعي، قال : القرآنُ كلامُ اللَّه، ومِن اللَّه، وليس من الله شيءٌ مخلوق، ومَن زعمَ أن القرآن مخلوقٌ، فهو كافِر .

وقال أبو عاصم النَّبيل : القرآنُ كلام اللَّه، وليس بمخلوق، ومن قال : مخلوقٌ، فهو كافِر .

وقال يعلى بن عُبيد : القرآنُ كلامُ اللَّه، وليس بمخلوقِ، ومَن زعمَ أنَّه مخلوقٌ، فهو كافِر، هذا قول الجهمية .

**٣٧٤** - سعيد الضبعي ووتی : قورئان كەلامی اللە يە، وە لە اللە وەيە، وە هيچ شتێک نييە لە اللە وەبێت و دروستكراو بێت، هەركەسێک پێی وابێت قورئان دروستكراوە، ئەوا كافرە .

وە أبو عاصم النَّبيل ووتی : قورئان كەلامی اللە يە، وە دروستكراو نييە، وە هەركەسێک بڵێت : دروستكراوە، ئەوا كافرە .

وه يعلى بن عبيد ووتى : قورئان كەلامى اللە يە، وە درووستكراو نييە، وە هەركەسێك پێى وابێت قورئان درووستكراوە، ئەوا كافرە، ئەوە ووتەى جەهمييەكانە - واتە ووتەى جەهمييەكانە كە دەڵێن قورئان درووستكراوە، پەنا بە اللە - .

**٣٧٥** - حدثنا حماد بن المُبارك، قال : حدثنا يحيى بن خلف أبو محمد المُقرئ، قال : كُنا عند مالك بن أنس، فسألَه رجلٌ : ما تقول في مَن قال : القرآنُ مخلوق؟

قال : زِندقٌ، كافِرٌ، اقتُلوه .

ثم قال مالكٌ : ما سمعتُ هذا الكلام مِن أحد غيرك .

قال يحيى : ثم أتيتُ مِصر، فلقيت الليث بن سعد، وابن لهيعة، فقلت لهما : ما تقولان في من قال : القرآنُ مخلوق؟

قالا : كافِر.

قال : ثم أتيتُ الكوفة، فلقيت أبا بكر بن عيَّاش، فسألته؟

فقال : كافِرٌ، وكلُّ من لم يقُل : إنَّه كافِر، فهو كافِر .

ثم قال أبو بكر : أيُشكُّ في اليهوديِّ والنَّصرانيِّ أنهما كافران؟!

فَمن شكَّ في هؤلاءِ أنَّهم كُفارٌ، فهو كافِرٌ .

والذي يقولُ : القرآن مخلوقٌ مثلهما .

قال: ثم لقيت حفص بن غياث، ويحيى بن زكريا بن أبي زائدة، وحُسين الجُعفي، وعبد السَّلام المُلائي، ووكيع، وابن إدريس، فقلت لهم: ما قال الرَّجلُ لمالك؟

فقالوا كُلُّهم: كافِر.

قال: ثم لقيت هُشيم، وعلي بن عاصم، ويزيد بن هارون فسألتهم؟

فقالوا: كافِر.

ثم قدمت المِصِّيصة، فلقيت عبد الله بن المبارك، وأبا إسحاق الفزاري، ومخلد بن حُسين، وعلي بن بكَّار، فسألتهم؟

فقالوا: كافِر.

قال: ثم أتيتُ الشَّام، فلقيت الوليد بن مُسلم فسألته؟

فقال: كافِر.

**٣٧٥** - يحيى بن خلف أبو محمد المقرئ ووتى: ئێمه له لای مالك بن أنس بووین، پیاوێک پرسیاری لێکرد: ئایه چی دەڵێیت دەربارەی ئەو کەسەی کە وتوویەتی: قورئان درووستکراوه؟

ووتی: زەندیقه، کافره، بیکوژن.

پاشان مالک ووتی: ئەم قسەیه بێجگه له تۆ له هیچ کەسێکم نەبیستووه.

یحیی ووتی: پاشان چوومه مصر، گەیشتم به لیث بن سعد و ابن لهیعة، پێم ووتن: ئایه چی دەڵێن دەربارەی ئەوانەی کە وتوویانه: قورئان درووستکراوه؟

ووتیان : کافرە .

ووتی : پاشان چوومە کوفە، گەیشتم بە أبا بکر بن عیَّاش پرسیارم لێ کرد؟
- والله اعلم واتە هەمان پرسیاری پێشووی لێکردووە - .

ووتی : کافرە، وە هەموویان نەڵێن : ئەوە کافرە، ئەوا خۆی کافرە - واتە هەرکەسێک بڵێت قورئان درووستکراوە و بەکافری دانەنێ ئەوا خۆی کافر دەبێتەوە - .

پاشان أبو بکر ووتی : ئایە گومانتان لە کافر بوونی یەهودی و نەصرانی هەیە؟

هەرکەسێک گومانی هەبێت لەوەی کە ئەوان کافرن، ئەوا خۆی کافرە .

وە ئەوانەی کە دەڵێن : قورئان درووستکراوە، وەکو ئەوانن - واتە هاوشێوەی یەهود و نەصاران - .

ووتی : پاشان گەیشتم بەحفص بن غیاث و یحیی بن زکریا بن أبي زائدة و حسین الجعفي، و عبد السلام الملائي، و کیع، و إبن إدریس، پێیانم وت : چی دەڵێن دەربارەی ئەو پیاوەی کە پرسیاری لە مالک کرد؟

گشتیان ووتیان : کافرە .

ووتی : پاشان گەیشتم بە هشیم و علي بن عاصم و یزید بن هارون، پرسیارم لێیان کرد؟

ووتیان : کافرە .

پاشان چوومه المصيصة، گەیشتم بە عبدالله بن مبارک و أبا إسحاق الفزاري، وە مخلد بن حسين، و علي بن بكَّار، پرسيارم لێيان كرد؟

ووتيان : كافره .

ووتى : پاشان چوومه شام، گەیشتم بە وليد بن مسلم پرسيارم لێى كرد؟

ووتى : كافره - واته ئەو هەموو شوێنە گەڕاوه و پرسيارى كردووه دەربارەى هەر كەسێک كە بڵێت : قورئان مەخلوقە، گشتيان وتوويانە كافره، والله اعلم - .

**٣٧٦** - أخبرني محمد بن أبي غياث، قال : سمعت الفريابي يقول : مَن قال : القرآن مخلوقٌ، فهو كافِر .

وسألت ابن أبي أويس، وأبا مُصعب الزُّهري، وإبراهيم بن حمزه بن مُصعب بن الزُّبير بن العوام عمن قال : القرانُ مخلوق؟

فقالوا : كافِر .

**٣٧٦** - محمد بن أبي غياث ووتى : گوێم لە الفريابي بوو كە دەڵێت : هەر كەسێک بڵێت : قورئان درووستكراوه، ئەوا كافره .

وە پرسيارم كرد لە إبن أبي أويس، و أبا مصعب الزهري، و إبراهيم بن حمزة بن مصعب بن الزبير بن العوام، دەربارەى ئەو كەسەى وتوويەتى : قورئان درووستكراوه .

وتيان : ئەوا ئەو كەسە كافرە .

**٣٧٧** - حدثنا أبو بكر محمد بن يزيد، قال : أخبرنا الهيثم بن جميل، قال : القرآنُ كلامُ الله ليس بمخلوق .

**٣٧٧** - الهيثم بن جميل ووتى : قورئان وتە و كەلامى الله يە، دروستكراو نييە .

**٣٧٨** - وقال أبو الوليد : من لم يَعقِد قلبه أن القرآن ليس بمخلوق، فهو خارجٌ مِن مِلَّةِ الإسلام .

**٣٧٨** - وە أبو الوليد ووتى : هەر كەسێک لە دڵيەوە بڕواى نەبێت كە قورئان دروستكراو نييە، ئەوا دەرچووە لە ميلەتى ئيسلام .

**٣٧٩** - وقال أبو عُبيد : مَن قال : القرآن مخلوقٌ، فهو كافِر .

قلت : لا يُصلَّى عليه؟

قال : لا .

قلت : ولا تجوز الصَّلاة خلفَهُ؟

قال : لا .

قلت : فإن صلَّى خلفه يُعيد الصَّلاة؟

قال : نعم .

**٣٧٩** - وه أبو عبيد ووتى : هەر كەسێك بڵێت : قورئان دروستکراوه، ئەوا كافره .

ووتم : نوێژى لەسەر ناكرێت؟

ووتى : نەخێر .

ووتم : وه درووست نييه نوێژى لەدواوه بكرێت؟

ووتى : نەخێر - واته درووست نييه نوێژيشى لەدواوه بكرێت - .

ووتم : ئەگەر نوێژى لەدواوه كرد ئەوا نوێژەكەى دووباره دەكاتەوه؟

ووتى : بەڵێ .

**٣٨٠** - قال أبو نُعيم : مَن قال القرآن مخلوقٌ، فهي الزَّندقة الصَّلعاء .

**٣٨٠** - أبو نعيم ووتى : هەر كەسێك بڵێت قورئان درووستکراوه، ئەوا زەنديقێكى ڕووته .

**٣٨١** - وقال أحمد بن يونس : هذا الكفر، ثم قال : خليفةٌ يدعو النَّاسَ إلي الكفرِ! إِنَّ هذا لهو البلاءُ العظيم .

**٣٨١** - وه أحمد بن يونس ووتى : ئەوە كوفرە - واتە هەر كەسێك بڵێت قورئان مەخلوقە ئەوا كافرە - ، پاشان ووتى : خەلیفەیەک بانگەوازى خەڵکى بكات بۆ كوفر، بەڕاستى ئەوە بەڵایەكى گەورەیە .

**٣٨٢** - وقال النُّفيلي : مَن قال : القرآن مخلوقٌ فقد كفر بالله، و كذَّبَ بالقرآن .

**٣٨٢** - وه النفيلي ووتى : هەر كەسێك بڵێت قورئان درووستكراوە، ئەوا كافر بووە بە الله، وە قورئانى بەدرۆخستۆتەوە .

**٣٨٣** - وقال سُليمان بن داود الهاشمي : مَن قال : القرآن مخلوقٌ فقد كفرَ، لا يُصلَّى خلفه، و لا يُصلَّى عليه .

**٣٨٣** - وه سليمان بن داود الهاشمي ووتى : هەر كەسێك بڵێت : قورئان درووستكراوە، ئەوا كوفرى كردووە، نوێژى لەدواوە ناكرێت، وە نوێژى لەسەر ناكرێت - كاتێک مرد نوێژى نابێت لەسەرى بكەیت - .

**٣٨٤** - و قال عبد الله بن داود : مَن زعمَ أن القرآنَ مخلوقٌ ينبغي أن يُنزعَ لسانه مِن قفاهُ .

**٣٨٤** - وه عبد الله بن داود ووتى : هەر كەسێك پێى وابێت قورئان دروستكراوه، ئەوا پێویسته زمانى له پشته سەرییەوه دەربهێندرێت .

**٣٨٥** - و قال محمد بن عيسى : مَن قال القرآن مخلوقٌ فقد كفر .

**٣٨٥** - وه محمد بن عيسى ووتى : هەر كەسێك بڵێت قورئان دروستكراوه، ئەوا كوفرى كردووه .

**٣٨٦** - حدثنا عباس بن عبد العظيم، قال : أخبرنا محمد بن يحيى ابن سعيد، قال : سمعت مُعاذ بن مُعاذ، قال : مَن قال : القرآن مخلوق فهو كافِرٌ بالله .

**٣٨٦** - إبن سعيد ووتى : گوێم له معاذ بن معاذ بوو ووتى : هەر كەسێك بڵێت : قورئان دروستكراوه، ئەوا كافر بووه به الله تعالى .

**٣٨٧** - حدثنا الحسن بن الصَّباح، عن إبراهيم بن نصر، قال : سمعت أبا النَّضر يقول : مَن زعمَ أن القرآنَ مخلوقٌ فهو كافِرٌ بالله .

**٣٨٧** - أبا النضر دەڵێت : هەر کەسێک پێی وابێت قورئان دروستکراوە، ئەوا کافرە بە الله تعالى .

**٣٨٨** - حدثنا إسحاق بن إبراهيم، عن سُفيان بن عُيينة، عن عَمرو بن دينارٍ، قال : أدركتُ النَّاسَ مُنذُ سبعين سَنةً، أدركت أصحابَ النبي ﷺ فمَن دونهم، يقولون : الله الخالقُ، وما سِواه مخلوقٌ، إلَّا القرآن، فإنَّه كلامُ الله، مِنه خرجَ، وإليه يعود .

**٣٨٨** - عمرو بن دینار ووتی : لەماوەی حەفتا ساڵ گەیشتم بە خەڵک، گەیشتم بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و دوای ئەوانیش، دەڵێن : الله دروستکارە - الخالق - ، بێجگە لەو هەموو شتێک دروستکراوە - مخلوق - ، ئیللا قورئان نەبێت - واتە ئیللا قورئان نەبێت کە مەخلوق نییە - ، کە کەلامی الله یە، لەوەوە دەرچووە، وە بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە .

**٣٨٩** - حدثنا أحمد بن حنبل، وعَمرو بن العباس، قالا : حدثنا عبد الرحمن بن مهدي، قال : ثنا معاوية بن صالح، عن العلاء بن الحارث، عن زيد بن أرطأة، عن جُبير بن نُفير، قال : قال رسول اللَّه ﷺ : (إنَّكم لن ترجِعُوا إلى الله بشيءٍ أفضلَ مِمَّا خرجَ منهُ) يعني : القرآن .

**٣٨٩** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (بۆ لای الله تعالى ناگەڕێنە بەشتێک کە باشتر بێت لەوەی لێیەوە دەرچووە)، واتە : قورئان .

---

: **البخاري له (خلق أفعال العباد : ٥٣٣)** دەڵێت : ئەو هەواڵە درووست نییە بەهۆی پچڕانیەوە، وە **الترمذي (٢٩١٢)** وتویەتی کە حەدیسەکە : مرسل ە، بەڵام مانای ئەوە نیە کە بڵێین ماناکەی صحيح نییە .

**٣٩٠** - حدثنا سعيد بن نوح، نا أبو النضر هاشم بن القاسم، نا بكر ابن خُنيس، عن ليث بن أبي سُليم، عن زيد بن أرطأة، عن أبي أُمامة قال : قال رسول الله ﷺ : مَا تقرَّبَ المُتقرِّبونَ إلى الله بشيءٍ أفضلَ مِمَّا خرجَ مِنهُ . يعني : القرآن .

**٣٩٠** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (نزیکبووەکان نزیک نابنەوە لە الله بەشتێک باشتر لەوەی لەوەوە دەرچووە) واتە : قورئان .

---

: واتە گەر دەتانەوێت لە الله نزیک ببنەوە ئەوا بەهۆی قورئانەوە نزیک دەبنەوە، چونکە کەلامی الله یە و لەوەوە دەرچووە، والله اعلم، **رواه أحمد (٢٢٣٠٦)** .

**٣٩١** - حدثنا الحسن بن الصَّباح، قال : ثنا حاجب، عن بقيَّة بن الوليد، عن أبي بكر بن أبي مريم، عن عطية بن قيس الكلابي، قال : ما تقرَّبَ العباد إلى الله بشيءٍ أحبَّ إليه مِن كلامهِ، و لا رَدُّوا إليه كلامًا أحبَّ إليه مما خرجَ منه .

**٣٩١** - عطية بن قيس الكلابي ووتی : هیچ شتێک نییه که بەندە بەهۆیەوە لە اللە نزیک بێتەوە خۆشەویستریێت لە کەلامی - واتە وتەی اللە تعالی - ، وە هیچ قسەیەک نییە کە بیگەڕێننەوە بۆ اللە تعالی خۆشەویستتریێت لەوەی کە لێی دەرچووە .

---

: واتە خۆشەویسترین هۆکار بۆ نزیک بوونەوە لە اللە تعالی قورئانە، واللە اعلم .

**٣٩٢** - سمعت أبا الرَّبيع الزَّهراني، و أبا ثور، والعباس العنبري، ويحيى الحِمَّاني، وإبراهيم بن بشَّار، يقولون : القرآن كلامُ الله تكلَّم به .

**٣٩٢** - گوێم لە أبا الربيع الزهراني، و أبا ثور، و العباس العنبري، و يحيى الحمَّاني، و إبراهيم بن بشَّار بوو دەیانووت : قورئان کەلامی اللە یە، قسەی پێکردووە .

**٣٩٣** - قال إبراهيم : وسمعتُ سُفيان بن عُيينة يقول : القرآنُ كلام الله، مَن قال غيرَ ذلك فهو مُبتدع .

**٣٩٣** - إبراهيم ووتی : گوێم لە سفيان بن عيينة بوو دەیووت : قورئان کەلامی اللە یە، هەر کەسێک جگە لەوە بڵێت، ئەوا بیدعەچییە .

**٣٩٤** - سألتُ محمد بن بشَّار، قلتُ : أيام يحيى بن سعيد، ومُعتمر ابن سُليمان، وأصحابك تكلَّمَ النَّاسُ في القرآن؟

قال : نعم، ولكن هارون أمير المؤمنين، كان لا يؤتى بأحدٍ زعمَ أن القرآن مخلوقٌ إلَّا قتلَهُ .

قال أبو بكر : وأنا أقول : القرآنُ كلامُ الله تكلَّم به .

**٣٩٤** - پرسیارم له محمد بن بشَّار کرد، ووتم : ڕۆژانێک یحیی بن سعید و معتمر إبن سلیمان، وه هاوه‌ڵه‌کانت خه‌ڵکی قسه‌یان ده‌کرد ده‌رباره‌ی قورئان؟

ووتی : به‌ڵێ، به‌ڵام هاڕون ئه‌میری ئیمانداران، هیچ که‌سێکیان نه‌ده‌برده لای که پێی وابێت قورئان درووستکراوه ئیللا ده‌یکوشت .

أبو بکر ووتی : وه منیش ده‌ڵێم : قورئان که‌لامی الله یه قسه‌ی پێکردووه .

**٣٩٥** - وسمعته يقول : مَن زعمَ أنَّ اللّٰهَ عزوجل لم يُكلِّم مُوسى فهو كافِر .

قلتُ : فالصَّلاة خلفَ مَن زعمَ أن القرآن مخلوق؟

قال : لا يُصلَّى خلفه .

**٣٩٥** - وه گوێم له‌و بوو ده‌یووت : هه‌ر که‌سێک پێی وابێت الله عزوجل قسه‌ی نه‌کردووه له‌گه‌ڵ موسی، ئه‌وا کافره .

ووتم : ئايا نوێژكردن درووستە لەدوای ئەو كەسەی كە پێی وایە قورئان درووستكراوە؟

ووتی : نەخێر، نوێژی لەدواوە ناكرێت .

**٣٩٦** - حدثنا أحمد بن حنبل، قال : ثنا أسود بن عامر، قال : ثنا إسرائيل، عن عثمان بن المغيرة، عن سالم بن أبي الجعد، عن جابر بن عبد الله قال : كان رسول الله ﷺ يعرض نفسه على النَّاسِ بالموقف، فيقول : هل مِن رجلٍ يحملني إلى قومِهِ، فإنَّ قريشًا قد منعوني أن أُبلِّغ كلامَ ربِّي .

**٣٩٦** - رسول الله ﷺ خۆی ئاشكرا دەكرد لە خەڵك لە هەندێك حاڵەت، دەیفەرموو : (ئايا هيچ پياوێك هەيە بمبات بۆ ناو قەومەكەی، بەڕاستی قورەيش ڕێگريان لێ كردم لەوەی كەلامی پەروەردگارم بگەيەنم) .

---

: **رواه أحمد (١٥١٩٢)، وأبو داود (٤٧٣٤)، والترمذي (٢٩٢٥)**، وە دەڵێت : حەديسەكە حسن صحيح ە .

**٣٩٧** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، قال : ثنا بقيَّة بن الوليد، قال : حدثنا عيسى بن إبراهيم، عن موسى بن أبي حبيب، عن الحكم بن عمير الثُّمالي، قال : قال : رسول الله ﷺ : ينزلُ القرآنَ، وهو كلامُ الله .

**٣٩٧** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (قورئان دادەبەزێنرێت، وە قورئان کەلامی الله یه) .

---

: **رواه خلال في (السنة : ٢٠٧٤)** .

**٣٩٨** - حدثنا إسحاق، قال : أخبرنا جرير، عن ليث بن أبي سليم، عن سلمة بن كُهيل، عن أبي الزَّعراء، قال : قال : عُمر : إنَّ هذا القرآن كلامُ الله، فلا أعرفنَّكم ما عطفتموه على أهوائكم .

**٣٩٨** - عمر ووتی : بەڕاستی ئەو قورئانە کەلامی الله یه، وە ناشزانم چیتان زیاد کردووە بەهەواو و ئارەزووی خۆتان .

**٣٩٩** - حدثنا علي بن عبد الله، قال : حدثنا سُفيان بن عُيينة، قال : قال عثمان بن عفَّان : لو أن قلوبنا طهرت ما شبعت مِن كلامِ الله .

**٣٩٩** - عثمان بن عفان ووتی : ئەگەر دڵەکانمان پاک بوایە ئەوا هەرگیز تێر نەدەبوو لە کەلامی الله .

**٤٠٠** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، قال : حدثنا عبد الله بن محمد، عن عَمرو بن جُميع، عن ميمون بن مهران، عن ابن عباس، قال : لما حكَّمَ عليٌّ الحكمين، قالت له الخوارج : حكَّمتَ رجلين؟

قال : ما حكَّمتُ مخلوقًا، و إنَّما حكَّمتُ القرآن .

**٤٠٠** - إبن عباس ووتى : لەو كاتەى علي ناوبژيوانى دوو پياوى كرد، خەواريجەكان وتيان : حوكم دەكەيت لەنێوان دوو پياو - يەكێكيان مووناقق و ئەوى تر كافر بوو - ؟

ووتى : دروستكراوم نەكردووە بە حاكم - واتە قورئان دروستكراو نييە - حوكمم نەكردووە ئيللا بە قورئان نەبێ .

**٤٠١** - حدثنا عمرو بن زُرارة، قال : حدثنا محمد بن يزيد الواسطي، عن نافع بن عمر، عن ابن أبي مُليكة، قال : كانت أسماء بنت أبي بكر إذا سمعت القرآن قالت : كلامُ ربي، كلامُ ربي .

**٤٠١** - إبن أبي مليكة ووتى : أسماء ى كچى أبو بكر كاتێك گوێى لە قورئان دەبوو دەيووت : كەلامى پەروەردگارم، كەلامى پەروەردگارم .

٤٠٢ - حدثنا العلاء بن عَمرو الحنفي، قال: حدثنا يحيى بن زكريا ابن أبي زائدة، قال: حدثنا مُجالد، عن الشُّعبي، عن مسروق، عن عبد الله بن مسعود قال: القرآنُ كلام الله، فمن ردَّ منه شيئًا، فإنَّما يردُّهُ على الله.

٤٠٢ - عبد الله بن مسعود ووتی: قورئان كەلامی الله یه، هەر كەسێك شتێكی تێدا ڕەتبكاتەوە، ئەوا ڕەتی دەكاتەوە بۆ سەر الله.

٤٠٣ - حدثنا بشر بن حجر، قال: حدثنا صالح المُرِّي، قال: قال الحسن: القرآنُ كلامُ الله إلى القوَّةِ والصَّفاءِ، والأعمالُ: أعمال بني آدم إلى الضَّعفِ والتَّقصيرِ، فاعمل وأبشر.

٤٠٣ - الحسن ووتی: قورئان كەلامی الله یه بۆ لای هێز و پاك و بێگەردیی، وە كردەوەكان: كردەوەی بەنی ئادەم بۆ لای لاوازی و كەموكورتیه، بۆیه كار بكه و مژده بده.

٤٠٤ - حدثنا عُبيد الله بن مُعاذ، قال: ثنا أبي، عن السَّري بن يحيى، عن محمد بن سيرين، قال: قال الحجاج بن يوسف وهو يخطبُ: إنَّ ابن الزُّبير كان يُبدِّلُ كلامَ الله.

فقال له عبد الله بن عُمر: كذبت، لا تستطيع، ولا ابن الزُّبير أن تبدِّلوا كلام الله.

**٤٠٤** - محمد بن سيرين ووتی : حجاج بن یوسف وتاری دەدا، ووتی : بەڕاستی إبن الزبیر کەلامی الله تعالی ی گۆڕی .

عبد الله بن عمر پێی ووت : درۆت کرد، نە تۆ نە إبن الزبیر ناتوانن کەلامی الله تعالی بگۆڕن .

**٤٠٥** - حدثنا إبراهيم بن الحارث، قال : ثنا الحسن بن بشر، قال : ثنا سعدان بن الوليد، عن عطاء، عن ابن عباس، قال : دخلَ رسولُ الله ﷺ على أُمِّ هانئ بنت أبي طالب، فقالت له : يا رسول الله، إن لي أصهارًا قد لجأوا إليَّ، وإن عليَّ بن أبي طالب لا تأخذه في الله لومة لائم، وإني أخاف أن يعلم بهم، فيقتلهم، فاجعل من دخل داري آمنًا، حتَّى يسمعَ كلامَ الله . فأمَّنهم رسول الله ﷺ .

**٤٠٥** - رسول الله ﷺ چووە لای أم هانئ کچی أبو طالب، أم هانئ ووتی : ئەی رسول الله من زاوام هەیە هانایان بۆ من هێناوە، وە علي بن أبي طالب لەپێناو الله لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێک نایگێڕێتەوە، منیش ترسی ئەوەم هەیە علي بن أبي طالب پێی بزانێ، و دواتر بیانکوژێت، بۆیە هەر کەسێک دێتە ماڵەکەم تۆ ئەمین و پارێزراوی بکە، هەتاوەکو گوێبیستی وتە و کەلامی الله دەبن - واتە هەتاوەکو حوججە و بەڵگەکانیان بۆ دەخرێتەڕوو - ، رسول الله ش ﷺ ئەمین و پارێزراوی کردن .

**٤٠٦** - سمعت إسحاق بن إبراهيم، وسُئل عن الرَّجل قال: القرآن ليس بمخلوقٍ، ولكن قراءتي أنا له مخلوقة، لأني أحكيه، و كلامنا مخلوق؟

فقال إسحاق: هذا بدعةٌ، ولا يُقارُّ على هذا حتَّى يرجعَ، ويدع قوله هذا.

**٤٠٦** - گوێم له إسحاق بن إبراهیم بوو، وه پرسیاری لێكرا دەربارەی پیاوێك كه وتویەتی: قورئان دروستكراو نییه، بەڵكو خوێندنەوەی من بۆی دروستكراوه، چونكه من دەیگێڕمەوه، وه قسەكانمان دروستكراوه؟

إسحاق وتی: ئەوە بیدعەیه، لەسەر ئیسلام نامێنێتەوه تاوەكو دەگەڕێتەوه و تەوبه دەكات، وه واز لەو قسەیه دێنێت.

**٤٠٧** - حدثنا سُليمان بن الأشعث، قال: ثنا يعقوب بن إبراهيم، أن أحمد بن حنبل قال: اللفظية إنَّما يدورُون على كلام جهم، يزعمون أن جبريل مخلوق، وأنَّه إنَّما جاء بشيءٍ مخلوق إلى محمدٍ، وهو مخلوق.

**٤٠٧** - أحمد بن حنبل وتی: لەفزیەكان قسەكانیان دەسوڕێتەوه لەسەر كەلامی جەهمیەكان، پێیان وایه جبریل دروستكراوه، وه شتێكی دروستكراوی هێناوه بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ، ئەویش دروستكراوه.

---

: واته پێیان وایه كه مادام جبریل خۆی مخلوقه و قورئانی هێناوه بۆ پێغەمبەر ﷺ كەواته ئەو قورئانەش مخلوقه، والله اعلم.

**٤٠٨** - حدثنا إسحاق بن إبراهيم، قال: حدثنا محمد بن أعين، أنَّه شَهِد ابن المُبارك وقيل له: **النَّضر بن محمد يقول: من قال: ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي﴾** [طه: ١٤] مخلوقٌ، فهو كافِر.

فقال ابن المُبارك: صدقَ النَّضر.

**٤٠٨** - به إبن مبارك وترا: النضر بن محمد دەڵێت: هەرکەسێک بڵێت: **﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي﴾** [طه: ١٤] درووستکراوە، ئەوا کافرە.

إبن مبارك وتی: نضر ڕاستی کرد.

**٤٠٩** - حدثنا أبو إسحاق إبراهيم بن الحارث، قال: حدثنا موسى ابن إبراهيم، قال: حدثنا شريك، عن مُجالد، عن الشَّعبي، عن عامر بن شهر، قال: وحدثني محمد بن هاشم، عن أبيه، عن أبي عقيل، عن مُجالد، عن الشَّعبي، عن عامِر بن شهر، وكان من الوفد الذين وفدوا على النَّجاشيَّ مِن همدان قال: كُنَّا عند النَّجاشي، و جاء ابنٌ له من الكُتَّابِ، فقرأ سورة مِن الزَّبور، قال: فضحكتُ.

فقال لي النَّجاشي: أتضحكُ مِن كلامِ الرَّحمنِ؟!

**٤٠٩** - عامر بن شهر لەو وەفدە بوو کە نێردرابوو بۆ لای نەجاشی لە هەمەدان، ووتی: ئێمە لای نەجاشی بووین و کوڕەکەی بە نوسراوێکەوە هات، سوڕەتێکی لە زەبور خوێندەوە، ووتی: منیش پێکەنیم.

نەجاشی پێی ووتم : ئایا پێدەکەنیت بە کەلامی الرحمن؟!

**٤١٠** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا خلف بن خليفة، عن حُميد الأعرج، عن عبد الله بن الحارث، عن ابن مسعود، عن النبي ﷺ قال : يومَ كلَّمَ اللّٰهُ موسى كان عليه جُبَّة صُوف، وكِساء صُوف، وسراويل صُوفٍ، وكُمّه صوف، ونعلينِ مِن جلدِ حمارٍ غيرِ ذكيٍّ .

**٤١٠** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (لەو ڕۆژەی الله قسەی لەگەڵ موسى کرد، کە جوبەیەکی خوریی لەبەر بوو، وە جلوبەرگێکی خوری و شەرواڵێکی خوری و قۆڵی خوری، وە دوو جووت نەعلە کە لەپێستی گوێدرێژ بوون) .

---

: پرسیار کراوە لە ئیمام أحمد دەربارەی ئەو حەدیسە وتویەتی : کە ئەو حەدیسە مونکەڕە و صحیح نییە، حەدیسەکانی حمید لە عبد الله بن الحارث مونکەڕە .

**٤١١** - حدثنا الحسن بن الصَّباح، وعبد الرحمن بن محمد بن سلام، قالا : ثنا علي بن عاصم، قال : حدثنا الفضل بن عيسى الرَّقاشي، قال : ثنا محمد بن المنكدر، قال : سمعت جابر بن عبد الله قال : قال رسول الله ﷺ : لما كلَّمَ اللّٰهُ موسى يوم الطُّور، كلَّمَهُ بغيرِ الكلامِ الذي كلَّمَهُ به يومَ ناجاهُ، فقال له موسى : هذا كلامُكَ الذَي كلمتني به؟ قال : يا موسى، لقد كلَّمتك بقوَّةِ عشرةِ آلافِ لسانٍ، ولي قُوَّة الألسِنَة كُلّها، وأنا

أقوى مِن ذلك . فلمَّا رجعَ موسى إلى بني إسرائيل، قالوا : يا موسى صِف لنا كلامَ الرَّحمنِ . قال : لا أستطيعُ : قالوا : بيِّنه . قال : ألم تروا إلى أصواتِ الصَّواعِقِ التي تُقبِلُ بأحلى حلاوة سمعتُموه، فإنَّه قريبٌ منه، وليس به .

**٤١١** - رسول الله ﷺ فەرموويەتی : (كاتێك الله تعالى لەڕۆژی طور قسەی لەگەڵ موسى كرد، قسەی لەگەڵ كردووە بە جگە لەو قسەيەی كە قسەی پێ كرد لەو ڕۆژەی موناجاتی لەگەڵ كرد، موسى بە الله ی فەرموو : ئەوە كەلامی تۆیە كە قسەی پێدەكەیت لەگەڵ من؟

فەرمووی : ئەی موسى، قسەم لەگەڵ كردی بە هێزی دە هەزار زمان، وە من هێزی گشت زمانەكانم هەیە، وە من لەوە بەهێزترم، كاتێك موسى گەڕایەوە ناو بەنی اسرائیل وتیان : ئەی موسى قسەی الرحمن مان بۆ وەسف بكە، ووتی : ناتوانم، وتیان : ڕوونی بكەوە . ووتی : ئێوە نابینن دەنگی بروسكەكان كە دێن بەخۆشترین شێوە دەیبیستن، لەووە نزیكە، بەڵام ئەو نییە) .

---

: **رواه إبن أبي حاتم في (التفسير ـ ٦٢٨٦،١٦٨٨٢)**، ئیسنادەكەی ضعيفه .

**٤١٢** - حدثنا عباس بن عبد العظيم، قال : ثنا علي بن عبد اللّٰه، و زيد بن مُبارك، قالا : حدثنا محمد بن عمرو بن مقسم، عن عطاء بن مسلم، عن وهب بن مُنبَّه، قال : كلَّمَ اللّٰهُ موسى في ألفِ مقامٍ، كُلما كلَّمَه رُؤي النُّورُ على وجهِهِ ثلاثة أيام، وما قرُبَ موسى امرأة منذُ كلَّمه ربُّه .

**٤١٢** - وهب بن منبِّه ووتی : الله قسەی کردووە لەگەڵ موسی لە هەزار مەقام، هەر کاتێک قسەی لەگەڵ کردبا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ڕووناکی لەسەر ڕووخساری دەبینرا، موسی لەهیچ ئافرەتێک نزیک نەبوویەوە لەو کاتەی قسەی لەگەڵ الله تعالی کرد .

**٤١٣** - حدثنا عيسى بن محمد، قال : ثنا يزيد بن هارون، عن الحسين الجُريري، عن أبي عطَّاف، قال : كتبَ الله التَّوراة لموسى بيدِهِ وهو مُسندٌ ظهره إلى الصَّخرةِ، سَمِعَ صريفَ القلمِ في ألواحٍ مِن دُرٍّ، ليس بينه وبينه إلَّا الحِجاب .

**٤١٣** - أبي عطَّاف ووتی : الله تعالی تەوڕاتی بۆ موسی علیه السلام نوسی بە دەستەکانی وە موسی علیه السلام پشتی پاڵدابۆوە بە بەردێکەوە، گوێی لە دەنگی قەڵەمەکە دەبوو لەسەر لەوحێک لە مرواری، هیچ شتێک نەبوو لەنێوان الله و موسی دا تەنها پەردەکە نەبێت .

**٤١٤** - حدثنا عمرو بن العباس الأهوازي، قال : سمعت عبد الرحمن ابن مهدي، وقيل له : إن أصحابَ جهم يقولون : القرآن المخلوق .

فقال عبد الرحمن : إنَّما أرادوا أن ينفوا أن يكون القرآن كلام الله .

وأرادوا أن ينفوا أن يكون الرحمن على العرش استوى .

وأرادوا أن ينفوا أن يكون الله كلَّم موسى .

لقد ذكرها الله في كتابه، فقال: ﴿**وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا**﴾ [**النِّسَاء: ١٦٤**].

أرى أن يُستتابوا فإن تابوا وإلَّا ضُربت أعناقهم.

قال: وسمعت عبد الرحمن يقول: أرى أن يُعرضَ أصحابُ جهمٍ على السَّيفِ.

**٤١٤** - به عبدالرحمن بن مهدي وترا: هاوەڵانی جەهمیەکان دەڵێن: قورئان دروستکراوە.

عبدالرحمن ووتی: بەڕاستی ئەوان دەیانەوێت نەفی ئەوە بکەن کە قورئان کەلامی الله یە.

وە دەیانەوێت نەفی ئەوە بکەن کە الله بەرزبۆتەوە بۆ سەر عەرش.

وە دەیانەوێت نەفی ئەوە بکەن کە الله قسەی لەگەڵ موسی کردووە.

الله تعالى باسی کردووە لە قورئان، فەرموویەتی: ﴿**وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا**﴾ [**النساء: ١٦٤**].

من وای بە درووست دەزانم کە داوای تەوبەیان لێدەکرێت ئەگینا لەگەردنیان دەدرێت.

ووتی: وە گوێم لە عبدالرحمن بوو دەیوت: هاوەڵانی جەهمیەکان شمشێریان پێ نیشان دەدرێت.

**٤١٥** - حدثنا أبو علي الحسن بن الصَّباح، قال: ثنا قاسم المعمري، قال: ثنا عبد الرحمن بن محمد بن حبيب بن أبي حبيب، قال: حدثني أبي، عن جدِّي حبيب، قال: شَهِدتُ خالد بن عبد الله القسري، وخطب النَّاسَ بواسط يوم النَّحر، فقال: أيها النَّاسُ ارجعوا فضحُّوا، تقبَّلَ الله منكم، فإني مُضحٍ بالجعدِ بن درهم فإنَّه زعم أنَّ الله تبارك وتعالى لم يتخذ أبراهيم خليلًا، ولم يُكلِّم الله موسى تكليمًا، سُبحانه وتعالى عمَّا يقول الجعد بن درهم. ثم نزل إليه فذبحه.

**٤١٥** - حبيب ووتی: خالد بن عبد الله القسري م بينی له ڕۆژی جەژنی قوربان وتاری دەدا بۆ خەڵك له واسط، ووتی: ئەی خەڵكينه، بگەڕێنەوه قوربانی بكەن، الله لێتان قبوڵ بكات، بەڕاستی منيش جعد بن درهم دەكەمه قوربانی، چونكه بەڕاستی ئەو بانگەشەی ئەوە دەكات كەوا الله ابراهيم ی نەكردۆته خليل و خۆشەويستی خۆی، وه الله به قسه كردن قسەی نەكردووه لەگەڵ موسی، پاك و بێگەرد و بڵنده لەوەی كه جعد بن درهم دەيڵێت، پاشان بۆی دابەزی و سەری بڕی.

**٤١٦** - حدثنا أبو بكر محمد بن يزيد، قال: ثنا أبو بكر بن أبي الأسود، قال: سمعت عبد الرحمن بن مهدي يقول: لو كان لي قرابة أنا وارثه، ثم مات لم أرثه، إذا كان ممن يقول: القرآن المخلوق.

**٤١٦** - عبدالرحمن بن مهدي دەڵێت: ئەگەر نزيكێكم من ميراتگری بم، پاشان بمرێ ئەوا من نابمه ميراتگری، ئەگەر يەكێك بێت لەوانەی كه دەڵێن: قورئان درووستكراوه.

**٤١٧** - حدثنا أبو القاسم عبد الرحمن بن محمد بن سلَّام، قال : سمعت رجلًا سأل يزيد بن هارون، فقال : يا أبا خالد، ما تقول في الجهمية؟

قال يزيد : زنادقة، زنادقة، زنادقة .

ومَدَّ بها صَوته في الثَّالثة .

**٤١٧** - محمد بن سلام ووتی : گوێم لە پیاوێک بوو کە پرسیاری دەکرد لە یزید بن هارون، ووتی : ئەی باوکی خالد، چی دەڵێیت دەربارەی جەهمیەکان؟

یزید ووتی : زەندیقن، زەندیقن، زەندیقن، لە سێیەم جار دەنگی درێژ کردەوە .

**٤١٨** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، عن يزيد بن هارون، قال : لقد أُخبرتُ مِن كلام المريسي بشيءٍ وجدّتُ وجعه في صُلبي بعد ثلاث .

**٤١٨** - یزید بن هارون وتی : شتێک لە قسە و کەلامی المریسي پێم گەیشتووە ئازارەکەی ماوەتەوە لە بڕبڕەی پشتمدا تا دوای سێ - والله أعلم سێ ڕۆژ یان شەو - .

**٤١٩** - وسأله رجلٌ مِن أهلِ بغداد، فقال : يا أبا خالد، سمعت بشر المريسي يقول في سُجوده : سُبحان ربي الأسفل؟

فقال يزيد : لإن كنتَ صادِقًا، إنَّ بشر المريسي كافِرٌ بالله العظيم .

وقال : لقد حرَّضت ببغداد على قتلِ بشر المريسي بجهدي .

**٤١٩** - وه له ئههلى بغداد پياوێك پرسيارى كرد، ووتى : ئهى باوكى خالد، گوێم له بشر المريسي بوو كه له سوجدهكانى دهڵێت : پاكو بێگهردى بۆ پهروهردگارى نزمم؟ - واته مهبهستى ئهوهبووه لهژێرهوهيه لهسهرهوه نييه والعياذ بالله -

يزيد ووتى : ئهگهر ڕاستگۆ بووبيت، ئهوا بهڕاستى بشر المريسي كافره به الله تعالى .

وه ووتى : له بغداد زۆر ماندوو بووم بۆ كوشتنى بشر المريسي به ههوڵ و كۆششى خۆم .

**٤٢٠** - حدثنا محمد بن مُصفًّى، عن الفريابي، قال : ألا تستطيعون أن تقتلوا بشرًا المريسي .

**٤٢٠** - الفريابي ووتى : ئايا ناتوانن بشر المريسي بكوژن .

**٤٢١** - حدثنا إبراهيم بن الحارث، قال : سمعت سعيد بن الصَّباح،

قال : جاء رجل إلى سُفيان بن عُيينة، فذكر له كلام المريسي .

فقال سفيان : لقد شرع في هذا الدِّين ما لم يأذن به الله .

ثُمّ قال : مَن زعمَ أن القرآن مخلوقٌ، فهو كافِر .

**٤٢١** - سعيد بن الصَّباح ووتی : پیاوێک هات بۆ لای سفیان بن عیینة، باسی قسەکانی المريسي کرد .

سفیان ووتی : شتانێکی شەرعاندووە لەم دینەدا کە الله مۆڵەتی پێ نەداوە .

پاشان ووتی : هەر کەسێک پێی وابێت قورئان درووستکراوە، ئەوا کافرە .

**٤٢٢** - حدثنا أحمد الحباب، قال : سمعت أبا الصلت، يقول : قال لي علي بن موسى الرِّضي : إنَّ هذا يعني : المأمون يدعوكم لتقولوا : القرآن مخلوقٌ، فلا تقله فإنَّه الكُفر .

**٤٢٢** - أبا الصلت دەڵێت : علي بن موسى الرضى پێی ووتم، بەڕاستی ئەوە واتە المأمون بانگتان دەکات بۆئەوەی بڵێن : قورئان درووستکراوە .

ئاوا مەڵێن، چونکە ئەم قسەیە کوفرە .

**٤٢٣** - حدثنا العباس بن عبد العظيم، قال : حدثني أحمد بن يونس، قال : قال أبو حنيفة عند عيسى بن موسى : القرآن مخلوق .

فقال عيسى لابن أبي ليلى : استتبه، فإن تاب وإلَّا فاضرب عُنقه .

**٤٢٣** - أحمد بن يونس ووتی : أبو حنیفة لای عیسی بن موسی ووتی : قورئان درووستکراوە .

عيسى به إبن أبي ليلى ى ووت : داواى تەوبەى لێدەكرێت، ئەگەر تەوبەى كرد ئەگينا لە گەردنى دەدرێت .

**٤٢٤** - حدثنا أحمد بن الأزهر، قال : حدثني عبد الله بن عون، عن سُفيان الثوري، قال : قال لي حماد بن أبي سُليمان : قل لذاك الكافِرِ أبي حنيفة إن كنت تقول : القرآن مخلوق فلا تقربنَّ مجلسي .

**٤٢٤** - سفيان الثوري ووتى : حماد بن أبي سليمان پێى ووتم : بەو كافره أبي حنيفة بڵێ : ئەگەر تۆ دەڵێيت قورئان درووستكراوە، ئەوا نزيكى مەجليسم نەكەويتەوە .

**٤٢٥** - حدثنا سُليمان بن الأشعث، وإبراهيم بن الحارث، قالا : حدثنا أحمد بن إبراهيم، قال : حدثني زُهير بن نُعيم، أنه سأل سلام بن أبي مُطيع عن الجهمية؟

فقال : كفَّارٌ، فلا يُصلي خلفهم .

قال : وقال زُهير بن نُعيم : أمَّا أنا فإذا تيقنتُ أنه جهميٌّ، أعدت الصَّلاة خلفه، الجمعة و غيرها .

**٤٢٥** - زهير بن نعيم پرسيارى لە سلام بن أبي مطيع كرد دەربارەى جەهميەكان؟

ووتى : كافرن، نوێژيان لەدواوە مەكەن .

ووتى : وە زهير بن نعيم ووتى : هەروەها ئەوكاتەى من دڵنيابوومەوە كە ئەوە جەهميە، ئەوا ئەو نوێژەى لەدواى ئەوەوە كردوومە دەيگەڕێنمەوە، هى جومعە و جگە لەوانيش .

**٤٢٦** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، عن أبي ضمرة أنس بن عياض في الصَّلاة خلف الجهمية .

قال : لا يُصلَّى خلفهم، ﴿**وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ**﴾ [**آل عمران** : ٨٥] .

**٤٢٦** - أبي ضمرة أنس بن عياض دەربارەى نوێژ كردن لەدواى جەهميەكانەوە ووتى : نوێژيان لەدواوە ناكرێت، ﴿**وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ**﴾ [**آل عمران** : ٨٥] .

واتە : هەر كەسێك بێجگە لە بەرنامە و شەريعەتى ئيسلام هەردينێك بۆخۆى هەڵبژێرێت و بيكات بە بەرنامەى خۆى هەرگيز لێى وەرناگيردرێ و لەدوارۆژيشدا لەڕيزى زيانمەندانە .

**٤٢٧** - حدثنا سُليمان بن الأشعث، قال : قلتُ لأحمد : الجمعة؟ قال أنا أُعيدُ، ومتى ما صليتُ خلف أحدٍ ممن يقول : القرآن مخلوق فأعد .

**٤٢٧** - سليمان بن الأشعث ووتی : به أحمد م ووت : نوێژی جومعه دەكرێت؟

ووتی : من دەیگەڕێنمەوە - واته نوێژەكه دووباره دەكاتەوه - ، وە هەر كاتێک نوێژم كردبێ لەدوای كەسێک كە دەڵێت : قورئان دروستكراوە، ئەوا نوێژەكەم گەڕاندۆتەوە .

**٤٢٨** - حدثنا أبو إسحاق العبادي، عن يحيى بن معين، أنه كان يُعيد صلاة الجمعة مُنذُ أظهرَ عبد الله بن هارون ما أظهر .

**٤٢٨** - يحيى بن معين نوێژەكانی لەوكاتەی عبد الله بن هارون دەركەوت نوێژی جومعەی دەگەڕاندەوە .

---

: چونكە عبد الله بن هارون كە ناسراوە بە مأمون دەستی هەبوو لە سەرخستنی عقیدەی إعتزال و جەهمیەت، وە دەیووت قورئان مەخلوقە، والله اعلم .

**٤٢٩** - سمعت علي بن عبد الله قال : بلغني عن ابن المبارك أنَّه قال : أستجيزُ أن أحكي عن اليهود والنَّصاري، ولا أستجيزُ أن أحكي كلام أصحاب جهم .

**٤٢٩** - علي بن عبد الله ووتی : پێم گەیشتووە كە إبن مبارک ووتی : بە درووستی دەزانم كە قسە دەربارەی یەهود و نصارا بكەم، بەڵام بەدرووستی نازانم كە قسە لەسەر وتەی هاوەڵانی جەهمیەكان بكەم .

**٤٣٠** - قال أبو محمد وذكرتُ عند عليٍّ بعض كلامهم،

قلت: قومٌ يقولون: كذا ثم كذا، أترى هؤلاء مسلمين؟

فقال: لو ذكر هذا رجلٌ عند حماد وغيره مِن المشايخ لطردوه، وما حدَّثوه بشيءٍ، يكره أن يحكي كلامهم أشدَّ الكراهية.

قلت لعليٍّ: ويُكره أن يذكُرَ رجلٌ كلام أهل البدعِ؟

قال: نعم، لأني أخاف أن يذكرَهُ عند رجلٍ ضعيف القلب فيقع في قلبه.

**٤٣٠** - أبو محمد ووتى: لاى علي باسى هەندێك لە قسەكانى ئەوانم كرد، ووتم: كۆمەڵێك دەڵێن: ئاوا پاشان ئاوا، ئایە وایدەبینیت مسوڵمان بن؟

ووتى: ئەگەر ئەو پیاوەى لاى حماد و غەیرى ئەو لە شێخەكان باسكردایە ئەوا دەریان دەكرد، وە هیچ قسەیەكیان لەگەڵ نەدەكرد، ڕقى دەبۆوە لەوەى قسەى ئەوان باس بكات بە توندترین ڕق لێبوونەوە.

بە علي م ووت: ئایە ڕقى لێدەبێتەوە كە كەسێك باسى قسەكانى ئەهلى بیدعە بكات؟

ووتى: بەڵێ، لەبەر ئەوەى دەترسم لاى كەسێكى دڵ لاواز باس بكرێت و لەدڵیدا جێگیر بێت.

**٤٣١** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، عن نُعيم بن حماد، قال : مَن قال : القرآن مخلوق، فهو كافِرٌ بالله أرى أن جهادهم عندي أفضل مِن جِهاد الرُّوم، وأرى أن أقتلهم بلا استتابة .

**٤٣١** - نعيم بن حمَّاد ووتى : هەر كەسێك بڵێت قورئان درووستكراوە، ئەوا كافرە بە الله تعالى، وایدەبینم كە جیهاد كردن لەگەڵیان گەورەترە لە جیهاد كردن لەگەڵ ڕۆم، وە وایدەبینم كە بكوژرێن بێ ئەوەی داوای تەوبەیان لێ بكرێت .

**٤٣٢** - حدثني محمد بن مُصفَّى، قال : حدثنا بقيَّة بن الوليد، عن عبد العزيز الماجشون، قال : جهمٌ وشيعتُهُ الجاحِدون .

**٤٣٢** - عبدالعزيز الماجشون ووتى : جەهم و دار و دەستەكانیان ئینكاری دەكەن .

**٤٣٣** - حدثنا محمد، عن أبي يحى الحِمَّاني، قال : جهمٌ كافرٌ بالله العظيم .

**٤٣٣** - أبي يحيى الحَّماني ووتى : جەهمییەكان كافرن بە الله تعالى .

**٤٣٤** - وقال إسحاق : لا يجوز التَّفكُّر في الخالقِ، ويجوز للعِبادِ أن يتفكَّروا في المخلوقين بما سمعوا فيهم، ولا يزيدون على ذلك، لأنَّهم إن فعلوا تاهوا .

حدثنا أحمد بن الأزهر، قال: حدثنا محمد بن عُبيد، عن الأعمش، عن عَمرو بن مُرَّة، قال: مرَّ النبي ﷺ على قومٍ يتفكَّرون، قال: تفكَّروا في الخلقِ، ولا تفكَّرُوا في الخالقِ.

قال إسحاق: فالأشياءُ عند الله على معنى إرادتِهِ وحُكمه، وأظهرَ للعبادِ مِن العلمِ ما يتكفون به.

فينبغي الانتهاءُ إلى ما عُلِّمنا و حدَّ لنا، حتَّى نصيبَ سبيلًا.

وفي التَّفكُّرِ في خلقِ الله مشغلة عن التفكَّرِ فيما لم نؤمر به.

قال أبو يعقوب: وكيف يستوسع من يدَّعي العلمَ الخوض في الأشياء المنهية عنها؟ قال الله: ﴿**وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ**﴾ **[الإسراء: ٤٤]**.

فكيف يجوز لخلقٍ أن يخوضَ في التَّسبيحِ مِن الشَّجب، والأشياء المعمولة فيخوضوا: كيف تُسبِّحُ القِصاعُ، والأخوِنة، والخبز المخبوز، الثِّياب المنسوجة؟ وكلُّ هذا قد صحَّ فيه العلم أنَّهم يُسبِّحون، فذلك إلى الله أن يجعل تسبيحهم كيف شاء وكما شاء، وليس للنَّاسِ أن يخوضوا في ذلك إلَّا بما علموا، ولا يتكلَّمون في هذا وشبهه إلَّا بما أمرَ الله، ولا يزيدون على ذلك، والله الموفِّق، وعليه التَّوكُّل، فاتقوا الله ولا تخوضوا في هذا الأشياء المُتشابهة، فإنَّه يردكم الخوض فيه عن سُنَنِ الحقّ.

**٤٣٤** - وه إسحاق وتى: درووست نييه بيربكه‌يته‌وه له درووستكار - الخالق -، وه درووسته كه به‌نده‌كان بيربكه‌نه‌وه له درووستكراوه‌كان له‌وه‌ى كه

دەبیستن، وە لەمە زیاتر نەکەن، چونکە ئەگەر وابکەن ئەوا بەرەو فەوتان دەچن
.

أحمد بن الأزهر بۆی گێڕاینەوە وتی : محمد بن عبید بۆی گێڕاینەوە لە الاعمش، لە عمرو بن مرَّة وتی : پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلای کۆمەڵێک کە بیریان دەکردەوە، فەرمووی : (بیر بکەنەوە لە دروستکراوەکان، بیرمەکەنەوە لە دروستکار) .

إسحاق وتی : شتەکان لەلایەن الله وە لەسەر مانای ویست و فەرمانەکانیەتی،

وە بۆ بەندەکان ئەوەندەی دەرخستووە کە بەسیانێ .

بۆیە پێویستە کۆتایی بهێنین لەدوای ئەوەندەوە کە فێرکراوین و بۆمان دیاریکراوە، تاوەکو ڕێگە ڕاستەکە بپێکین .

وە بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی الله تعالى خەریکت دەکات لەوەی بیربکەیتەوە لەوانەی کە فەرمان نەکراوە پێت - واتە کاتێ بیر لە دروستکراوەکانی الله تعالى دەکەیتەوە ئاوا خەریک دەبیت و مشغوڵت دەکات، وەک لەوەی بیر لە شتانێک بکەیتەوە کە فەرمانی پێنەکراوە، بەڵکو هەندێ بیرکردنەوە بەرەو گومڕاییت دەبات - .

أبو یعقوب وتی : چۆن ئەوکەسەی بانگەشەی زانست دەکات دەتوانێت بچێتە ناو ئەوشتانەوە کە نەهییان لێکراوە؟ الله تعالى فەرموویەتی : ﴿**وَإِن مِّن شَىۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِ**﴾ [**الإسراء : ٤٤**] .

واتە : هەموو شتێک تەسبیحات و ستایشی ئەو زاتە (الله سبحانه وتعالى) دەکەن .

درووستکراو چۆن بۆی هەیە کە قسە بکەن لە باسی تەسبیحات کردنی ئەو شتانەی کە لەناودەچن، وە شتە بەکارهاتووەکان و بڵێن : چۆن سینیە لە دار دروستکراوەکان و سفرەکان و نانی ئامادەکراو و وپۆشاکی چنراو تەسبیحات دەکەن؟ وە گشت ئەمانە علم و زانست بەڕاست و صحیحی هاتووە دەربارەیان کە تەسبیحات دەکەن، الله ش تەسبیحات کردنەکەیان بەوشێوەیە کردووە کە ویستی لێی هەبووە، وە خەڵکی بۆیان نیە کە قسە بکەن لەمەدا ئیللا بەوەی دەیزانن، وە قسە نەکەن لەوە و هاوشێوەکەی ئیللا بەوەی الله فەرمانی پێکردووە، وە زیاد ناکەن بۆسەری، وە الله سەرخەرە، وە پشت بەستن هەر بەوە، بۆیە پارێزکاری الله بکەن و مەچنە ناو ئەم شتە لێکچووانەوە، چونکە قسەکردن تێیدا دەتانگێڕێتەوە لە سوننەت و ڕێبازی حەق - واتە بەرەو گومڕاییت دەبات - .

**٤٣٥** - حدثنا محمد بن جعفر الوركاني، قال : حدثنا عبد الله بن المبارك، عن عيسى بن عُبيد، عن عكرمة أنه قال : لا يعيبنَّ أحدكم دابَّته، وثوبه، فإنَّ كُلَّ شيءٍ يُسبحُ بحمدِهِ .

**٤٣٥** - عکرمة ووتی : هیچ یەکێکتان تانە نەدات لە ئاژەڵەکەی وە جلەکەی، چونکە هەموو شتێک تەسبیحاتی الله تعالى دەکەن .

**٤٣٦** - حدثنا أبو معن، قال : ثنا عبد الكبير، قال : ثنا سفيان، عن منصور، عن إبراهيم في قوله : ﴿**وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ**﴾ [الإسرَاء : ٤٤]

قال : الطَّعام يُسبِّح .

**٤٣٦** - إبراهيم له ووتەی الله تعالى : ﴿**وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ**﴾ **[الإسراء : ٤٤]** .

واته : هەموو شتێک تەسبیحات و ستایشی ئەو زاته (الله سبحانه وتعالى) دەکەن .

ووتی : خواردنەکان تەسبیحاتی الله تعالى دەکەن .

**٤٣٧** - حدثنا العلاء بن عَمرو، قال : ثنا الأشجعي عُبيدالله، عن مِسعر، عن الأعمش، عن ذكوان، قال : سمعَ صريرَ بابٍ، فقال : هذا تَسبيحه .

**٤٣٧** - ذكوان ووتی : دەنگی جیڕەی دەرگای بیست، ووتی : ئەوە تەسبیحاتی الله تعالى دەکات .

## باب : (٢٩)

## باب في قول الله : ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ﴾ [هود : ١٠٨] .

## دەربارەی ووتەی الله تعالى كە فەرموويەتی : تا ئاسمانەكان و زەويی هەبن، ئەوانيش تێيدا دەمێننەوە بۆ هەميشە



**٤٣٨** - سألتُ إسحاق : قلت : قول الله : ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَ﴾ [هُود : ١٠٨]

قال : أتت هذه الآية على كُلِّ وعيدٍ في القرآن .

**٤٣٨** - پرسيارم لە إسحاق كرد ووتم : ووتەی الله تعالى : ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ﴾ [هود : ١٠٧]

ووتی : ئەم ئايەتە هاتووە دەربارەی هەموو هەڕەشەيەك لە قورئاندا .

**٤٣٩** - حدثنا عُبيد الله بن مُعاذ، قال: حدثنا مُعتمر بن سُليمان، قال: قال أبي: ثنا أبو نضرة، عن جابر، أو أبي سعيد، أو بعض أصحاب النبيّ ﷺ قال: أتت هذه الآية على القرآن كُلِّهِ: ﴿**خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ**﴾ [**هُود**: ١٠٧].

قال المُعتمرُ: قال أبي: أتى على كُلِّ وعيدٍ في القرآن.

قال أبو محمد: ومعناه عندي إن شاء الله، والله أعلم: إنَّها تأتي على كُلِّ وعيدٍ في القرآن لأهل التوحيد.

وكذلك قوله: ﴿**إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَ**ج﴾ [**هُود**: ١٠٨]، إلَّا مَن استثنى مِن أهلِ القبلةِ الذين يخرجون مِن النَّار، والله أعلم باستثنائه.

**٤٣٩** - له جابر يان أبي سعيد ياخود هەندێک له هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەم ئایەته بۆ سەر هەموو قورئان هاتووه: ﴿**إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ**﴾ [**هود**: ١٠٧].

المعتمر ووتی: باوکم ووتی: هاتووه دەربارەی هەموو هەڕەشەیەک له قورئاندا.

باوکی محمد ووتی: لای من مانای ئەوەیە إن شاء الله، والله اعلم: ئەو ئایەته هاتووه له قورئاندا بۆ سەر هەموو هەڕەشەیەک بۆ ئەهلی تەوحید.

وه به هەمان شێوه ووتەی الله تعالی: ﴿**إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ**﴾، ئیللا ئەوانه نەبێ که الله جیای کردوونەتەوه لەوانەی ئەهلی قیبله که دەردەهێنرێن له ئاگر، وه الله تعالی ش زاناتره به جیاکارییەکەی.

**٤٤٠** - حدثنا عُبيد الله بن معاذ، قال : حدثنا أبي، قال : حدثنا شعبة، عن أبي بلج، سَمِع عمرو بن ميمون يُحدِّثُ عن عبد الله بن عمرو قال : ليأتين على جهنَّمَ يوم تصطفق فيه أبوابها، ليس فيها أحدٌ، وذلك بعد ما يلبثون فيها أحقابًا .

**٤٤٠** - عبدالله بن عمرو ووتی : ڕۆژێک دادێ بەسەر جەهەننەمدا کە دەرگاکانی دەجوڵێن و دێنە لەرزین هیچ کەسێکی تێدا نییە، لە پاش ئەوەی بۆ ماوەی هەزاران ساڵی بێ سنوور و نەبڕاوە تێیدا ماونەتەوە .

**٤٤١** - حدثنا عُبيد الله، قال : ثنا أبي، قال : ثنا شُعبة، عن يحيى بن أيوب، إنَّه سيأتي على جهنَّم يومٌ أحدٌ . وقرأ : ﴿**فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ**﴾ [**هُود : ١٠٦**] الآية .

قال عُبيد الله : كان أصحابنا يقولون : يعني به : المُوحِّدِينَ .

**٤٤١** - أبي هريرة رضي الله عنه فەرمووی : من لەو کەسانە نیم کە نەڵێم : ڕۆژێک دێت بەسەر دۆزەخدا کە هیچ کەسێکی تێدا نامێنێتەوە .

وە ئەمەی خوێندەوە : ﴿**فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيق**﴾ [**هُود : ١٠٦**] .

واتە : جا ئەوانەیان بەدبەخت و لار و لاسارن لە ئاگردان، هەر لەوێیش تووشی هەناسە کورتی و تەنگە نەفەسیی دەبن و هەر هاوار هاواریانە .

عُبيد الله ووتی : هاوەڵانمان دەڵێن : مانای ئەوە : موحیدەکانن .

**٤٤٢** - وسمعتُ أبا عبد الله محمد بن نصر الفرَّاء، قال : نازلتُ سليمان بن حرب، وعُبيد الله بن محمد التيمي، وأبا عُبيد دخل كلام بعضهم في بعضٍ، والمعنى واحدٌ قالوا : إن للنَّار جواني وبراني، فلا يدخل أهل التَّوحِيد مدخل أهل الكفر والنِّفاق، لأن مَن أُدخل مدخل أهل الكفر والنِّفاق لا يخرج منه أبدًا، أما تستمع إلى قوله : ﴿لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى (١٥) ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ [الليل]، والعرب لا تُسمِّي الشَّاة المصليَّة إلَّا ما تشوى في وسَط الجمر، يحفرون في الأرض حُفيرةً، فيجمعون فيها جمرًا كثيرًا، ثم يَعمِدون إلى المسلوخة فيُدخِلونها وسط ذلك الجمر حتَّى تغيب فيها، فتشتوي فيها، فذاك المصلي عندهم، فأمّا الذي يُشوى على ظهر الجمر، أو المقلي، أو في التَّنورِ، فلا يسمونها مَصليًّا .

قالوا : فمعنى الحديث : أنَّه لا يدخل أهل التَّوحيد مدخل أهل الكفرِ و النِّفاق، وهو جوف النَّارِ وأسفله، يقول الله : ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ [النِّسَاء : ١٤٥]، وتلك النَّارُ أعدت للكافرين .

وأمَّا معنى حديث الشَّفاعة : أنَّه يخرجُ مِن النَّارِ مَن كان في قلبِهِ مِثقالُ حبَّةِ خردلٍ مِن إيمانٍ، إنَّما معناه : أن يخرُجَ مِن براني النَّار .

قال أبو عبد الله : فنرى أن حديث عبد الله بن عَمرو إن كان له أصلٌ أنه يأتي على جهنم أحايين ليس فيها أحدٌ، إنما هو موضع أهل التَّوحيد .

وقال الله : ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ﴾ [هود : ١٠٧] .

فإنَّما يقع الاستثناء عندنا على أهل التَّوحيدِ في الآيتين جميعًا، لما جاء عن النبي ﷺ أنَّ له شفاعة لأهل الذنوبِ، فهذا ما أوَّلنا، والله أعلم .

**٤٤٢** - گوێم لە أبا عبد الله محمد بن نصر الفرَّاء بوو ووتى : پرسيارم كردەوە لە سليمان بن حرب، وە عبيد الله بن محمد التيمي و أبا عبيد، هەندێ قسەكانيان دەخستە ناو هەندێكى ترى، يەك مانا بوو ووتيان : دۆزەخ ناوەوە و ڕوكەشى هەيە، ئەهلى تەوحيد بەو شوێنە ناچنە ژوورەوە كە ئەهلى كوفر و نيفاق پێيدا دەچن، لەبەر ئەوەى هەر كەسێك لە ڕێگاى ئەهلى كوفر و نيفاقدا بچێتە ژوورەوە هەرگيز نايەتە دەرەوە، ئايا گوێت لەم ووتەيەى الله نەبووە كە دەفەرمووێت : ﴿لَا يَصۡلَىٰهَآ إِلَّا ٱلۡأَشۡقَى (١٥) ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ [الليل] - يصلى واتە دەچێتە ناويەوە و دەسووتێ، ئەو شتەى يان ئەو كەسەى كە تووشى ئەم كارە دەبێت پێى دەووترێ (مصلى) - عەرەبيش بە مەڕ ناڵێن مصلى ئيللا ئەوە نەبێ كە لە ناوەڕاستى پشكۆدا دەبرێژندرێ، چاڵێك هەڵدەكەنن لەزەويدا، پاشان پشكۆيەكى زۆرى تێدا كۆدەكەنەوە، پاشان پێستەى دادەماڵن و دەيخەنە ناوەڕاستى ئەو پشكۆيانە هەتا وەكو تێيدا وون دەبێت، وە تێيدا دەبرژێت، ئا ئەمەيە - مصلى - لە لايان، ئەمما ئەوانەى لەسەر پشتى پشكۆ دەبرژێندرێن يان سورەوەكراو يان لە ناو تەندوور پێى ناڵێن - مصلى - .

ووتيان : ماناى حەديسەكە : ئەوەيە كە ئەهلى تەوحيد بەو ڕێگايە ناچنە ناوەوە كە ئەهلى كوفر و نيفاق پێيدا دەچن، كە ئەويش ناوسك و ناوەخنى ئاگرە و خوارەوەيەتى، الله تعالى دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ [النِّسَاء : ١٤٥]، واتە : بەڕاستى دووڕووەكان لە چينى هەرە خوارەوەى دۆزەخدان .

ئەم ئاگرە ئامادەکراوە بۆ کافرەکان.

هەروەها مانای حەدیسی شەفاعەت ئەوەیە : (هەر کەسێک بە ئەندازە تۆوێکی خەرتەلە ئیمانی لە دڵدا بێت دێتە دەرەوە لە ئاگر) .

مانای ئەوەیە : کە دێنە دەرەوە لە ڕوکەشی ئاگر .

---

: رواه البخاري (٧٥١٠)، ومسلم (٣٧٦) .

أبو عبد الله ووتی : وایدەبینین کە حەدیسەکەی عبد الله بن عمرو ئەگەر ئەسڵ و بنچینەی هەبێت : کاتانێک دێ بەسەر دۆزەخدا کە هیچ کەسێکی تێدا نییە، بەڕاستی ئا ئەوە شوێنی ئەهلی تەوحیدە .

الله تعالى فەرموویەتی : ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ﴾ [هود : ١٠٧] .

واتە : تا ئاسمانەکان و زەویی هەبن، ئەوانیش تێیدا دەمێننەوە بۆ هەمیشە، مەگەر پەروەردگارت ویستی - گۆڕانکاری - هەبێت .

شوێنی جیاکاریەکە لای ئێمە بۆ سەر ئەهلی تەوحیدە، لە دوو ئایەتەکەدا هەمووی، کاتێک شەفاعەت بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ئەوانەی کە تاوان دەکەن، ئەمەیە کە تەفسیرمان کرد، والله اعلم .

**٤٤٣** - حدثنا أبو معن، قال: حدثنا وهب بن جرير، قال: حدثنا شُعبة، عن سُليمان التَّيمي، عن أبي نضرة، عن جابر بن عبد الله، أو بعض أصحابه في قوله: ﴿**خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَۚ**﴾ [**هُود**: ١٠٧] قال: هذه الآية أتت على القرآن كُلِّه.

**٤٤٣** - له جابر بن عبد الله، يان هەندێک له هاوەڵانی له ووتەی الله تعالى کە فەرموویەتی: ﴿**خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَۚ**﴾ [**هُود**: ١٠٧]، ئەم ئایەتە بۆ سەر هەموو قورئان هاتووە.

**٤٤٤** - حدثنا أبو معن، قال: حدثنا موسى، قال حدثنا سفيان، عن رَجُلٍ، عن الضَّحاك في قوله: ﴿**خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَۚ**﴾ [**هُود**: ١٠٧]، قال: إلَّا من استثنى مِن أهلِ القبلةِ الذين أُخرجوا مِن النَّار، ﴿**خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَۚ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ**﴾ [**هُود**: ١٠٧].

إلَّا مَن استثنى مِن أهلِ القبلة الذين أُخرِجُوا مِن النَّار.

**٤٤٤** - الضحاک له ووتەی الله تعالى کە فەرموویەتی: ﴿**خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَۚ**﴾ [**هُود**: ١٠٧]، ووتی: ئیللا مەگەر ئەوانەی ئەهلی قیبلە نەبێت کە الله جیای کردوونەتەوە، ئەوانن کە دێنە دەرەوە لە ئاگر، ﴿**خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَۚ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ**﴾ [**هُود**: ١٠٧].

واتە : ئەوانەیشیان کامەران و بەختەوەرن لە بەهەشتن و بۆ هەمیشە لەوێ دەمێننەوە تا ئاسمانەکان و زەویی هەبێت، مەگەر ئەوەندە پەروەردگارت ویستی - گۆڕانکاری - هەبێت .

ئیللا ئەوانەی کە جیاکراونەتەوە لە ئەهلی قیبلە دێنە دەرەوە لە ئاگر .

## باب : (٣٠)

# باب ما قيل للنبي ﷺ : متى كتبت نبيا؟

# دەربارەی ئەوەی وترا بە پێغەمبەر ﷺ : کەی پێغەمبەرایەتیت نوسرا؟



**٤٤٥** - قلت لإسحاق : حديث ميسرة الفجر، قال : قلت : يا رسول الله، متى كُتِبتَ نبيًّا؟

قال : وآدم بين الرُّحِ والجسدِ، ما معناه؟

قال : قبلَ أن يَنفُخَ فيه الرُّوحَ وقد خُلِقَ .

**٤٤٥** - بە إسحاق م ووت : حەدیسی میسرة الفجر، ووتی : ووتم : ئەی رسول الله کەی پێغەمبەرایەتیت نوسرا؟

فەرمووی : (ئەوکاتەی ئادەم لە نێوان ڕۆح و جەستەدا بوو)، واتای چییە؟

فەرمووی : پێش ئەوەی فوو بکرێت بە ڕۆحیدا، وە دروستکرابوو .

: **رواه الخلال في السنة** (٢٠٠) لەڕێگەی ئیمام حەرب .

**٤٤٦** - حدثنا عَمرو بن العباس، قال : حدثنا عبد الرحمن بن مهدي، عن منصور بن سعد، عن بُدَيْل العُقيلي، عن عبد الله ابن شقيق، عن ميسرة الفجر، قال : قلت : يا رسول الله، متى كُتِبتَ نبيًّا؟

قال : وآدم بين الرُّوحِ والجسدِ .

**٤٤٦** - ميسرة الفجر ووتی : ووتم : ئەی رسول الله کەی پێغەمبەرایەتیت نوسرا؟

فەرمووی : (کاتێک ئادەم لە نێوان ڕۆح و جەستەدا بوو) .

: **رواه أحمد** (٢٠٥٩٦)، **وعبدالله في السنة** (٨٤٠) .

**٤٤٧** - حدثنا علي بن عُثمان، قال : حدثنا حماد، قال : أخبرنا خالد، عن عبد الله بن شقيق، عن أبي الجدعاء، قال : قلتُ : يا رسول الله، متى جُعِلتَ نبيًّا؟

قال : و آدمُ بينَ الروُّحِ والجسَدِ .

**٤٤٧** - أبي الجدعاء ووتی : ووتم : ئەی رسول الله کەی کرایت بە پێغەمبەر؟

فەرمووی : (ئادەم لە نێوان ڕۆح و جەستەدا بوو) .

# باب : (٣١)

# باب في الرؤيا

# دەربارەی خەون بینین



**٤٤٨** - حدثنا عَمرو بن عُثمان بن سعيد بن كثير بن دينار، قال : حدثنا أبي، قال : حدثنا محمد بن مُهاجِر، عن جُنيد بن ميمون، عن حمزة بن الزُّبير، عن عبادة بن الصَّامت، أن النبي ﷺ قال : رُؤيا المؤمِنِ كَلامٌ يُكَلِّمُ بهِ العَبدُ رَبَّهُ في المنَامِ .

**٤٤٨** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (خەونی ئیمانداران قسە کردنێکە بەندە قسەی پێدەکات پێی لەگەڵ پەروەردگاری لە خەودا) .

**٤٤٩** - حدثنا عُبيدالله بن معاذ، قال : ثنا أبي، قال : ثنا شُعبة، عن قتادة، عن أنس بن مالك، عن عُبادة بن الصَّامِت، عن النبي عليه الصَّلاة و السَّلام قال : رُؤيا المؤمِنِ جُزءٌ مِن سِتةٍ وأربَعِينَ جُزءًا مِن النُّبوة .

**٤٤٩** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خەونی ئیمانداران بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی).

: رواه البخاري (٦٩٨٧)، ومسلم (٥٩٧١).

**٤٥٠** - حدثنا يحيى بن عبد الحميد، قال: حدثنا سليمان بن بلال، عن سُهيل، عن أبيه، عن أبي هريرة، عن النبي ﷺ قال: الرُّؤيا الصَّالِحةُ مِن العبدِ الصَّالحِ جُزءٌ مِن سِتةٍ وأربعين جُزءًا مِن النُّبوَّة.

**٤٥٠** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خەونی چاک و باش لە بەندەی چاک و باشەوەیە، بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی).

: رواه البخاري (٦٩٨٨)، ومسلم (٥٩٧٥).

**٤٥١** - حدثنا يحيى، قال: حدثنا هُشيم، قال: أخبرنا يعلى بن عطاء، عن وكيع بن عدس، عن عمِّهِ أبي رَزِين، قال النبي ﷺ: الرُّؤيا برجلِ طائرٍ، ما لم تُعبَّر، فإذا عُبِّرت، وقعت. والرُّؤيا جزءٌ مِن خمسةٍ وعشرينَ جُزءًا مِن النُّبوّة.

وحِسبته قال: لا تقُصَّهَا إلَّا على: وادٍّ، أو ذِي رأيٍ.

**٤٥١** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (خەون بەستراوەتەوە بە پێی باڵندەیەکەوە تا ئەوکاتەی تەفسیر ناکرێ، گەر تەفسیر کرا ئەوکات دەکەوێت و ڕوودەدات، وە خەون بینین بەشێکە لە بیست و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتی) .

وە پێم وابێ وتی : (مەیگێڕەوە ئیللا بۆ : خۆشەویستێک، یان خاوەن ڕەئیەک - واتە شارەزا لەو بوارە - ) .

---

: **رواه أحمد** (**١٦١٨٢**)، **وأبو داود** (**٥٠١٠**)، **والترمذي** (**٢٢٧٨ - ٢٢٧٩**) وقال : حسن صحيح .

**٤٥٢** - حدثنا عُبيد الله بن معاذ، قال : ثنا أبي، قال : ثنا شعبة، عن يعلى بن عطاء، قال : سمعتُ وكيع بن عُدس يُحدِّثُ عن عمِّهِ أبي رَزِين، قال : سمعتُ رسول الله ﷺ يقول : رُؤيا المسلم جُزءٌ مِن أربعينَ جزءًا مِن النُّبوةِ، وهي على رجلِ طائرٍ ما لم تُحدِّث بها، فإذا حدَّثتَ بها وقعت .

قال يعلى : وأحسبه قال : لا تُحدَّث بها إلَّا حبيبًا، أو لبيبًا .

**٤٥٢** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (خەون بینینی مسوڵمان بەشێکە لە چل بەشی پێغەمبەرایەتی، کە ئەویش بەردەوامە لە فڕین تا ئەوکاتەی باسی خەونەکەت نەکرد، ئەگەر باست کرد، ئەوکات دەکەوێت و ڕوودەدات) .

یعلى وتی : لام وابێ وتی : (باسی مەکە ئیللا لەلای خۆشەویستێک، یان زیرەکێک) .

**٤٥٣** - حدثنا الحُميدي، قال ثنا سُفيان، قال : حدثنا عبدربه بن سعيد، قال : سمعتُ أبا سلمة بن عبد الرحمن يُحدِّث عن أبي قتادة، أن رسول الله عليه الصَّلاة و السَّلام قال : الرُّؤيا مِن الله، والحُلُمُ مِن الشَّيطان، فإذا حَلَمَ أحدُكم حُلمًا يكرَهُهُ، فلينفُث عن يسارِهِ ثلاثًا، وليستعِذ بالله مِن شرِّ مَا رأى، فإنها لن تضُرَّه .

**٤٥٣** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الرؤيا - خەونی خۆش - لە الله تعالى وەیە، وە الحلم - خەونی ناخۆش - لە شەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێک لە ئێوە خەونێکی ناخۆشی بینی، با تف بکات لە لای چەپی سێ جار، وە پەنا بگرێت بە الله لە خراپەی ئەوەی کە بینیویەتی، ئەوا ئەوکات ئەو خەونە زیانی پێ ناگەیەنێ) .

---

: رواه البخاري (٦٩٨٦)، ومسلم (٥٩٦٢) .

**٤٥٤** - حدثنا أبو بكر الحُميدي، قال : حدثنا سفيان، قال : حدثنا يحيى بن سعيد، عن أبي سلمة بن عبد الرحمن، عن أبي قتادة، قال : قال : رسول الله ﷺ : الرُّؤيا مِن الله، والحُلُمُ مِن الشَّيطانِ، فإذا حَلَمَ أحدكم حُلمًا يكرهه فلينفُث عن يسارِهِ ثلاثًا، وليستعِذ بالله مِن شرِّ ما رأى، فإنَّها لن تضُرَّهُ .

**٤٥٤** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الرؤيا - خەونی خۆش - لە الله تعالى وەیە، وە الحلم - خەونی ناخۆش - لە شەیتانەوەیە، ئەگەر یەکێک لە ئێوە خەونێکی ناخۆشی

بینی، با تف بکات لە لای چەپی سێ جار، وە پەنا بگرێت بە اللّٰه لە خراپەی ئەوەی کە بینیویەتی، ئەوکات ئەو خەونە زیانی پێ ناگەیەنێ) .

---

: رواه الحميدي (٤٢٢) .

**٤٥٥** - حدثنا أبو عبد الله أحمد بن بشر، قال: حدثنا يزيد بن زُرَيع، عن سعيد، عن قتادة، عن محمد بن سيرين، عن أبي هريرة، قال: قال: رسول الله ﷺ: الرُّؤيا ثلاث: فرؤيا حقٌّ، ورؤيا يُحدِّثُ بها الرَّجلُ نفسَهُ، ورؤيا تحزِينٌ مِن فَمن رأى ما يكرَه فليقُم فليُصَلِّ .

وكان يقول: (يُعجبني القيدُ، وأكرَهُ الغُلَّ، والقيدُ: ثباتٌ في الدِّينِ) .

وكان يقول: (مَن رآني فإنِّي أنا هو، فإنَّه ليسَ للشَّيطانِ أن يتمثَّل بي) .

وكان يقول: (لا تقُصَّنَّ، أو لا تَقُصَّ الرُّؤيا إلَّا على: عالم، أو ناصِحٍ) .

**٤٥٥** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خەون بینین سێ جۆرە: خەونی حەق، وە خەونێک کە کەسەکە لەگەڵ خۆیدا قسە دەکات، وە خەونی خەمبارکردن و خەم پێدان لەلایەن شەیتانەوە، هەرکەسێک خەونێکی ناخۆشی بینی، ئەوا با هەڵستێ و نوێژ بکات) .

وه فەرمووی : (کۆتکردنی پێکانم پێ خۆشە - کە بریتیە لە کۆتکردن و ڕێگریکردنی لە تاوان و خراپە و شتی باتڵ - وەرقیشم لە غلَّ ە - کە بریتیە لە کۆتکردنی گەردەن چونکە سیفەتی ئەهلی ئاگرە - ) .

وه دەفەرموێت : (هەرکەسێک منی لە خەودا بینی ئەوا منم، چونکە شەیتان بۆی نیە خۆی بخاتە سەر شێوەم) .

وه دەفەرموێت : (خەون مەگێڕنەوە، یاخود مەیگێڕەوە، ئیللا لەلای : زانا، یان ئامۆژگاریکار بێت) .

---

: **رواه الترمذي (٢٢٨٠)** وقال : حديث حسن صحيح .

**٤٥٦** - حدثنا محمد بن مُصفَّى، قال : ثنا بقيَّة بن الوليد، قال حدثني نصر بن علقمة، عن عبد الرحمن بن عائد الأزدي، عن رجلٍ من أصحابِ النبي قال : قال رسول الله : مَن لم يُؤمِن بالرُّؤيا الصَّالِحَةِ، فإنَّه لن يُؤمنَ بالله ورسولِهِ .

**٤٥٦** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەسێک باوەڕی بە خەونی چاک و باش نەبێت، ئەوا باوەڕی بە الله و نێردراوەکەشی نییە) .

---

: ئیسنادەکەی ضعیفە .

## باب : (٣٢)

## باب في الروافضة

## دەربارەی ڕافیزەکان



**٤٥٧** - حدثنا أبو علي الحسن بن الصَّباح البزَّار، قال: حدثنا حُسين ابن محمد، قال حدثنا الفرات، عن ميمون بن مهران، عن ابن عباس، عن النبي ﷺ أنَّه قال: سيكونُ في آخرِ الزَّمانِ قومٌ يَنتحِلون مُودَّةَ أهلِ بيتي هن الرَّوافِضة، فمن أدركهم منكم فليقاتِلهم، فإنَّهم مُشرِكون .

**٤٥٧** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (لە کۆتایی زەماندا قەومێک پەیدا دەبن کە خۆیان دەدەنە پاڵ خۆشەویستی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەوانیش ڕافیزەن، ئەگەر پێیان گەیشتیت ئەوا بیانکوژە، چونکە ئەوان مشریکن) .

---

: ئیسنادەکەی ضعیفە .

**٤٥٨** - حدثنا محمد بن نصر بن سعيد، قال: حدثنا يحيى بن أبي بُكير، عن الفُضيل بن مرزوق، عن أبي جناب، عن أبي سُليمان، عن علي بن أبي طالب، قال: قال رسول الله ﷺ: إنه سيكونُ قومٌ يكون لهم نَبزٌ يقالُ لهم: الرَّافِضةُ، فإن أدركتَهُم فاقتُلهم، فإنَّهم مُشرِكون.

قال: وقال عليٌّ: يكونُ قومُ يتولَّون حُبَّنا، يكذبون علينا، وآيةُ ذلك: أنَّهم يَسُبُّون أبا بكرٍ، وعُمر.

**٤٥٨** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (قەومێک پەیدا دەبن کە لەقەبێکی ناشرینیان هەیە پێیان دەڵێن: ڕافیزە، ئەگەر هەر یەکێک لەئێوە پێیان گەیشت، ئەوا با جەنگ لەدژیان بکات، چونکە بەڕاستی ئەوان مشریکن).

ووتی: وە علي رضي الله عنه فەرمووی: قەومێک پەیدا دەبن کە پشت لە خۆشەویستیمان دەکەن، درۆمان لەسەر دەکەن، نیشانەی ئەوانیش ئەوەیە کە: جنێو بە أبا بکر و عمر دەدەن.

---

: **رواه عبد الله في (السنة: ١٢٥٠)** ئیسنادەکەی ضعیفە.

**٤٥٩** - حديثا أبو جعفر محمد بن عوف، قال: حدثنا بكر بن خُنيس، قال: حدثنا سوَّار بن مُصعب، عن داود بن أبي عوف، عن فاطمة بنت عليٍّ، عن فاطمة الكبرى، عن أسماء بنت عُميس، عن أُمِّ سلمة، فقالت: قال رسول الله ﷺ: يا عليُّ، ألا إنَّ ممن

يزعُم أنَّه يُحبُّك قومٌ يضفزون الإسلام، ثم يلفِظونَهُ، يقال لهم : الرَّافِضةُ، فإن أدركتَهُم فاقتُلهم، فإنَّهم مُشرِكون .

قال : قلت : يا رسول الله، فما العلامةُ فيهم؟

قال : لا يحضرون جُمعةً، ولا جماعةً، ويطعنون علي السَّلفِ .

**٤٥٩** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئەی علي ئاگاداری ئەوانە بە کە پێیان وایە خۆشەویستی تۆ پاڵی دەدات بۆ ئیسلام، پاشان دەریدەبڕن، پێیان دەڵێن : ڕافیزە، ئەگەر پێیان گەیشتی بیانکوژە، چونکە ئەوان مشرکن) .

وتی : وتم : ئەی رسول الله ئایە نیشانەی ئەوان چییە؟

فەرمووی : (ئامادەی نوێژی جومعە و جەماعەت نابن، وە تانە لەپێشینان و سەلەف دەدەن) .

---

: **بخاري لە (التاريخ الكبير، ١٦٩/٤)** دەڵێت : حەدیسەکە منکر ە .

**٤٦٠** - حدثنا يحيى بن عبد الحميد، قال : حدثنا إبراهيم بن سعد، عن عبيدة بن أبي رائطة، عن عبد الله بن عبد الرحمن، عن عبد الله بن مُغفَّل، قال : قال النبي عليه الصَّلاة والسَّلام : الله الله في أصحابي، لا تتخِذوهم غَرضًا، فمن أحبَّهُم فبحُبِّي أحبَّهم، ومن أبغضَهُم، فببُغضي أبغضَهُم، ومَن آذاهُم فقد آذاني، ومَن آذاني فقد آذى الله، ومَن آذى الله فيُوشِكُ أن يأخذَهُ .

**٤٦٠** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الله الله لە هاوەڵانم، مەیانکەنە هەدەف و ئامانجی خۆتان، تەقوای الله بکەن تەقوای الله بکەن لە حەق و مافی هاوەڵەکانم هەر کەسێک ئەوانی خۆشبوێت ئەوە بەهۆی خۆشەویستی ئەو بۆمن ئەوانی خۆش دەوێت - واتە چونکە ئەو منی خۆشدەوێ لەبەر ئەوە هاوەڵەکانمیشی خۆشدەوێت - ، وە هەرکەسێک ڕقی لەوان بێت ئەوا بەهۆی ڕق لێبوونەوەی ئەو بۆمن ڕقی لەوان دەبێت - واتە چونکە ئەو ڕقی لەمن دەبێتەوە ئەوا ڕقی لە هاوەڵەکانیشم دەبێتەوە - ، وە هەرکەسێک ئازاری ئەوان بدات ئەوا ئازاری منی داوە، وە هەرکەسێکیش ئازاری من بدات ئەوا ئازاری الله تعالی ی داوە، وە هەرکەسێک ئازاری الله بدات ئەوا الله بەعەزابی خۆی دەیگرێت) .

---

: **رواه أحمد (١٦٨٠٣ و ٢٠٥٤٩)، والترمذي (٣٨٦٢)** لە عبد الله بن مغفل رضي الله عنه، الترمذي دەڵێت : ئەوە حەدیسێکی غریب ە نەمانزانیوە ئیللا لەو ڕێگەیەوە نەبێت .

**٤٦١** - حدثنا محمد بن نصر، قال ثنا حسَّان بن إبراهيم، عن محمد بن الفضل، عن عَمرو بن دِينار، عن جابر بن عبد الله، قال : سمعت النَّبي ﷺ يقول : إن النَّاسَ يكثُرون، وأصحابي يقِلُّون، لا تسُّبوهم، لعنَ اللهُ مَن سبَّهُم .

**٤٦١** - جابر بن عبد الله فەرمووی : گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو : (بەڕاستی خەڵک زۆر دەبن، وە هاوەڵانی من کەم دەبنەوە، جنێویان پێ مەدەن، لەعنەتی الله لەو کەسە بێت کە جنێویان پێدەدات) .

**٤٦٢** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا أبو مُعاوية، عن محمد ابن خالد الضّبي، عن عطاء، قال رسول الله ﷺ : مَن حفظني في أصحابي كُنتُ له شفيعًا وشهيدًا، يومَ القيامةِ، ومَن سبَّهُم فعليهِ لعنَةُ الله .

**٤٦٢** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەرکەسێک ڕێز و قەدرم بپارێزێ لە حەق و مافی هاوەڵەکانم - واتە قسەیان پێنەڵێ چونکە قسە گوتن پێیان کەمکردنەوەیە لە پلە و پایەی پێغەمبەر ﷺ - ، ئەوا دەبمە شەفاعەتکار و شاهێد بۆی لە ڕۆژی قیامەت، وە هەرکەسێک جنێویان پێ بدات، بەر لەعنەتی الله بکەوێت) .

---

: **رواه أحمد في فضائل الصحابة** (١٠ و ١٧٣٣)، ئەوە حەدیسێکی مرسل ە .

**٤٦٣** - حديثا حمزة بن عُبيد الله، قال : حدثنا حُميد بن أبي حميد الدِّمشقي، عن خالد بن معدان، عُمر بن الخطاب، قال : قال رسول الله ﷺ : أحِبَّ آل محمد، و لا تكُن رافِضيًّا .

وأرجئ الأمورَ إلى الله، ولا تكن مُرجئًا .

وأعلم أن ما أصابك فمِن الله، و لا تكن قدريًّا .

واسمَع وأطِع ولو عبدًا حبشيًّا، و لاتكن خارجيًّا .

**٤٦٣** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (آل محمدت خۆشبووێت و مەبە بە ڕافیزە - چونکە ڕافیزە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ خۆشناوێت و جنێویان پێ دەدەن - .

وە فەرمانەکان ببەرەوە بۆ لای الله تعالى مەبە بە مورجیئە - چونکە مورجیئەکان ئەڵێن خۆمان گشت کارەکان دەکەین - .

وە بزانە هەر شتێک کە تووشت دەبێت لە لایەن الله وەیە و مەبە بە قەدەری - چونکە قەدەریەکان پێیان وایە هەرشتێک ڕوودەدات بەندە خۆی بەرپرسە و پێش ئەوکات نەنوسراوە لای الله تعالى - .

ببیستە و گوێڕایەڵی بکە ئەگەر بەندەیەکی حەبەشیش بێت و مەبە خەواریج - چونکە خەواریجەکان دەرچوون لەژێر فەرمانڕەوایی مسوڵمان و بەتاوان خەڵک کافر دەکەن - )

.

**٤٦٤** - حدثنا أحمد بن سعيد، قال : سمعت غياث بن واقد، يقول : قال سُفيان : أرجِ ما لم تعلم إلى اللَّه، و لا تكُن مُرجئاً .

وأحبَّ صَالحِي عبد المطلب، ولا تكُن سَبئيًا .

وأجِبْهُ وإن كان عبدًا حبشيًّا، ولا تكُن خارِجيًّا .

**٤٦٤** - سفیان ووتی : ئەوەی نایزانیت ببەرەوە بۆ لای الله تعالى و مەبە بە مورجیئە

.

وە ساڵح و پیاو چاکەکانی بنەماڵەی عبد المطلب بـت خۆشبوێ و مەبە بە سائیبە .

وە وەڵام بدەرەوە ئەگەرچی بەندەیەکی حەبەشی بێت، مەبە بە خەواریج .

**٤٦٥** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا أبو الأحوص، قال : ثنا أبو عبد الرحمن، عن جعفر بن برقان، عن ميمون بن مهران، قال : قال ابن عبَّاسٍ : يا ميمون، لا تسُبَّ السَّلفَ وادخُلِ الجنَّةَ بسلام .

**٤٦٥** - میمون بن مهران دەگێڕێتەوە، إبن عبَّاس ووتی : ئەی میمون جنێو بە سەلەف مەدە و بە سەلامەتی بچۆرە بەهەشت .

**٤٦٦** - حدثنا سعيد، قال : حدثنا شهاب بن خِراش، عن عمِّهِ العوَّام ابن حوشب، قال : أدركتُ مَن أدركتُ من صدر هذه الأُمّة وهم يقولون : اذكروا محاسِن أصحاب رسول الله، تأتلف عليهم القلوب، ولا تذكروا الذي شجرَ بينهم، فتُحرِّشوا النَّاسَ عليهم .

**٤٦٦** - العوَّام ابن حوشب وتی : گەیشتم بەوانەی کە لە سەرەتای ئەم ئومەتە بوون کە ئەوانیش دەڵێن : باسی باشی و چاکیەکانی هاوەڵانی رسول الله ﷺ بکەن بەهۆیەوە دڵەکان کۆدەبنەوە لەسەریان - لەسەر خۆشویستنیان بەمەش تەفرەقە

دروست نابێ له نێوان مسوڵمانان - ، وه باسی ئەوەش مەکەن کە لە نێوانیان ڕویداوه، بەهۆیەوە خەڵکی هانبدەن دژ بەیەک لەسەر هاوەڵان .

**٤٦٧** - حدثنا أبو خالد الحباني، قال : ثنا عثمان بن زفر، عن أبي خالد البصري، عن علي بن زيد بن جُدعان، عن سعيد بن المسيّب، قال : مَن شتمَ أصحابَ النَّبي ﷺ سلَّطَ الله عليهِ في قبرِهِ حيَّتان، واحدة مِن قِبَلِ رأسِهِ، وأُخرى مِن قِبَلِ رِجليه، تقرُضانِهِ حتَّى تنتهيا إلى وسطه، ثم يُعاد و يُعادانِ إلى يوم القيامة .

**٤٦٧** - سعيد بن المسيب ووتی : هەر کەسێک قسە و جنێو بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بدات ئەوا الله تعالى لە ناو گۆڕ دوو ماری بەسەردا زاڵ دەکات، دانەیەکیان لە لای سەریەوە، وە دانەیەکی تریش لە لای قاچەکانیەوە، پارچەی دەکەن تا دەگاتە ناوەڕاستی، پاشان دووبارە دەکرێتەوە و دووبارەی دەکەنەوە تا ڕۆژی قیامەت .

**٤٦٨** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا أبو معاوية، عن الأعمش، عن أبي صالح، عن أبي سعيد الخدري، قال : قال رسول الله عليه الصَّلاة و السَّلام : لا تسُبُّوا أصحابي فلو أنَّ أحدَكُم أنفقَ مثلَ أُحِد ذهبًا، ما أدرَكَ مُدَّ أَحدِهِم، ولا نصِيفَه .

**٤٦٨** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (جنێو بە هاوەڵانم مەدەن، چونکە ئەگەر یەکێک لە ئێوە بەقەد چیای ئوحد زێڕ ببەخشێت، ناگات بەئەندازەی - مد - یێکی هیچ کامیان، وە نە نیوەی ئەوەش) .

: رواه البخاري (٣٦٧٣)، ومسلم (٦٥٨٠) .

**٤٦٩** - حدثنا أبو معن الرَّقاشي، قال : حدثنا يحيي بن سعيد، قال : ثنا صدقة بن المُثنى، قال : حدثني جدي : رياح بن الحارث، سمعَ سعيد بن زيد، يقول : والله لمشهدٌ شَهِدَهُ أحدُهم مع رسول الله اغبرَّ فيه وجهُهُ، أفضلُ مِن عملِ أحدِكِم، ولو عُمِّرَ عُمُر نوح .

**٤٦٩** - ڕیاح بن الحارث گوێی لە سعید بن زید بوو دەیوت : سوێند بە الله دیمەن و مەشهەدێک کە یەکێک لە هاوەڵان بینیبێتیان لەگەڵ پێغەمبەری الله دا ﷺ کە تێیدا ڕووخساری خۆڵاوی بوبێ باشتر و چاکترە لە کردەوەی یەکێک لە ئێوە، ئەگەر تەمەنیشی پێدرابێ هێندەی تەمەنی نوح .

**٤٧٠** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا أبو معاوية، عن محمد ابن سُوقة، عن حبيب بن أبي ثابت، قال : قال عليٌّ : تفترِقُ هذه الأُمَّة على بضع و سبعين فِرقَة، شرُّهم : قوم ينتحِلون حُبَّنا أهلَ البيتِ .

**٤٧٠** - علي رضي الله عنه فەرموویەتی : ئەم ئومەتە جیادەبنەوە بۆ حەفتا بەش، خراپترینیان : کۆمەڵێک کە بانگەشەی خۆشەویستی ئەهلی بەیت دەکەن .

**٤٧١** - حدثنا سعيد، قال : ثنا أبو مُعاوية، عن مُجالد، عن الشَّعبي، عن زياد بن النَّضر وكان على مجنبة علي قال : قلت له : يا أبا النَّضر، ما ردَّك عن رأي هذه الشِّيعة، وكنت فيهم رأسًا ؟!

قال رأيتهم يتعلَّقون بأعجارٍ ليس لها صُدور .

**٤٧١** - شعبي دەگێڕێتەوە لە زیاد بن نضر کە لە بەرەی علي بوو ووتی : پێم ووت : ئەی باوکی نضر، چی تۆی گێڕایەوە لەم شیعەیە، لەکاتێکدا تۆ تێیاندا سەرۆک و گەورە بوویت ؟!

ووتی : بینیم خۆیان پەیوەست دەکەن بە کۆمەڵێک إعجاز و بنچینەوە کە هیچ سەرچاوەیەکی نییە .

**٤٧٢** - حدثنا أحمد بن يونس، قال : ثنا زهير، قال حدثنا أبو إسحاق، عن عمرو بن الأصم، قال : قلت للحسن بن علي : إنَّ هذه الشِّيعة يزعُمون أنَّ عليًّا مبعوثٌ قبل يوم القيامة ؟

قال : كذبوا والله ما هؤلاء بشيعةٍ، لو علمنا أنَّه مبعوث، ما زوجَّنا نساءه، ولا اقتسمنا ماله .

**٤٧٢** - عمرو بن الأصم ووتى : به حسن بن علي م ووت : بەڕاستى ئەو شيعانه بانگەشەی ئەوه دەكەن كه علي پێش ڕۆژی قيامەت زيندوو دەكرێتەوە؟

ووتى : درۆيان كردووه، والله ئەوان شيعه نين، گەر بمانزانيايه كه ئەو زيندوو دەكرێتەوه ئەوا زەواجمان لەگەڵ ئافرەتانيان نەدەكرد، وه ماڵيشمان لەگەڵدا دابەش نەدەكردن .

**٤٧٣** - حدثنا يحيى بن عبد الحميد، قال حدثنا إدريس، عن حصين، عن عمار، بن الحارث، قال : قيلِ لابن عباس : إن ناسًا يزعمون أن عليًّا سَيرجع بعد الموت .

قال : لو علمنا ذلك ما اقتسمنا ميراثه، ولا نكحنا نساءه .

**٤٧٣** - عمار بن الحارث ووتى : به إبن عباس وترا : خەڵكانێك پێيان وايه كه علي دواى مردن دەگەڕێتەوە؟

ووتى : گەر ئەوەمان بزانيايه ئەوا ميراتمان لەگەڵياندا دابەش نەدەكرد، وه هاوسەرگيريمان لەگەڵ ئافرەتانيان نەدەكرد .

**٤٧٤** - حدثنا يحيى بب عبد الحميد، قال : حدثنا شريك، عن أبي البقظان عن زاذان، عن عليٍّ قال : مثلي فيكم كمثل عيسى ابن مريم، أحبَّتَه طائفة فأفرطوا في حُبَّهِ فهلكوا، وأبغضته طائفة، فأفرطوا في بُغضِه فهلكوا، واقتصدت فيه طائفة فنجت، فالنَّاجي منكم فيَّ المُقتصد .

**٤٧٤** - علي رضي الله عنه فەرموویەتی : نموونەی من لەنێو ئێوەدا وەک نموونەی عیسی بن مریم وایە علیهما السلام، کە کۆمەڵەیەک خۆشیانویست و زیادەڕۆیان لە خۆشویستنەکەی کرد بۆیە بەرەو بەهیلاکچوونی بردن، وە کۆمەڵەیەکیش ڕقیان لێبویەوە و زیادەڕۆییان لە ڕقلێبونەوەکەی کرد تاوەکو بەرەو بەهیلاکچوونی بردن، وە کۆمەڵەیەکیش زیادەڕۆییان نەکرد و نەجات بوون، ئەوانەی نەجات بوون ئەوانەن کە زیادەڕۆییان نەکردووە .

**٤٧٥** - حدثنا أحمد بن يونس، قال : حدثنا ابن أبي ذئب، عن الزُّهري، قال : ما رأيتُ قومًا أشبه بالنَّصارى مِن السَّبائية .

قال أحمد : هم الرَّافضة .

**٤٧٥** - الزُّهري ووتی : هیچ قەومێکم نەبینیوە لە نصاری بچێت وەک لە السبائية - واتە السبائية قەومێکن زۆر لە نصاری دەچن - .

أحمد ووتی : ئەوانە ڕافیزەن - واتە السبائية ڕافیزەن - .

**٤٧٦** - حدثنا يحيي بن عبد الحميد، قال : حدثنا الحكم بن ظُهير، عن السُّدي، عن أبي مالكٍ، عن ابن عباس : ﴿**وَسَلَامٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَىٰ**﴾ [**النمل : ٥٩**]

قال : أصحاب محمدٍ .

**٤٧٦** - إبن عبَّاس له وتەی الله تعالی كه فەرموویەتی : ﴿**وَسَلَامٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ الَّذِينَ اصْطَفَىٰ**﴾ [**النمل : ٥٩**]

واته : سڵاو و درووديش لەسەر ئەو بەندانەی خۆی هەڵیبژاردوون، بۆ هەڵگرتن و گەیاندنی پەیامەكەی خۆی .

ووتی : - مەبەست بەو هەڵبژێردراوانه - هاوەڵانی پێغەمبەر محمد ە ﷺ .

**٤٧٧** - حدثنا يحيي، قال : ثنا يعقوب، عن زيد أبي أسامة، عن نافع، عن ابن عمر في قوله تعالى : ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ**﴾ [**التوبة : ١١٩**] .

قال : مع محمد و أصحابه .

**٤٧٧** - إبن عمر له وتەی الله تعالی كه فەرموویەتی : ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ**﴾ [**التوبة : ١١٩**] .

واته : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوه له نافەرمانی الله پارێزكار بن و هەمیشه لەگەڵ دەستەی ڕاستگۆیان بن .

ووتی : لەگەڵ محمد ﷺ وه هاوەڵەكانی .

**٤٧٨** - حدثنا يحيي، قال: ثنا جعفر بن سليمان، عن عبد الصمد بن معقل، قال: سمعت عمّي وهب بن مُنبِّة يقول في قوله: ﴿**بِأَيْدِى سَفَرَةٍ** (١٥) **كِرَامٍ بَرَرَةٍ** (١٦)﴾ [عبس]

قال: أصحابُ النبيّ ﷺ.

**٤٧٨** - وهب بن منبة دەڵێت لە وتەی الله تعالى كە فەرموويەتی: ﴿**بِأَيْدِى سَفَرَةٍ** (١٥) **كِرَامٍ بَرَرَةٍ** (١٦)﴾ [عبس]

واتە: بەدەستی فریشتە نووسەرەكان كە بەڕێز و خواناس و ملكەچ و فەرمانبەرداران.

ووتی: هاوەڵانی پێغەمبەرن ﷺ.

**٤٧٩** - حدثنا العلاء بن عَمرو، قال: ثنا ابن عُليَّة، عن ابن أبي نَجيح، عن مجاهد في قوله: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ**﴾ [النساء: ٥٩].

قال: أصحابُ محمد.

**٤٧٩** - مجاهد لە وتەی الله تعالى كە فەرموويەتی: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ**﴾ [النساء: ٥٩]

واته : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر و فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خودی خۆتانن - لە بیروباوەڕ و پابەندیدا - .

ووتی : هاوەڵانی محمد ن ﷺ .

**٤٨٠** - حدثنا أبو محمد عبد الله بن خُبَيق الأنطاكي، قال : سمعت يوسف بن أسباط يقول : أمَّا الشِّيعة فهم أصناف، فمنهم :

المَنصوريّة : وهم الذين يقولون : مَن قتلَ أربعين نفسًا ممن خالف هواهم دخل الجنَّة، وهم الذين يخيفون النَّاسَ، ويستحِلّون أموالنا، وهم الذين يقولون : أخطأ جبريل بالرَّسالة .

وأفضل الشّيعة : الزَّيدية : وهُم الخشبيَّة : وهُم الذين يتبرَّؤن مِن عُثمان بن عفان، وطلحة، والزُّبير، وعائشة، ويرون القِتال مع كُلِّ من خرجَ مِن ولد عليٍّ برا كان أو فاجِرًا، حتَّى يغلبَ أو يُغلب .

و منهم : الرَّافضة : الذين يتبرَّؤن مِن جميع أصحاب النبي عليه الصَّلاة والسَّلام، ويُكفِّرون الأُمَّة إلَّا أربعة : عليّ، وعمَّار، والمِقداد، وسلمان .

**٤٨٠** - يوسف بن أسباط دەڵێت : هەروەها شیعە چەند جۆرێکن لەوانە :

(المنصوريَّة) : ئەوانەن کە دەڵێن :هەر کەسێک چل کەس بکوژێت کە پێچەوانەی ئارەزووی ئەوانە ئەوا دەچێتە بەهەشت، وە ئەوانن کە خەڵک

دەشارنەوە و ماڵیان حەڵاڵ دەكەن، وە ئەوان دەڵێن : جبريل بەو پەیامەی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی هەڵەی كردووە .

گەورەی شیعەكان بریتیە لە : (الزَّيدية) كە ئەوانیش (الخشبيَّة) ن : ئەوانن كە خۆیان بەریئ دەكەن لە عثمان بن عفان و طلحة و الزُّبير و عائشة، وە جەنگ بەدرووست دەزانن لەگەڵ هەر كوڕێك كە لە علي ەوە دەرچووبێت، جا باش بێت یان خراپ، تاوەكو زاڵ دەبێت یان بەسەری زاڵ دەبن .

وە لەوانە (الرَّافضة) : ئەوانەن كە خۆیان بەریئ دەكەن لەهەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، وە هەموو ئوممەت بەكافر دادەنێن ئیللا چوار كەس نەبێت ئەوانیش : علي و عمار و المقداد و سلمان .

**٤٨١** - حدثنا أبو بكر حماد بن مبارك، قال : ثنا محمد بن هَيصَم، قال : ثنا الوليد بن مُسلم، عن ثور بن يزيد، عن خالد بن معدان، عن مُعاذ بن جبلٍ، قال : قال رسول الله ﷺ : إذا ظهرتِ البدع، وسُبَّ أصحابي، فعلى العالمِ أن يُظهِرَ عِلمَهُ، فإن لم يفعل فعليهِ لعنةُ الله، والملائكةِ، والنَّاس أجمعين .

قال : قلتُ للوليد : ما إظهار عِلمه؟

قال : السُّنَّة .

**٤٨١** - رسول الله ﷺ فەرموويەتی : (ئەگەر بیدعه و گومڕایی دەرکەوت و جنێو درا بە هاوەڵانم، لەسەر زانا پێویستە زانستەکەی بەدیار بخات، ئەگەر وا نەکات، ئەوا لەعنەتی الله و فریشتەکان و گشت خەڵکی لەسەر بێت) .

ووتی : بە ولید م ووت : دەرخستنی زانستەکەی چیە؟

ووتی : سوننەتە - واتە سوننەت دەربخات، والله اعلم - .

---

: ئیسنادەکەی ضعیفە .

**٤٨٢** - حدثنا عمرو بن عثمان، قال : حدثنا بقيَّة بن الوليد، عن هشام بن عُبيد الله، عن ابن جريج، عن عطاء، عن ابن عبَّاس قال : كلامُ الشِّيعةِ هلكة .

**٤٨٢** - إبن عباس ووتی : کەلام و قسەی شیعە بەهیلاکت دەبات - واتە بەرەو گومڕاییت دەبات، والله اعلم - .

**٤٨٣** - حدثنا سعيد بن عون، قال : حدثنا إسماعيل بن عيَّاش، قال : حدثني حُميد بن مالك اللخمي، عن مكحول، عن مُعاذ بن جبل، قال : قال رسول الله ﷺ : يا مُعاذ، أطعْ كُلَّ أميرٍ، ولا تسُبنَّ أحدًا مِن أصحابي .

**٤٨٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (ئەی معاذ، گوێڕایەڵی هەموو پێشەوایەک بکە، وە جنێو بەهیچ یەکێک لە هاوەڵانم مەدە) .

---

: رواه أحمد في (فضائل الصحابة - ٩) .

**٤٨٤** - حدثنا محمد بن عبد الرحمن الجُعفي، قال : حدثنا حُسين بن علي، عن هانئ بن أيوب، قال : سألتُ مُحارِب بن دِثارٍ عن غيبةِ الرَّافضة؟

فقال : إنَّهم إذًا لقوم صِدقٍ .

قال حُسين : أي لم يرَ بغيبتهم بأسًا .

**٤٨٤** - هانئ بن أيوب ووتی : پرسیارم لە محارب بن دثار کرد دەربارەی غەیبەت کردنی ڕافیزە؟

ووتی : کەواتە بەڕاستی ئەوان کەسانێکی ڕاستگۆن - ئەوانەی غەیبەتی ڕافیزە دەکەن - .

حسین ووتی : واتە وایبینی هیچی تێدا نییە غەیبەتکردنیان .

**٤٨٥** - حدثنا محمد بن عبد الرحمن، قال : حدثنا أبو أسامة، عن زائدة، قال : قلتُ لمنصور : يا أبا عَتَّاب، يصوم أحدنا، ينتقص الذين يبغضون أبا بكر، وعُمر؟

قال : نعم .

**٤٨٥** - زائدة ووتی : به منصور م ووت : ئەی باوکی عتاب هەر یەکێک لە ئێمە بەڕۆژوو دەبێت، ئایا کەموکورتی لەڕۆژووەکەی دەبێت ئەوەی ڕقی لە أبا بکر و عمر بێتەوە؟

ووتی : بەڵێ .

**٤٨٦** - حدثنا محمد بن قُدامة، قال : ثنا ابن عُليَّة، عن ابن عون، قال : سمعت إبراهيم يقول : احذروا هؤلاء الكذَّابين .

**٤٨٦** - إبن عون ووتی : گوێم لە إبراهیم بوو دەیووت : ئاگاداربن ئەوانە درۆزنن - واتە ڕافیزەکان - .

## باب : (٣٣)

## باب تفضيل أصحاب محمد ﷺ

## دەربارەی فەزڵ و پلەبەندی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ



**٤٨٧** - سألت أحمد بن حنبل عن أصحابِ النبيِّ عليه الصَّلاة والسَّلام .

فقال : خيرُ الأُمَّةِ بعد النبيِّ : أبو بكرٍ ، وعُمر ، ثم عثمان على حديث ابن عُمر . قال أحمد : وعليٌّ في الخلفاء .

قلت : أليس تقول : عليٌّ خيرُ مِن بقي بعد الثلاثة في الخلافة؟

قال : هو خليفة .

قلت : ولا يدخلُ في ذلك على طلحةَ ، والزُّبيرِ؟

قال : لا ، أيش على طلحةَ والزُّبير؟! ألا ترى أن عليًّا كان يُقيم الحدود ، ويقسِم الفيء ، ويجمِّع بالنَّاس .

فإن قلت : ليس خليفة ، ففيه شناعة شديدة .

**٤٨٧** - پرسیارم لە أحمد بن حنبل كرد دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ .

وتی : باشترینی ئەم ئومەتە لەدوای پێغەمبەر : أبو بكر و عمر ە، وە عثمان لەسەر حەدیسەكەی إبن عمر .

أحمد وتی : وە علي لە خەلیفەكانە .

وتم : ئایە ناڵێیت : علي باشترین كەسێكە مابێتەوە لەدوای سیانەكەی تر لە خیلافەتدا؟

وتی : ئەو خەلیفەیە .

وتم : ئایە ئەمە طلحة و الزبیر ناگرێتەوە؟

وتی : نەخێر، طلحة و زبیر ی چی؟ ئایە نەتدیوە كە علي سنوورەكانی جێبەجێ دەكرد، وە الفيء دابەش دەكرد، وە خەڵكی كۆدەكردەوە بۆ جەماعەت .

ئەگەر وتت : خەلیفە نیە، ئەوە ئەم وتەیەت ناشیرنیەكی زۆری لە خۆگرتووە .

**٤٨٨** - وسألتُ إسحاق عن أصحاب النبي ﷺ؟

فقال : خيرُ هذه الأُمَّة بعد نبيّها : أبو بكرٍ، ثم عمر، ثم عثمان، ثم عليٌّ .

وقال : هو أفضلُ الأُمَّةِ يومئذ، وهو خليفة عدل، يعني : بعد عثمان .

**٤٨٨** - وە پرسیارم لە إسحاق كرد دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ؟

ووتی : باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەر : أبو بکر، پاشان عمر، پاشان عثمان، پاشان علي .

وە ووتی : ئەو باشترینی ئەم ئوممەتە دەبێت، وە ئەو خەلیفەیەکی دادپەروەرە، واتە لەدوای عثمان .

**٤٨٩** - وسألت عليَّ بن عبد الله .

فقال : أبو بكر، وعمر، وعثمان .

**٤٨٩** - وە پرسیارم لە علي بن عبد الله کرد .

ووتی : أبو بکر و عمر و عثمان ە .

**٤٩٠** - وسألت أبا ثور، قلت : كيف تقول في أصحابِ النبيِّ عليه الصَّلاة والسَّلام؟

قال : خيرُ هذه الأُمّةِ بعد النبيِّ : أبو بكر، ثم عمر، ثم عثمان، ثم الخمسة، وهم : عليٌّ، وطلحةُ، والزُّبيرُ، وسعدٌ، وعبد الرحمن، ورحِمَ الله أبا عبد الرحمن . يعني : مُعاوية .

**٤٩٠** - وە پرسیارم لە أبا ثور کرد ووتم : چی دەڵێیت دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ؟

ووتی : باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەر : أبو بکر، پاشان عمر، پاشان عثمان، پاشان پێنجەکە کە ئەوانیش : علي، طلحة، الزبير، سعد، عبدالرحمن، وە ڕەحمەت لە أبا عبدالرحمن، واتە معاوية .

**٤٩١** - وسمعت هُدبة بن خالد يقول : خيرُ هذه الأُمّةِ بعد نبيّها : أبو بكر، وعُمر، وعثمان، وعليّ .

**٤٩١** - وە گوێم لە هدبة بن خالد بوو دەیووت : باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەر ﷺ : أبو بکر و عمر و عثمان و علي ە .

**٤٩٢** - وسمعتُ أبا الرَّبيع الزَّهراني يقول : خيرُ هذه الأُمَّةِ بعد نبيّها : أبو بكر، ثم عُمر، ثم عثمان، ثم نسكت .

**٤٩٢** - وە گوێم لە أبا الربيع الزهراني بوو دەیووت : باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەر ﷺ : أبو بکر، پاشان عمر، پاشان عثمان، پاشان بێدەنگ دەبین .

**٤٩٣** - حدثنا عبيد الله بن معاذ، عن أبيه، عن بشر بن المُفضَّل : عثمان أفضل مِن عليٍّ .

قلتُ لعبيد الله بن مُعاذٍ : ما كان مذهب أبيك في هذا؟

قال : كان مذهبُ أبي : أن عثمان أفضلُ مِن عليٍّ، كان يقول : أبو بكر، ثم عمر، ثم عثمان .

**٤٩٣** - بشر بن المفضَّل ووتى : عثمان باشتره له علي .

به عبيد الله بن معاذ م ووت : ئايا مه‌زهه‌بى باوكت چى بوو له‌مه‌دا؟

ووتى : مه‌زهه‌بى باوكم ئه‌وه‌يه كه : عثمان باشتره له علي، وه ده‌يووت : أبو بكر، پاشان عمر، پاشان عثمان .

**٤٩٤** - حدثنا محمد بن عبد الأعلى، قال : حدثنا مُعتمر بن سُليمان، قال : كان أبي يقول : خيرُ الأُمَّةِ : أبو بكر، ثم عمر، ثم عثمان .

**٤٩٤** - معتمر بن سليمان ووتى : باوكم ده‌يووت : باشترينى ئه‌م ئوممه‌ته بريتين له : أبو بكر، پاشان عمر، پاشان عثمان .

**٤٩٥** - حدثنا محمد بن عبد الأعلى، قال : حدثنا يزيد بن زُريع، قال : حدثني أيوب، عن أبي قِلابة، وكان عثمانيًّا .

وحدثنا خالد بن عبد الله بن شقيق وكان عثمانياً .

**٤٩٥** - أيوب له أبي قلابة ه‌وه ده‌گێڕێته‌وه كه‌وا عثماني بووه - عثماني ئه‌وانه‌ن كه ده‌ڵێن عثمان سێيه‌م باشترين كه‌سه دواى رسول الله، وه دواى ئه‌وه بێده‌نگ ده‌بن - .

خالد بن عبدالله بن شقيق بۆی گێڕاینەوە ک ئەویش عثماني بوو .

**٤٩٦** - حدثنا أحمد بن حنبل، قال : حدثنا بشر بن شعيب بن أبي حمزة، قال : حدثني أبي، عن الزُّهري، قال : أخبرني سالم ابن عبد الله، أن عبد الله بن عُمر قال : كنَّا نقول ورَسول الله حيٌّ : أفضل أُمَّتِهِ : أبو بكرٍ، ثم عمر، ثم عثمان .

**٤٩٦** - عبدالله بن عمر ووتی : ئێمە لەکاتێکدا رسول الله ﷺ زیندوو بوو دەمانووت : باشترینی ئوممەتەکەی بریتین لە : أبو بکر، پاشان عمر، پاشان عثمان .

**٤٩٧** - حدثنا أحمد بن يونس، قال : حدثنا إسماعيل بن عياش، قال : حدثنا يحيى بن سعيد الأنصاري، عن نافع، عن عبد الله ابن عمر، قال : كُنَّا نتحدَّثُ على عهدِ رسول الله ﷺ أن خيرَ الأُمَّة بعد نبيِّنا : أبو بكرٍ، ثم عمر، ثم عثمان .

**٤٩٧** - عبد الله إبن عمر ووتی : ئێمە قسەمان دەکرد لە زەمانی رسول الله ﷺ کە باشترینی ئوممەت لەدوای پێغەمبەرمان ﷺ بریتین لە : أبو بکر، پاشان عمر، پاشان عثمان .

---

: (رواه البخاري ـ ٣٦٥٥،٣٦٩٧) .

**٤٩٨** - حدثنا أحمد بن حنبل، قال : حدثنا أبو معاوية، قال : ثنا سُهيل بن أبي صالح، عن أبيه، عن ابن عمر، قال : كُنَّا نعدُّ ورسول الله ﷺ حيٌّ، وأصحابه متوافِرون : أبو بكر، وعمر، وعثمان، ثم نسكت .

**٤٩٨** - إبن عمر وتى : ئێمه دەمان ژمارد لەكاتێكدا پێغەمبەر ﷺ زیندوو بوو، وه هاوەڵانی زۆربوون : أبو بكر و عمر و عثمان ە، پاشان بێدەنگ دەبووین .

**٤٩٩** - حدثنا يزيد بن عمرو بن البراء، قال : حدثني عبد الله بن يزيد المقرئ، قال : حدثني عمر بن عُبيد القرني، عن سهيل بن أبي صالح، عن أبيه، عن أبي هريرة، قال : كُنَّا أصحاب رسول الله ﷺ مُتوافِرون، ونحن نقول : خيرُ هذه الأُمَّةِ بعد نبيِّها : أبو بكرٍ الصِّدّيق، وعمر بن الخطاب، وعثمان بن عفَّان، ثم نسكت .

**٤٩٩** - له أبي هريرة رضي الله عنه ووتى : ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ زۆربووین، وه دەمانووت : باشترینی ئەم ئوممەتە لەدوای پێغەمبەر ﷺ : أبو بكر الصديق و عمر بن الخطاب و عثمان بن عفان، پاشان بێدەنگ دەبووین .

**٥٠٠** - حدثنا عَمرو بن عثمان، قال : ثنا سَلم بن عبد الرحمن، قال : حدثني جعفر الواسطي، قال : حدثنا عبد الله بن داود، قال : حدثني سويد، وابن عمرو بن

حُريث، قال : سمعت عَمرو بن حُريث، يقول : سمعتُ عليًّا يقول : ألا إنَّ خيرَ هذه الأُمَّة بعد نبيِّها : أبو بكرٍ، ثم عمر، ثم عثمان .

**٥٠٠** - عمرو بن الحريث دەیووت : گوێم لە علي بوو دەیووت : باشترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی : أبو بکرە، پاشان عومەرە، پاشان عثمان ە .

**٥٠١** - حدثنا عبد الرحمن بن محمد قال : حدثنا عبد الحميد بن عبد الرحمن قال : حدثني صالح بن موسى الطَّلحي، قال : حدثني عاصم بن أبي النَّجود، قال : قلت لزرِّ بن حُبيشٍ : مَن عنى عليٌّ بالثَّالثِ؟

فقال زِرٌّ : كان عليٌّ خيرًا مِن ذلك، وأقرأُ لكتابِ الله مِن ذلك، وأعلمُ مِن ذلك، أن يقوم على منبرِ رسولِ الله ويعني نفسه، ولكن عنى بالثَّالثِ عثمان .

**٥٠١** - عاصم بن أبي النجود ووتی : ووتم بە زر بن حبيش : کێ علي وەک سێیەم کەس - دوای رسول الله ەوە ﷺ - ئاشکرا بکات؟

زر ووتی : علي لەوە باشتر بوو، وە لەوە زیاتر خوێنەری کتابی الله بوو، وە لەوە زاناتر بوو کە هەڵسێتە سەر مینبەری رسول الله ﷺ و خۆی وەک سێیەم کەس بەدیار بخات، بەڵام عثمان بوو سێیەم کەسی ئاشکرا کرد .

**٥٠٢** - سمعتُ إسحاق بن إبراهيم يقول : مَن قدَّمَ عليًّا على عثمان فهو مُخطئ .

**٥٠٢** - گوێم لە إسحاق بن إبراهيم بوو دەیووت : هەر کەسێک علي پێش عثمان بخات ئەوا هەڵەیە .

**٥٠٣** - حدثنا أحمد بن سعيد، قال : سمعت النَّضر بن شُميل، يقول : من قال في بيعةِ عثمان، فقد أزرى على عشرةِ آلافٍ مِن أصحابِ رسولِ الله عليه الصَّلاة والسَّلام اجتمعوا فقدَّموا عثمان .

**٥٠٣** - نضر بن شميل دەڵێت : هەر کەسێک لە بەیعەت پێدانی عثمان دا قسە بکات - بە ناڕازیبوون و ڕەخنە - ئەوا سوکایەتی و ئیهانەی کردووە بە دە هەزار لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ کاتێک کۆبوونەوە و عثمان یان پێشخست .

**٥٠٤** - حدثنا نُصير بن الفرج، قال : حدثنا أبو داود الحَفَرِي، قال : حدثنا مِسعر، عن عبد الملك بن مَيسرة، عن النَّزَّال بن سَبرة، قال : سمعت عبد الله بن مسعود يقول حين استُخلِفَ عثمان : أمَّرنا خير من بقي ولم نألُ .

**٥٠٤** - عبد الله بن مسعود دەڵێت : کاتێک عثمان بوو بە خەلیفە باشترین کەسمان کردە ئەمیر و پێشەوامان لەوانەی کە مابوون وە کەموکوڕییمان نەنواند .

**٥٠٥** - قلتُ لإسحاق: قول النبي ﷺ لعليّ: أنتَ عونٌ لي على عُقرِ حَوضِي؟.

قال: هو في الدنيا يذودُ عنه، ويدعو إليهِ، ويُبيِّنُ لهم، ونحو ذلك مِن الكلامِ، إلَّا أنَّه في الدُّنيا.

**٥٠٥** - به اسحاق م ووت: ئەم قەولەی پێغەمبەر ﷺ کە بە علي ووت کە دەفەرمووێت: (تۆ یارمەتیدەرمی لە ناوەڕاستی حەوزەکەم)؟

ووتی: ئەو لە دونیادا دەیپارێزێ، وە بانگەوازی بۆ لای دەکات، وە بۆیان ڕووندەکاتەوە، وە هاوشێوەی ئەو قسانە، ئەمە لە دونیادایە.

**٥٠٦** - حدثنا أحمد بن سعيد، قال: حدثنا الطَّنافسي، قال: ثنا أبي، قال: أدركتُ النَّاسَ وإنَّما يختلفون عليٍّ وعثمان، فأمَّا أبو بكرٍ وعمر فليس فيهما اختِلاف.

قال أحمد بن سعيد: وكان الفقهاء مُختلفين:

منهُم مَن يقول: أبو بكر، وعمر، ويقف، منهم: الشَّعبي، وإبراهيم، والكوفيون، وسعيد بن جُبير، وأبو البختري، وغيرهم، وعُبيد بن عُمير، وقومٌ مِن أهلِ البصرةِ وقفوا.

وكان قومٌ يقولون: أبو بكرٍ، وعُمر، وعُثمان، وعليّ.

وكان قوم يُقال لهم: الشِّعة، وليسوا بخارِجين، ولا مُنسوبين إلى البدعةِ يقولون: أبو بكر، وعُمر، وعلي.

وكان قومٌ يقال لهم : عُثمانية، يقولون : أبو بكر، وعمر، وعثمان، ويسكتون، منهم : سعيد بن أبي عَروبة، وحماد بن زيد، وهِشام بن أبي عبد الله، وغيرهم .

وكان قومٌ مِن أهلِ البصرة يقفون في عليٍّ وعُثمان، منهم : يحيى بن سعيد، وسُليمان التَّيمي، ومُعتمر بن سُليمان، وخالد ابن الحارث .

**٥٠٦** - طنافسي ووتى : باوكم ووتى : گەيشتووم بە خەڵكى ڕاجياواز بوون دەربارەی عثمان و علي، ئەمما أبوبكر و عمر ڕاجياييان تێدا نييە .

أحمد بن سعيد ووتى : فيقهزانەكان ڕاجياواز بوون :

تێياندايە دەڵێن : أبوبكر پاشان عمر، پاشان دەوەستێت، لەوانە : شەعبى، إبراهيم، كوفييەكان، وە سعيد بن جبير، وە أبو البختري، وە جگە لەوان و أبو عمير، وە كۆمەڵێك لە خەڵكى بەسرەش وەستابوون .

وە كۆمەڵێكيش دەيانووت : أبوبكر، پاشان عمر، پاشان عثمان، پاشان علي

.

وە كۆمەڵێك پێيان دەووترا شيعە، خوارج نەبوون و پاڵنەدرابوون بۆ لای بيدعەوە، دەيانووت : أبوبكر، وە عمر، وە علي .

وە كۆمەڵێك پێيان دەووترا عثمانييەكان، دەيانووت : أبوبكر، وە عمر، وە عثمان، پاشان بێدەنگ دەبوون، لەوانە سعيد بن عروبة و حماد بن زيد و هشام بن أبي عبد الله، وە جگە لەوان .

وه كۆمەڵێك لە خەڵكى بەسرە لە علي و عثمان دا دەوەستان، لەوانە : يحيى بن سعيد، سليمان التيمي، وه معتمر بن سليمان، وه خالد ابن حارث .

**٥٠٧** - حدثنا أبو حفص، قال : ثنا عباس بن طالب، قال : ثنا حماد ابن زيد، بن أيوب، قال : قدِمتُ المدينة والنَّاسُ بها مُتوافِرون : القاسم بن محمد، وسُليمان بن يسار، وغيرهم، فما اختُلِفَ على أحدٍ منهم في تقدمة أبي بكر، ثم عمر، ثم عثمان .

قال : حماد بن زيد : وذاك رأي أيوب، وهو رأينا .

**٥٠٧** - حماد بن زيد لە أيوب ـەوە بۆی گێڕاینەوە، ووتی : چووین بۆ مەدینە خەڵكێكی زۆری لێبوو : قاسم بن محمد و سليمان بن يسار، وە جگە لەوان، هیچ یەكێك لەوان ڕاجیایی لا درووست نەبوو لە پێشخستنی أبوبكر، پاشان عمر، پاشان عثمان .

حماد بن زيد ووتی : ڕاو بۆچوونی أيوب یش بە هەمان شێوەیە، وە ئەوە بۆچوونی ئێمەشە .

**٥٠٨** - وسمعت عبد الله بن سوَّار العنبري، قال : السُّنَّةُ عِندنا وما أدركنا عليه حمادًا، وحمادًا، والنَّاس الذين يُقتدى بهم :

تقديم أبي بكر، ثم عمر، ثم عثمان .

والحبُّ لأصحابِ رسول الله ﷺ جميعًا .

والكفُّ عن ذكرِ مساوئهم، وعظيم الرَّجاء لهم بصُحْبةِ رسولِ الله ﷺ .

والإيمان قولٌ وعملٌ .

**٥٠٨** - وە گوێم لە عبدالله بن سوَّار العنبري بوو ووتی :

سوننەت لای ئێمەیە وە ئەوەشە کە پێی گەیشتووین کە حماد لە سەری بووە، وە حماد و ئەو خەڵکانەی دەکرێنە پێشەنگ پێیان وایە :

پێشخستنی أبوبکر، پاشان عمر، پاشان عثمان .

وە خۆشەویستی بۆ هاوەڵانی رسول الله ﷺ گشتیان .

وە دەست هەڵگرتن لە باسکردنی خراپەکانیان، وە هەبوونی ئومێدێکی زۆر بۆیان بەوەی کەوا هاوەڵی رسول الله یان کردووە ﷺ .

وە ئیمان یش وتە و کردەوەیە .

**٥٠٩** - حدثنا يحيى بن عبد الحميد، قال : ثنا حصين بن عمر الأحمسي، قال : حدثنا مُخارق، عن طارق، عن عثمان، قال : سمعت النبي ﷺ يقول : مَن أحبَّ العربَ فبحُبي أحبَّهم، ومَن أبغضَ العربَ فببُغضي أبغضَهُم .

**٥٠٩** - عثمان ووتى : گوێم له پێغەمبەر ﷺ بوو كه دەفەرمووێت : (هەر كەسێك عەرەبى خۆشبووێت ئەوا بە خۆشويستنى خۆم خۆشم دەوێن، وه هەر كەسێك ڕقى لەوان بێت ئەوا بە ڕق لێبوونەوەى خۆم ڕقم لێيان دەبێتەوە) .

**٥١٠** - حدثنا أبو الرَّبيع الزَّهراني، قال : ثنا شجاع بن الوليد، عن قابوس بن أبي ظبيان، عن أبيه، عن سلمان، قال : قال لي رسول الله ﷺ : يا سلمان، لا تُبغِضُنِي فتُفارقَ دينك .

قلتُ : يا رسول الله، كيف أُبغضُكَ وبك اهتديتُ؟

قال : تُبغضُ العربَ فتُبغِضُني .

**٥١٠** - سلمان ووتى : رسول الله ﷺ به منى فەرموو : (ئەى سەلمان ڕقت لێم نەبێت لەئەنجامدا دینەكەت لە دەست بدەى) .

ووتم : ئەى رسول الله چۆن ڕقم لێت بێت، له كاتێكدا بەهۆى تۆوه هيدايەت دراوم؟

فەرمووى : (ڕقت له عەرەب دەبێتەوه له ئەنجامدا ڕقت له منيش دەبێتەوه) .

**٥١١** - حدثنا أبو عبد الرحمن النيسابوري، قال : حدثنا عبد الرحمن ابن قيس، عن محمد بن عَمرو، عن أبي سلمة، عن أبي هريرة، قال : قال رسول الله ﷺ : مَن أحبَّ

العربَ فقد أَحبَّني، ومَن أحبَّني فقد أحبَّ اللّهَ، ومَن أبغضَ العربَ فقد أبغضني، ومَن أبغضني فقد أبغضَ الله .

**٥١١** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەسێک عەرەبی خۆشبووێت ئەوا منی خۆشویستووە، وە هەر کەسێک منی خۆشبووێت ئەوا اللهی خۆشویستووە، وە هەر کەسێک ڕقی لە عەرەب بێت ئەوا ڕقی لە من بۆتەوە، وە هەر کەسێک ڕقی لە من بێتەوە ئەوا ڕقی لە الله بۆتەوە) .

**٥١٢** - حدثنا العلاء بن عَمرو الحنفي، قال : حدثنا يحيى بن يزيد الأشعري، عن ابن جُريج، عن عطاء، عن ابي عباس، قال : قال رسول الله عليه الصَّلاة السَّلام : أُحِبُّ العربَ لثلاثٍ : لأنِّي عربي، والقرآنُ عربي، وكلامُ أهلِ الجنَّةِ عربي .

**٥١٢** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (عەرەبم خۆشدەوێت لەبەر سێ شت : چونکە من عەرەبم، وە قورئان بەزمانی عەرەبییە، وە قسە کردنی ئەهلی بەهەشت بە عەرەبییە) .

**٥١٣** - حدثنا أبو معن الرَّقاشي، قال : حدثنا عبد الله بن بُكير السَّهمي، عن محمد بن ذكوان، عن عَمرو بن دينار، عن ابن عمر، أن رسول الله ﷺ قال : إنَّ اللّهَ اختارَ مِن السَّماواتِ، فاختارَ العُليا فسكنها، وأختارَ مِن الأرضين العُليا، فأسكنها مَن

شاءَ مِن خلقِهِ، ثم اختارَ مِن بني آدمَ، فاختارَ العربَ، ثم أختارَ قُريشًا، فمنَ أحبَّ العربَ فبحبِّي أحبَّهُم، ومَن أبغضَ العربَ، فببغضي أبغَضَهُم .

**٥١٣** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (الله تعالى ئاسمانەکانی هەڵبژارد، ئاسمانی سەرەوەی هەڵبژارد - ئاسمانی حەوتەم - و لێی نیشتەجێ بوو، وە لە زەویشدا بەرزترینی هەڵبژارد و ئەوەی ویستی لە درووستکراوەکانی خۆی تێیدا نیشتەجێی کرد، پاشان لە بەنی ئادەم عەرەبی هەڵبژارد، پاشان قورەیشی هەڵبژارد، هەر کەسێک عەرەبی خۆشبوێت ئەوا بە خۆشویستنی خۆم خۆشم دەوێن، وە هەر کەسێک ڕقی لە عەرەب بێت ئەوا بەڕق لێبوونەوەی خۆم ڕقم لێیان دەبێتەوە) .

**٥١٤** - حدثنا يحيى بن عبد الحميد، قال : حدثنا قيس، عن ثابت أبي المقدام، عن حَبَّة العُرني، قال : سمعت عليًّا قال : قال النبي ﷺ : يا علي، أُوصِيك بالعربِ خيرًا، يا علي، أُوصِيك بالعربِ خيرًا، يا علي، أوصِيك بالعربِ خيرًا) .

**٥١٤** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ئەی علي ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی کە لەگەڵ عەرەب باشبیت، ئەی علي ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی لەگەڵ عەرەب باشبیت، ئەی علي ئامۆژگاریت دەکەم بەوەی لەگەڵ عەرەب باشبیت) .

# باب : (٣٥)

# باب فضل الموالي

# فەزڵی الموالي (بەردەست و هاوكارە مسوڵمانەكانی عەرەب كە غەیرە عەرەبن لە فارس و ئەفریقی و كورد و تورك)



**٥١٥** - حدثنا يحيى بن عبد الحميد، قال : حدثنا سُليمان يعني : ابن بلال عن عَمرو بن أبي عَمرو، عن عكرمة، عن ابن عباس، قال : شهد بدرًا مع النبي عليه الصَّلاة والسَّلام عشرون رجلًا من الموالي .

**٥١٥** - إبن عباس رضي الله عنهما فەرمووی : بیست پیاو لە الموالي ئامادەی جەنگی بەدر بوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ .

**٥١٦** - حدثنا عبد الرحمن بن عبد الوهاب، قال : ثنا منصور بن زيد أبو عبد الرحمن الموصلي، قال : ثنا محمد بن فضيل بن غزوان، عن أبيه، عن الرَّحَّال بن سالم،

عن عطا بن أبي رباح قال : قال رسول الله ﷺ : لا يُبغِضُ الموالي إلَّا مُنافِقٌ، ولا يكون الأبدالُ إلَّا مِن الموالي .

**٥١٦** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (كەس رقی لە مەوالیەكان نابێتەوە ئیللا مونافیق نەبێ، ئەبدالەكانیش تەنها لەناو مەوالیەكان دەبن - ئەبدال : بریتین لە خواپەرست و ئەولیاكان - ) .

**٥١٧** - حدثنا الحسن بن قزعة، قال : ثنا مسلمة بن علقمة، قال : حدثنا داود بن أبي هند، قال : لما أمرَ ابن الزُّبير ببناءِ البيتِ، قال : استعينوا بأهلِ فارِس، فإنَّهم مِن ولدِ إبراهيم .

**٥١٧** - داود بن أبي هند ووتی : لەوكاتەی الزبير فەرمانی كرد بە دروستكردنی كەعبە، ووتی : داوای یارمەتی بكەن لە ئەهلی فارس، چونكە ئەوان لە كوڕانی پێغەمبەر إبراهیم ـ عليه السلام .

## باب : (٣٦)

## في الأنبياء صلوات الله عليهم

## دەربارەی پەیامبەرانی الله صلاة و سەلامی الله یان لێبێت



**٥١٨** - حدثنا علي بن عثمان، قال : ثنا هُشيم، قال : أخبرنا العوَّام ابن حوشب، قال : أخبرني القاسم بن عوف، قال : قال كعب : أما إدريس فإنَّه كان رجُلًا صالحًا، وكان خيَّاطًا يتعبَّدُ لله، ويصوم، ويُصلِّي، ويتصدَّق بكسبِهِ ما فضُلَ عن قوتِه .

**٥١٨** - كعب وتی : ئەمما إدريس بەڕاستی پیاوێکی ساڵح و چاکەکار بوو، وە بەرگدروو بوو خواپەرستی دەکرد بۆ الله و بەڕۆژوو دەبوو و نوێژی دەکرد، وە وە ئەوەی زیاد دەبوو لە قوت و خۆراکەکەی کە بە ڕەنجی خۆی دەستی کەوتبوو دەیبەخشی .

**٥١٩** - حدثنا علي، قال : ثنا حماد بن سلمة، قال : أخبرنا ثابت البُناني، عن أبي رافع، عن أبي هريرة، أن رسول الله ﷺ قال : إنَّ زكريًّا كان نجَّارًا .

**٥١٩** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (زەکەریا دارتاش بوو) .

**٥٢٠** - حدثنا أحمد، قال : حدثنا هارون، قال : حدثنا ضمرة، عن ابن عطاء، عن أبيه، قال : كان سُليمان يعمل الخُوصَ بيديه، ويأكل خبز الشَّعير .

**٥٢٠** - إبن عطاء لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە وتی : سلیمان کاری لەسەر گەڵای دار خورما دەکرد، وە نانی جۆی دەخوارد .

**٥٢١** - حدثنا محمد بن عبد الرحمن، قال : حدثنا أبو أسامة، عن هِشام بن عُروة، عن أبيه، قال : كان داود يخطبُ النَّاس على المنبر، وإنّه ليعمل الخُوصَ بيده، فيعمل منه القُفَّة، أو الشيء، ثم يبعث به مع مَن يبيعه، ويأكل مِن ثمنِهِ .

**٥٢١** - هشام بن عروة لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، ووتی : داود وتاری دەدا بۆ خەڵک لەسەر مینبەر، وە بەدەستی خۆی لە گەڵای دار خورما سەبەتەی درووست دەکرد، یان شتێک، پاشان دەینارد بۆ کەسێک بیفرۆشێ، پاشان لە نرخەکەی نانی دەخوارد .

**٥٢٢** - حدثنا بشَّار بن موسى، قال : ثنا عباد، قال : حدثنا يحيى ابن سعيد، عن سعيد بن المُسيّب، قال : لا خيرَ فيمن لا يطلب المال فيقي به دينه، ويصون به عرضه، ويقضي به ذمامَهُ، وإن مات تركه ميراثًا لمن بعده .

**٥٢٢** - سعيد بن مسيب ووتى : خێر نییه له كهسێكدا پاره پهیدا ناكات دینهكهی پێ بپارێزێ، وه نامووسی خۆی پێ بپارێزێ، وه حهق و مافی خۆی پێ بدات، وه ئهگهر مرد میرات جێبهێڵێ بۆ ئهوانهی دوای خۆی .

**٥٢٣** - حدثنا سعيد بن منصور، قال : حدثنا خالد بن عبد الله، عن بيان، قال : سمعت عبد الرحمن بن هلال يقول : أوصى أبو الدَّرداء رجُلًا مِنَّا، فقال له : صلِّ ونَم، وصُم وأفطر، واعطِ وامنع، واجمع المال، ولا تأثم .

**٥٢٣** - عبد الرحمن بن هلال دهڵێت : أبو درداء پیاوێک له ئێمهی وهسێت كرد، ووتى : نوێژ بكه و بخهوه، وه بهڕۆژوو به و ڕۆژووش بشكێنه، ببهخشه و ڕێگریش بكه، وه پاره و ماڵیش كۆ بكهوه و خۆت گوناهبار مهكه .

**٥٢٤** - حدثنا أبو معن، قال : حدثنا ابن سنان، قال : حدثنا إسماعيل بن عياش، عن يعقوب بن محمد، قال : كنا نعالج البزَّ، فكان يمُرُّ بنا إسحاق بن بشار، فيقول لنا : الزموا تجارتكم، فإن أباكم إبراهيم كان بزَّازًا .

**٥٢٤** - يعقوب بن محمد وتی : ئێمە قوماشمان چاك دەكرد، وە إسحاق بن بشار بەلاماندا تێدەپەڕی، پێی دەوتین : پابەندبن بە بازرگانییەكەتانەوە، چونكە بەڕاستی باوكتان إبراهیم كاری قوماش و پۆشاك فرۆشتنی دەكرد .

## باب : (٣٧)

# باب في فضل التمسك بالسنة وتعليمها

# دەربارەی فەزڵ و گەورەیی دەستگرتن بە سوننەتەوە و فێر کردنی



**٥٢٥** - حدثنا أبو محمد عبد الله بن محمد بن يحيى، قال : حدثنا سُفيان بن عُيينة، عن عياض، عن أبي وائل، عن جرير بن عبد الله، عن النبي ﷺ قال : مَن سنَّ سُنَّةً حسنةً فعمِلَ بها مَن بعدَهُ، كان له مِثلُ أجرِ مَن عمِلَ بها، ولا يَنقُصُ ذلك مِن أجرِهِ شيئًا، ومَن سنَّ سُنَةً سيئةً فعمِلَ بها مَن بعدَهُ، كان عليهِ مِثلُ وِزرِ مَن عملَ بها، ولا ينقُصُ ذلك مِن أوزارِهِم شيئًا .

**٥٢٥** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەر کەسێک سوننەتێک و کارێکی چاک ئەنجام بدات و کەسانی دوای خۆی کاری پێبکەن، ئەو کەسە پاداشت و اجری بۆ هەیە وەک ئەو کەسەی کە کاری پێکردووە، ئەمەش هیچ لە پاداشتی کەسەکە کەم ناکات، وە هەر کەسێک سوننەت و ڕێبازێکی خراپ بگرێتە

بەر و کەسانی دوای خۆی کاری پێبکەن، ئەوا تاوانی بۆ هەیە هاوشێوەی ئەو کەسانەی کاریان پێکردووە، ئەمەش هیچ لە تاوانی ئەوان کەم ناکات) .

**٥٢٦** - حدثنا عبد الله بن محمد، قال : حدثنا أبو يعقوب الحنفي، عن كثير بن عبد الله، عن أبيه، عن جده، قال : قال رسول الله ﷺ : إنَّ هذا الدِّين بدأ غريبًا، وسيعودُ كما بدأ، فطُوبى للغُرباءِ .

قيل : يا رسول الله، ومَن الغُرباء؟

قال : الذي يُحيون سُنَّتِي مِن بعدي، ويعلِّمونها النَّاس .

**٥٢٦** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (بەڕاستی ئەم دینە بە نامۆیی دەستی پێکرد، وە بە هەمان شێوەی لێدێتەوە کە سەرەتا دەستی پێکرد، سەرەنجام خۆشبەختی بۆ نامۆکان) .

ووترا : ئەی رسول الله، نامۆکان کێن؟

فەرمووی : (ئەوانەی لە دوای من سوننەتەکانی من زیندوو دەکەنەوە، وە فێرە خەڵکی دەکەن - واتە خەڵکی فێری سوننەتی رسول الله ﷺ دەکەن، والله اعلم - ) .

**٥٢٧** - حدثنا عباس بن الوليد، قال : ثنا عبد الجبار بن مظاهر الجشمي، قال : حدثني معمر بن راشد، قال : سمعت ابن شِهاب الزُّهري يقول : تعليم سُنَّة أفضل مِن عِبادة مائتي سَنَة .

قال عباس : سمعتُ مروان يسأله عن هذا الحديث، فحدَّثه .

**٥٢٧** - ابن شهاب الزهري دەڵێت : فێر کردنی سوننەتێک فەزڵی زیاترە لە خواپەرستی دوو سەد ساڵ .

عباس ووتی : گوێم لە مەروان بوو پرسیاری لێدەکرد دەربارەی ئەم قسەیە، ئەویش بۆی گێڕایەوە .

**٥٢٨** - حدثنا محمد بن حفص القطان، قال : حدثنا عبد الرحمن ابن مهدي، قال : سمعت مالك بن أنس، قال : قال عمر بن عبد العزيز، سَنَّ رسول الله ﷺ وولاة الأمرِ بعده سُننًا، الأخذ بها : تصديق بكتابِ الله، واستكمال لطاعتِهِ، وقوَّة على دينِ الله، مَن عملِ بها مُهتدٍ، ومن استنصرَ بها منصور، ومن خالفها، اتبع غير سبيل المؤمنين، وولَّاهُ اللهُ ما تولَّى .

**٥٢٨** - عمر بن عبدالعزيز ووتی : رسول الله ﷺ و وەلی أمری مسوڵمانان لە زوای خۆی چەند سوننەت و ڕێبازێکیان کردە سوننەت، دەستگرتن پێیانەوە : بەڕاست دانانی کتابی الله عزوجل ە، وە تەواو کردنی گوێڕایەڵیکردنیەتی، وە هێزە بۆ سەر دینی الله، هەر کەسێک کار بکات پێیان ئەوا هیدایەتدراوە، وە هەر کەسێک

خۆی پێ سەر بخات سەر خراوە، وە هەر کەسێک پێچەوانەی کرد، ئەوا ڕێگەی غەیری ئیمانداارانی گرتۆتەبەر، الله ش ڕووی ئەو کەسە دەکاتە ئەو بەرنامە و ڕێبازەی بە ئارەزووی خۆی هەڵیبژاردووە.

# باب : (٣٨)

# باب في مسألة أصحاب الرأي

# دەربارەی پرسیار کردن لە خاوەن ڕەئی و بیر و بۆچوونەکان



**٥٢٩** - قيل لأحمد: رجل نزلت به مسألة، فلم يجد مَن يسأله، أيسأل أهل الرَّأي؟

قال: لا يسأل أهل الرَّأي عن شيءٍ البتَّة.

.. لغير الدِّين.

**٥٢٩** - بە أحمد ووترا: پیاوێک پرسیارێکی بۆ دروستبووە، وە کەسێک نادۆزێتەوە لێی بپرسێ، ئایا پرسیار بکات لە خاوەن ڕەئی؟

ووتی: هەرگیز پرسیار ناکات لە خاوەن ڕەئی بۆ هەر شتێک.

.. بۆ جگە لە دین - واتە بۆ جگە لەدینیش پرسیاریان لێ ناکرێت، والله اعلم -.

**٥٣٠** - حدثنا الأزهر، قال : سمعت حبيبًا كاتب مالك، يقول : قال مالك : كانت فِتنةُ أبي حنيفة أضرَّ على هذه الأُمَّة مِن فتنة إبليس في الوجهين جميعًا : في الإرجاء، وما وضع مِن نقضِ السُّنن .

**٥٣٠** - حبيب نووسەری مالک، دەیووت : مالک ووتی : فیتنەی أبو حەنیفة بۆ سەر ئەم ئوممەتە زیانی زیاتر بوو لە فیتنەی إبلیس گشتی لە دوو ڕووەوە : لە إرجاء دا، وە کەمکردنەوەی سوننەتەکان - سوننەت واتای حدیث یش دەدات والله أعلم - .

**٥٣١** - حدثنا عبدة بن عبد الرحيم بن حسَّان، قال : ثنا معروف بن حسَّان السَّمرقندي، قال : كنت عند الأعمش وهو مريض، فأتاه أبو حنيفة يعوده، فقال له أبو حنيفة : لولا أني أثقل عليك لعدّتك كلّ يوم .

فقال الأعمش : من هذا؟

قال : أبو حنيفة .

قال : والله إنَّك لتثقل عليَّ وأنت في منزلِكَ، فكيف إذا عدتني .

**٥٣١** - معروف بن حسَّان سمرقندي ووتی : لە لای الأعمش بووم نەخۆش بوو، أبو حەنیفة هات بۆ لای بەسەری بکاتەوە، أبو حەنیفة ووتی : ئەگەر لەسەرت قورس نەبووایە هەموو ڕۆژ بەسەرم دەکردییەوە .

الأعمش ووتی : ئەمە کێیە؟

ووتى : أبو حەنيفة .

ووتى : واللە ى تۆ لە ماڵى خۆتدا قورسيم لەسەر درووست دەكەى، ئەى چۆن كە سەردانيم بكەى .

**٥٣٢** - حدثنا محمد بن يحيى بن عبد الكريم، قال : حدثنا عبد الله ابن داود، قال : حدثني أشعث صاحبٌ لي، قال : سمعت الأعمش يقول : إنَّما مثل أبي حنيفة مثل رجلٍ خرج بالليلِ فرأى سَوادًا فظنَّ أنَّها تمرة، فإن أخطأه أن يكون غير ذلك كان جرو كلبٍ .

**٥٣٢** - الأعمش ووتى : نمونەى أبو حەنيفة وەک پیاوێکە بە شەو بچێتە دەرەوە ڕەشايەتييەک ببينێ وايزانيوە خورمايە، هەڵەى كرد و جگە لەوە بوو توتكە سەگێک بوو .

**٥٣٣** - حدثنا عبد العزيز بن أبي سهل، قال : حدثنا منصور بن أبي مزاحم، قال : سمعت شريك بن عبد الله يقول : لَأن يكون في كلِّ رَبعٍ مِن أرباعِ الكوفةِ خمَّارٌ يبيعُ الخَمْرَ، خيرٌ مِن أن يكون فيه يقول بقول أبي حنيفة .

**٥٣٣** - شريک بن عبد الله دەڵێت : ئەگەر لە هەر ماڵێک لە ماڵەكانى كوفە عەرەق خۆرێک هەبێ عەرەق بفرۆشێ، باشترە لەوەى كەسێكى لێبێ بە قسەى أبو حەنيفة قسە بكات .

# باب : (٣٩)

# بقية الباب في قول أبي حنيفة

# ئەوەی ماوە دەربارەی قسەی أبو حەنیفة



**٥٣٤** - حدثنا محمد بن يحيى، قال : حدثنا نعيم بن حماد، قال : سمعت ابن عُيينة يقول : لما قَدمتُ الكوفة حدثتهم، فكان فيما حدثتهم من حديث عَمرو، عن جابر بن زيد .

فقالوا : إنَّ أبا حنيفة يرويه عن عَمرو، ويقول : جابر بن عبد الله .

قال قلتُ : لا، إنَّما هو جابر بن زيد .

قال : فأتوه فأخبروه، فقال أبو حنيفة : لا تُبالوا، إن شئتم فاجعلوه جابر بن عبد الله، وإن شئتم جابر بن زيد .

**٥٣٤** - ابن عيينة دەڵێت : کاتێک چووم بۆ کوفە حدیث یان بۆ بگێڕمەوە، لەوانەی کە بۆم باس دەکردن حدیث ی عمرو بوو لە جابر بن زید .

ووتیان : أبو حەنیفة دەیگێڕێتەوە لە عمرو، دەڵێ جابر بن عبد الله .

ووتی : ووتم : نا، بەڕاستی جابر بن زيد ه .

ووتی : چوونه لای و پێیان ووت، أبو حەنيفة ووتی : گوێی پێ مەدەن، ئەگەر ویستتان بیکەنه جابر بن عبد الله، وە ئەگەریش ویستتان بیکەنه جابر بن زيد .

**٥٣٥** - حدثنا عبدة بن عبد الرحيم، قال : أخبرنا سلمة بن سليمان، قال : قال ابنُ المُبارك : كنت آتيه يعني : أبا حنيفة سِرًّا من سفيان وأصحابنا .

**٥٣٥** - ابن مبارک ووتی : دەچووم بۆ لای واته : أبو حەنيفة، به نهێنی له سوفیان و هاوەڵەکانمان .

**٥٣٦** - حدثنا محمد بن يحيى، قال : سمعت إسحاق بن إبراهيم يقول : قيل لأبي حنيفة حديث علي بن أبي طالب : الوضوءُ نِصفُ الإيمان .

فقال : (...) حسن من هذا .

قلت لإسحاق : من يحكيه عن أبي حنيفة؟

قال : الشَّيباني .

**٥٣٦** - إسحاق بن إبراهيم دەڵێت : فەرموودەی علي بن أبي طالب ووترا به أبو حەنيفة : دەسنوێژ نيوەی ئيمانه .

ووتی : (..) حسنه لەمەدا .

به إسحاق م ووت : كێ دەیگێڕێتەوە لە أبو حەنیفة؟

ووتی : شەیباني .

**٥٣٧** - حدثنا أبو الأزهر، قال : حدثنا منصور بن أبي مزاحم، عن أبي صالح الفراء، قال : سمعت أبا إسحاق الفزاري يقول : حدَّثْنا أبا حنيفة بحديث عن النبي عليه الصَّلاة السَّلام في رَدَّ السَّيفِ .

فقال : هذا حديث خُرافة .

**٥٣٧** - أبي صالح الفراء ووتی : گوێم لە أبا إسحاق الفزاري بوو دەیووت : أبو حەنیفة ئەم فەرموودەی رسول الله ی ﷺ بۆ گێڕاینەوە دەربارەی هەڵکێشانی شمشێر دژی وەلی أمری مسوڵمان .

ووتی : ئەم فەرموودەیە خورافە و خەیاڵاتە .

**٥٣٨** - حدثنا عباس ...

**٥٣٨** - عباس بۆی گێڕاینەوە ...

**٥٣٩** - قال حرب الكرماني : ثنا إسحاق يعني : بن راهويه قال : ثنا مؤمل بن إسماعيل، قال : ثنا سُفيان الثوري، قال : ثنا عباد، قال : قلت لأبي حنيفة : يا أبا حنيفة، رجل قال : أنا أعلم أن الكعبة حقّ، ولكن لا أدري هي التي بمكة أو هي التي بخراسان . أمؤمن هو؟ قال : نعم .

قال مؤمل : قال سفيان : أنا أشهد أنه عند الله من الكافرين حتى يستبين أنها الكعبة المنصوبة الحرم .

قال : قلت : رجل قال : أنا أعلم أن محمدًا نبي، وهو رسول، ولكن لا أدري هو محمد الذي كان بالمدينة من قريش أو محمد آخر . مؤمن هو؟ قال : نعم، هو مؤمن .

قال مؤمل : قال سُفيان : هو عند الله من الكافرين .

**٥٣٩** - عباد ووتی : ووتم به أبو حەنيفة : ئەی أبو حەنيفة، پياوێك دەڵێت : من دەزانم كەعبە حەق و ڕاستييە، بەڵام نازانم ئايا ئەوەيانە كە لە مەككەيە يان ئەوەی لە خوراسانە، ئايا ئەو كەسە بڕواداره؟

ووتی : بەڵێ .

مؤمل ووتی : سفيان ووتی : من شايەتی دەدەم كەوا ئەو كەسە لە لای الله لە بێ باوەڕانە هەتا وەكو بە دوای ڕوونكردنەوە دەگەڕێ دەربارەی ئەو كەعبە جێگير كراوەيە لە مەككە .

ووتی : ووتم : پیاوێک دەڵێت من دەزانم محمد پێغەمبەرە، وە نێردراوە، بەڵام نازانم ئایا ئەو محمدەیە کە لە مەدینە بوو لە ناو قورەیش یان محمدێکی ترە، ئایا بڕوادارە ئەو کەسە؟

ووتی : بەڵێ بڕوادارە .

مؤمل ووتی : سفیان ووتی : ئەوە لە لای الله تعالی لە بێ باوەڕان هەژمار دەکرێت

.

# پاشکۆی کتێب



والحمد لله الذي هدانا لهذا وما كنا لنهتدي لولا أن هدانا الله, ونسأله الثبات على الإسلام والسُّنة حتى الممات .

ئەمە پاشکۆیەکە تێیدا ژمارەیەکی زۆر لە ئەثەرم تێدا کۆکردۆتەوە لە باب ەکانی سوننەت و بیروباوەڕ کەوا گێڕدراونەتەوە لەڕێی حرب بن إسماعيل الكرماني رحمه الله، وە کۆمکردونەتەوە :

**١** - لەوانەی دانەرەکە باسی کردووە بەجیا لە کتێبەکەی مسائل لە جگە لە باب ەکانی سوننە .

**٢** - لەوانەی ئەهلی علم گێڕاویانەتەوە لە دانراوەکانیاندا لەڕێگەی حرب ەوە رحمه الله .

منیش وام بە باش زانی ئەم ئەثەرانە کۆبکەمەوە و ڕێکیان بخەم لە باب ەکاندا بۆ تەواوکردنی سوود و فائیدەکانی .

حەمد و شوکر بۆ ئەو الله یەی کە هیدایەتی داین بۆ ئەوە و ئێمە هیدایەتمان وەرنەدەگرت ئەگەر الله هیدایەتی نەدابایەن، وە داوای جێگیری لێدەکەین لەسەر ئیسلام و سوننەت تاوەکو مردن .

الحمد الله رب العالمين والصلاة والسَّلام على رسوله ﷺ، وعلى آله وسلم تسليمًا كثيرًا.

# باب : (١)

# باب في الاستثناء في الإيمان

# دەربارەی إستثناء لە ئیماندا



**١ \ ٥٤٠** - قال الخلال : أخبرني حرب بن إسماعيل، قال : سمعت أحمد يقول في التسليم على أهل القبور أنَّه قال : وإنَّا إن شاء الله بكم لاحقون .

قال : هذا حُجَّة في الاستثناء في الإيمان، لأنه لا بدَّ من لحوقهم، ليس فيه شَكٌّ .

وقال الله عزوجل : ﴿لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ﴾ **[الفتح : ٢٧]**, وهذه حُجَّة أيضًا لأنَّه لا بُدَّ داخلوه .

**١** - خلال ووتی حرب بن إسماعيل هەواڵی پێدام ووتی : گوێم لە أحمد بوو دەیووت : دەربارەی سەلام کردن لە ئەهلی گۆڕستان کە ووتی : وە ئێمەش إن شاء الله بە ئێوە دەگەینەوە .

ووتی : ئەوە بەڵگەیە بۆ إستثناء کردن لە ئیماندا، چونکە گومان لەبەیەک گەیشتنەوەدا نییە .

الله دەفەرمووێت : ﴿لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ﴾ **[الفتح : ٢٧]** .

واتە : بەم زووانە ئێوە بە هەموو ئارامی و ئاسوودەییەکەوە بەویستی الله دەچنە ناو کەعبەی پیرۆزەوە .

وە ئەمەش بەڵگەیە بەهەمان شێوە، لەبەرئەوەی گومانی تێدا نییە کەوا دەچنە ناویەوە .

**٢ \ ٥٤١ -** قال الخلال : أخبرني حرب, قال : سئل أحمد : ما تقول في الاستثناء في الإيمان؟

قال : نحن نذهبُ إليه .

قيل : الرجل يقول : أنا مؤمن إن شاء الله؟

قال : نعم .

**٢ -** خلال ووتی : حرب هەواڵی پێدام ووتی : پرسیارکرا لە أحمد : چی دەڵێیت دەربارەی إستثناء لە ئیماندا؟

ووتی : ئێمە وای بۆ دەچین بەوجۆرە درووست بێت .

وترا : کەسێک دەڵێت : من ئیماندارم إن شاء الله؟

ووتی : بەڵێ .

**٣ \ ٥٤٢ -** قال الخلال : أخبرني حرب الكرماني، وسُليمان بن الأشعث السّجستاني - المعنى قريب قال حرب : ثنا أحمد، قال سمعت سُفيان .

وقال سُليمان : سمعت أحمد قال : سمعت سفيان يقول : إذا سئل مؤمن أنت؟

إن شاء لم يُجبه، وسؤالك إيَّاي بدعة، ولا أشكُّ في إيماني .

قال: إن شاء الله، ليس يكره، ولا يداخل الشَّكّ .

**٣ -** سفيان دەڵێت : ئەگەر پرسیارت لێکرا ئایا تۆ ئیمانداری؟

ئەگەر ویستی وەڵامی ناداتەوە، وە پرسیارکردنەکەت لە من بیدعەیە، وە گومانم لە ئیمانم نییە .

ووتی : إن شاء الله، نادرووست نییە، وە ناچێتە ناو گومانەوە .

## باب : (٢)

## باب تفسير حديث النبي ﷺ : (من غشنا فليس منا)

## دەربارەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : (من غشنا فليس منا)



**٤ \ ٥٤٣ -** قيل لأحمد : ما معنى حديث النبي ﷺ : من غشنا فليس مِنَّا؟ فلم يجب فيه .

قيل : فإن قومًا قالوا : تفسيره : من غشنا فليس مثلنا؟

فأنكره, وقال : هذا تفسير : مسعر, وعبد الكريم بن أبي أُمية, كلام المرجئة .

قال أحمد : وبلغ عبد الرحمن بن مهدي فأنكره, وقال : ولو أن رجلًا عمل بكُلِّ حسنة, أكان يكون مثل النبي ﷺ؟

**٤ -** وترا به أحمد : مانای ئەو حەدیسەی پێغەمبەر ﷺ : (من غشنا فليس منا) چییە؟

ئیمامی أحمد وەڵامی نەدایەوە .

وترا : قەومێک دەڵێن : تەفسیرەکەی بریتیە لە : هەر کەسێک غەش لەگەڵ ئێمەدا بکات ئەوا وەک ئێمە نییە؟

ئینکاری لێکرد وە ووتی : ئەوە تەفسیری : مسعر و عبدالکریم بن أبي أمیة یە، قسەی مورجیئەکانە .

أحمد ووتی : ئەم قسەیە گەیشت بە عبد الرحمن بن مهدي ئینکاری لێکرد، وە ووتی : ئەگەر کەسێک بەهەموو کردەوە چاکەکان کار بکات ئایا دەبێتە هاوشێوەی رسول الله ﷺ؟

**٥ \ ٥٤٤** - حدثنا محمد بن جامع, قال : حدثنا عبد العزيز بن محمد, قال : حدثنا ثور بن يزيد, عن عكرمة, عن ابن عباس قال : قال رسول الله ﷺ : من رَمانا بالنَّبلِ فليسَ مِنَّا, ومن غشَّنَا فليسَ مِنَّا .

**٥** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەسێک تیری تێمان گرت لە ئێمە نییە، وە هەر کەسێک غەش و فێڵی لێمان کرد لەئێمە نییە) .

# باب : (٣)

# باب القرآن

# دەربارەی قورئان



**٦ \ ٥٤٥** - قال الخلال : قال حرب : ثنا أحمد بن حنبل, وبشار بن موسى قالا : ثنا جرير, عن منصور, عن هلال بن يساف, عن فروة بن نوفل الأشجعي قال : كنتُ جَارًا لخبَّاب، فقال : يا هناه, تقرَّب إلى الله عزوجل ما استطعتُ, فإنَّكَ لن تقرَّبَ إلى الله بشيءٍ أَحبَّ إليه من كلامه .

**٦** - فروة بن نوفل الأشجعي ووتى : دراوسێی خباب بووم، ووتی : ئەی هاورێکەم، لە الله تعالى نزيک ببەوە هەرچی لەتوانات دايە، بەڕاستی بەهيچ شتێک لە الله نزيک نابيتەوە کە خۆشەويستتر بێت لە کەلامی .

**٧ \ ٥٤٦** - قال الخلال : أخبرني حرب, قال : ثنا إسحاق بن إبراهيم, قال : ثنا أكثم بن محمد, قال : ثنا موسى بن عبيدة الرَّبذي, عن محمد بن كعب القرظي قال : كأن النَّاس لم يسمعوا القرآن إلَّا حين يستمعون مِن فِيِّ الرحمن يتلوه عليهم .

٧ - محمد بن كعب القرظي ووتی : وەک ئەوە وایە خەڵکی قورئانیان نەبیستبێ ئیللا ئەو کاتەی لە دەمی الرحمن ەوە دەیبیستن بۆیان دەخوێنێتەوە .

٨ \ ٥٤٧ - قال الخلال : أخبرني حرب بن إسماعيل الكرماني, ثنا يحيى بن عثمان, قال : ثنا ابن حمير, قال : حدثني شعيب ابن أبي الأشعث, عن هشام بن عُروة, عن أبيه, عن أبي سلمة, عن أبي هريرة, عن رسول ﷺ قال : مِراء في القُرآن كُفر .

٨ - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (موناقشە کردن لە قورئاندا کوفرە) .

٩ \ ٥٤٨ - قال الخلال : أخبرني حرب, قال : ثنا المسيب بن واضح, قال : ثنا عبد الله بن المبارك, عن حماد بن زيد، عن أيوب، عن عبد الله ابن أبي مُليكة، عن عكرمة بن أبي جهل, أنه كان يقرأ في المصحف, ويبكي, ويضعه على وجهه, ويقول : كلام ربي, كلام ربي .

٩ - لە عبدالله بن أبي مُليكة ەوە کە عکرمة بن أبي جهل قورئانی لە مصحفدا دەخوێندەوە و دەگریا، وە دەیخستە سەر ڕووخساری، وە دەیووت : کەلامی پەروەردگارم، کەلامی پەروەردگارم .

١٠ \ ٥٤٩ - قال الخلال : أخبرني حرب, ثنا أحمد بن حنبل, قال ثنا يحيى بن سعيد, عن مالك بن أنس, قال : حدثني نافع, قال : كان ابن عمر لا يقرأ القرآن إلَّا وهو طاهر .

**١٠** - نافع ووتى : إبن عمر قورئانى نەدەخوێندەوە ئیللا بە پاکى نەبێت - واتە تەنیا ئەوکاتەی دەستنوێژی هەبوایە قورئانی دەخوێند - .

**١١ \ ٥٥٠** - قال الخلال : أخبرني حرب, قال : حدثنا أحمد بن يونس, قال : ثنا ليث بن سعد, عن نافع, عن ابن عمر, أنه كان لا يقرأ القرآن إلَّا وهو طاهر .

**١١** - لە نافع ەوە کە إبن عمر قورئانى نەدەخوێندەوە ئیللا بە پاکى نەبێت .

**١٢ \ ٥٥١** - قال الخلال : أخبرني حرب بن إسماعيل, قال : ثنا أبو تقي هشام بن عبد الملك, قال : ثنا عثمان بن سعيد, قال : حدثني سلم بن سالم, عن نوح بن أبي مريم, عن أبي شيبة, عن مكحول, عن ابن عباس أنه رأى رجلًا يمحو لوحًا برجله فنهاه, وقال ابن عباس : لا تمح القرآن برجلك .

**١٢** - إبن عباس پیاوێکی بینی بەپێیەکانی تەختەی قورئانی دەسڕی، ئەویش ڕێگری لێکرد، وە إبن عباس ووتی : قورئان بەپێیەکانت مەسڕە .

**١٣ \ ٥٥٢** - قال الخلال : أخبرني حرب, قال ثنا أحمد بن سعيد, قال : ثنا إسماعيل بن أبان, قال : ثنا عثمان بن عبد الرحمن, وقال : ثنا عمر بن موسى, عن

عمرو بن شُعيب, عن أبيه, عن جدَّه, قال: نهى رسول الله ﷺ أن يُكتب القرآن في الأرض .

**١٣** - له باپیری شعیب ئەوە ووتی: رسول الله ﷺ رێگری کردووە لەوەی قورئان لەسەر زەوی بنوسرێتەوە .

**١٤ \ ٥٥٣** - قال الخلال: أخبرني حرب, قال: ثنا أبو معن الرَّقاشي, قال: ثنا أبو أحمد, قال: ثنا سُفيان الثوري, عن محمد بن الزُّبير, أن عمر بن عبد العزيز رأى رجلًا يكتب في الحائط من القرآن, فنهاه وضربه .

**١٤** - عمر بن عبدالعزیز پیاوێکی بینی لەسەر دیوار قورئانی دەنوسی، رێگری لێکرد و لێیدا .

**١٥ \ ٥٥٤** - قال: الخلال: أخبرني حرب بن إسماعيل, قال: قلت لإسحاق, يعني: ابن راهويه الصَّبي يكتب القرآن على اللوح, يمحوه بالبزاق؟

قال: يمحوه بالماء, ولا يعجبني أن يبزق عليه, وكره أن يمحوه بالبزاق .

**١٥** - حرب بن إسماعيل ووتی: بە إسحاق م ووت واتە إسحاق بن راهويه: مێردمناڵێک قورئان لەسەر تەختەیەک دەنوسێت و بە تف دەیسرێتەوە؟

ووتی : به ئاو دەیسڕێتەوە، وە پێم خۆش نییە تف بکات بەسەریدا، وە ڕێگری لێکرد لەوەی به تف بیسڕێت .

**١٦ \ ٥٥٥** - قال حرب : وَسُئلَ إسحاق مَرَّة أُخرى عن اللفظية؟

فقال : هي مُبتدعة .

**١٦** - حرب ووتی : دووباره پرسیار کرا له إسحاق : دەربارەی لەفزییەکان؟

ووتی : ئەوان بیدعەچین .

## باب : (٤)

## ماجاء في التمائم والرقية بالقرآن

## دەربارەی تەمیمە و ڕووقیە کردن بە قورئان



**١٧ \ ٥٥٦** - قال حرب : قلت لأحمد : فالقراءة في الماء للتعويذ؟

فكأنَّه سهَّل .

**١٧** - حرب ووتی : ووتم بە أحمد : قورئان خوێندن بەسەر ئاودا بۆ خۆپاراستنە؟ وەک ئەوەی ئاسانکاریی بکات - واتە ئاسانکاری بکات بۆ کردنی ئەم کارە، والله اعلم - .

**١٨ \ ٥٥٧** - حدثنا يحيى, حدثنا شريك, عن ليث, عن مُجاهد, قال : لا بأسَ أن يكتبَ القرآن في إناءٍ, ثم يُغسلُ, ويُستشفى به .

**١٨** - مجاهد ووتی : کێشە نییە ئەگەر قورئان لە قاپێکدا بنووسرێتەوە، پاشان بشۆرێت، پاشان بۆ شیفا بەکاربهێنێرێت .

**١٩ \ ٥٥٨** - قال حرب : قلت لأحمد : فتعليق التَّعاويذ, فيه القرآن, أو غيره؟

قال : كان ابن مسعود يكرهه كراهية شديدةً جدًّا .

وذكر أحمد عن عائشة وغيرها أنهم سهَّلوا في ذلك, ولم يشدد فيه أحمد .

**١٩** - حرب ووتى : به أحمد م ووت : دەكرێ هەڵواسینی تعویذات، كە قورئانی تیابێ، یان جگە لەو؟

ووتی : ابن مسعود ڕقی لێبووە بە ڕقلێبوونێكی توند .

أحمد باسی كرد كەوا عائشة و جگە لەو ئاسانكارییان كردووە لەمەدا، وە أحمدیش توندیی نەنواندووە لەو باسەدا .

**٢٠ \ ٥٥٩** - حدثنا زيد بن يزيد, قال : حدثنا عبد الرحمن بن مهدي, قال : حدثنا عبد الله بن المبارك, عن طلحة بن أبي سعيد, عن بكير بن عبدالله, عن القاسم بن محمد, عن عائشة, قالت : التَّميمة ليست مما تعلق بعد البلاء, إنَّما التَّميمة عُلِّقَ قبل البلاء لدفع المقادير .

**٢٠** - عائيشة رضي الله عنها فەرمووی : تەمیمە ئەوە نییە كە لەدوای بەڵا و تاقیكردنەوەكە هەڵبواسرێت، بەڵكو لەڕاستیدا تەمیمە بۆ ئەوەیە پێش بەڵا و تاقیكردنەوەكە هەڵبواسرێ بۆ پاڵدانی قەدەرەكان .

**٢١ \ ٥٦٠** - حدثنا سعيد بن منصور, حدثنا عيسى بن يونس, عن الأعمش, عن أبي ظبيان, قال : دخلَ حُذيفة على مريضٍ يعوده, فلمس بيده, فرآى تعويذًا على عضده, فقام غضبانًا, وقال : لو مُتّ وهذه عليك، ما صليت عليك .

**٢١** - أبي ظبيان ووتی : حذيفة چوو بۆ لای نەخۆشێک بەسەری بکاتەوە، دەستی لێدا، تعويذةيەكی بينی لەسەر قۆڵی نەخۆشەكە، حذيفةش بەتورەييەوە هەڵسا و ووتی : ئەگەر مردبايت و ئەوەت پێوە بووايە، ئەوا نوێژم لەسەر نەدەكرديت.

**٢٢ \ ٥٦١** - حدثنا سعيد, قال : حدثنا أبو عوانة, عن مغيرة, قال : قلت لإبراهيم : أعلق على عضدي هذه الآية, ﴿**قُلْنَا يَنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَمًا عَلَىٰٓ إِبْرَاهِيمَ**﴾ [**الأنبيَاء : ٦٩**] ؟

فكأنَّه كرهه .

**٢٢** - مغيرة ووتی : بە إبراهيم م ووت : ئەم ئايەتە بچەسپێنە بە قۆڵمەوە، ﴿**قُلْنَا ينَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ**﴾ [**الأنبياء : ٦٩**] .

واتە : خوای گەورە دەفەرمووێت، ئێمەش فەرمانمان دەركرد و ووتمان : ئەی ئاگر سارد و سەلامەت بە لەسەر ئيبراهيم .

وەک ئەوەی پێی باش نەبێ .

**٢٣ \ ٥٦٢ -** حدثنا سعيد, قال : حدثنا عبد العزيز بن محمد, عن علقمه بن أبي علقمة, قال : سألت سعيد بن المسيب عن القرآن تلبسه الحائض والجنب؟

قال : إذا كان في حزفرة فلا بأس .

**٢٣ -** علقمة بن أبي علقمة ووتى : پرسيارم كرد له سعيد بن مسيب دەربارەی قورئان ئایا ئافرەتێك له حەیزدابێ و پیاوێك له جەنابەتدا بێ دەتوانێت بیكاته بەرخۆیەوە؟

ووتی : ئەگەر له قاپێكدا بێت ئەوا كێشەی نییه .

**٢٤ \ ٥٦٣ -** سألت أحمد عن رُقية العقرب؟

فلم ير به بأسًا، إذا كان يعرف, أو من القرآن .

**٢٤ -** پرسیارم كرد له أحمد دەربارەی ڕوقیەی دووپشك؟

نەیبینی كێشەی تێدابێ، ئەگەر بزانێ، یان له قورئان .

## باب : (٥)

## في إثبات الصفات والرد على الجهمية

## دەربارەی جێگیرکردنی سیفات و ڕەتدانەوەی جەهمییەکان



**٢٥ \ ٥٦٤ -** قال الخلال : أخبرني حرب، قال : سمعت إسحاق بن راهويه يقول : قد صحَّ عن النبي ﷺ أنه قال : إنَّ آدمَ خُلِقَ على صُورةِ الرَّحمن .

وحدثنا إسحاق : ثنا جرير، عن الأعمش، عن حبيب بن أبي ثابت، عن عطاء، عن ابن عمر، عن رسول الله ﷺ قال : لا تُقبِحوا الوجه، فإنَّ اللهَ خَلَقَ آدمَ على صُورةِ الرَّحمن .

قال إسحاق : وإنَّما عليه أن ينطق بما صحَّ عن رسول الله أنه نطق به .

**٢٥ -** إسحاق بن راهويه دەڵێت : بە صحیحی هاتووە لە رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (الله ئادەمی درووستکرد لەسەر شێوەی الرحمن) .

رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (دەموچاو ناشرین مەکەن - یاخود مەڵێن : الله ڕووت ڕەش بکات - ، چونکە بەڕاستی الله ئادەمی درووستکرد لەسەر شێوەی الرحمن) .

ئیسحاق وتی : بەڕاستی هەر ئەوەی لەسەرە کە بیڵێت کە بە صحیحی لە رسول الله ﷺ هاتووە و فەرموویەتی .

**٢٦ \ ٥٦٥ -** قال حرب في مسائله : حدثنا يحيى بن أبي حزم، حدثنا يحيى بن محمد أبو عاصم العباداني، عن فضل بن عيسى الرَّقاشي، عن محمد بن المنكدر، عن جابر بن عبد الله قال : قال رسول الله ﷺ : بينا أهل الجنَّة في نَعيمِهم إذ سطع لهم نورٌ فرفعوا رُؤوسهم فإذا الرَّبُ عزوجل قد أشرفَ عَليهم مِن فوقِهم، فقال : السَّلامُ عليكم أهل الجنَّة، وهو قول الله عزوجل : ﴿**سَلَامٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ**﴾ [يٓس : ٥٨], فلا يَلتفتون إلى شيءٍ مما هم فيهِ مِن النَّعيم ما داموا ينظرونَ إليهِ، حتَّى يَحتجبَ عنهم، وتبقى فيهم بركته ونوره .

**٢٦ -** رسول الله ﷺ فەرمووی : (لە کاتێکدا ئەهلی بەهەشت لە نازو نیعمەتەکانیاندان ڕووناکییەک پڕشنگیان بۆ دەکات سەریان بەرزدەکەنەوە دەبینن الله عزَّوَجَل بۆیان دەرکەوتووە لە سەرەوەیان، دەفەرمووێت : السلام عليكم ئەی ئەهلی بەهەشت، ئەویش ئەو وتەیەی الله عزوجل ە کە دەفەرمووێت : ﴿**سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ**﴾ [يس : ٥٨] .

واتە : سەلام و درووودێکیشیان پێدەگات لەلایەن الله بە میهرەبانیەوە .

ئاوڕ نادەنەوە بۆ هیچ شتێک لەوانەی تێیدان لە ناز و نیعمەت مادام سەیری ئەو دەکەن، تاوەکو الله پەردەیەک دەخاتە نێوان خۆی و ئەوان، وە بەرەکەت و ڕووناکییەکەی تێیاندا دەمێنێت) .

**٢٧ \ ٥٦٦ -** روى حرب، عن إسحاق، عن آدم بن أبي إياس، عن حماد بن سلمة, عن عطاء بن السائب، عن الشعبي، عن ابن مسعود، قال : إنَّ الله ملأ العرش حتى إن للعرش أطيطًا كأطيط الرحل .

**٢٧ -** ابن مسعود فەرمووی : الله تعالى عەرشی پڕ كردووە هەتا عەرش دەنگێكی هەیە پێی دەوترێت اطيط - اطيط : دەنگێكە بەهۆی شتی قورسەوە درووست دەبێت كاتێک هەندێكی بخرێتە سەر هەندێكی تری، وە اطيط ی وشتر ناڵەیەتی بەهۆی قورسیی بارەكەیەوە - ، وەک دەنگی كاروانەكان .

**٢٨ \ ٥٦٧ -** قال الخلال : أخبرنا حرب، قال : ثنا محمد بن إدريس، قال : ثنا علي بن ميسرة، قال : ثنا علي بن الحسن ابن شقيق، قال : سمعت خارجة بن مصعب يقول : كفرت الجهمية بآيات من كتاب الله عزوجل، قال الله تبارك وتعالى : ﴿**أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا**﴾ [**الرعد** : ٣٥] وقالوا : ينقطع، وقال الله عزوجل : ﴿**وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ** (٢٢) **أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا** (٢٣)﴾ [**القِيامَة**] فقالوا : تنظر .

**٢٨ -** خارجة بن مصعب دەڵێت : جەهمییەكان كافر بوون بە چەند ئایەتێک لە كتابی الله عزوجل، الله تبارک وتعالی فەرمووی : ﴿**أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا**﴾ [**الرَّعد** : ٣٥].

واته : میوەجاتی و سێبەر و سەهەندی هەموو هەمیشەییە، دوایی نایەت و نابڕێتەوە .

وە جەهمیەکان وتیان دەپچڕێت، وە الله ﷻ دەفەرمووێت : ﴿**وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ**﴾ [**القيامة : ٢٣،٢٢**] وتیان : چاوەڕێ دەکات .

**٢٩ \ ٥٦٨ -** قال حرب : سمعتُ إسحاق يقول في حديث النبي ﷺ : مَن تقرَّب إلى الله شبرًا تقرَّبَ الله إليه باعًا .

قال : يعني : مَن تقرَّب إلى الله شبرًا بالعمل، تقرَّبَ اللهُ إليه بالثَّوابِ باعًا .

**٢٩ -** حرب ووتی : گوێم لە إسحاق بوو دەربارەی ئەو حدیثەی رسول الله ﷺ کە دەفەرمووێت : (هەر کەسێک نزیک بێتەوە لە الله بە بستێک، الله گەزێک لێی نزیک دەبێتەوە) .

ووتی : واتە هەرکەسێک بە بستێک کاروکردەوەی چاک نزیک بێتەوە لە الله، ئەوا الله بە گەزێک لە پاداشت لێی نزیک دەبێتەوە .

**٣٠ \ ٥٦٩ -** حدثني علي بن عثمان، قال : حدثنا عبد الواحد بن زياد، قال: حدثنا سليمان، قال: حدثنا أبو صالح، قال : سمعت أبا هريرة رضي الله عنه يقول : قال النبي ﷺ : قال اللهُ : أنا عِند ظنّ عبدي بي، وأنا معه حيثُ يذكرني، إن ذكرني في

نفسِهِ ذكرتُهُ في نَفسي، وإن ذَكرَني في مَلإٍ ذَكرتُهُ في مَلإٍ خير منهم، ومن تقرَّب إليَّ شِبرًا تقربتُ إليهِ ذِراعًا، ومَن تقرَّب إليَّ ذِراعًا تَقربتُ إليهِ باعًا، ومَن جاءني يَمشي، جِئته هَرولةً .

**٣٠** - پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (الله تعالى فەرموویەتی : من لەجێی گومانی بەندەکەمم، وە من لەگەڵیم هەرکاتێک یادم بکات، ئەگەر لە نەفسی خۆیدا یادم بکات، منیش لە نەفسی خۆمدا یادی دەکەم، وە ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا باسم بکات ئەوا من لە کۆمەڵێکی لەوان باشتر باسی دەکەم، وە هەر کەسێک بستێک لێم نزیک بێتەوە ئەوا من گەزێک لێی نزیک دەبمەوە، وە هەر کەسێک گەزێک لێم نزیک بێتەوە ئەوا من باڵێک لێی نزیک دەبمەوە، وە هەر یەکێک بە ڕۆیشتن بێت بۆ لام من بە هەروەڵە بەرەو لای دەڕۆم) .

**٣١ \ ٥٧٠** - قال الخلال : أخبرني حرب، حدثنا محمد بن مهدي ابن مالك، ثنا إسماعيل بن عبد الكريم، ثنا عبد الصمد بن معقل، قال : سمعت وهبًا فذكر من عظمة الله تعالى، قال : إن السَّماوات السَّبع والأرضين السَّبع والبحار لفي الهيكل، وإن الهيكل لفي الكرسي، وإنَّ قدميه على الكُرسي .

**٣١** - عبدالصمد بن معقل ووتی : گوێم لە وهب بوو باسی گەورەیی الله تعالى ی دەکرد، ووتی : حەوت ئاسمانەکە و حەوت زەوییەکە و دەریاکان لە پێکهاتەیەکی بەرز و گەورەدان - پێی دەوترێ : هیکل - ، وە ئەم پێکهاتەیەش لە کورسیدایە، وە دوو قاچەکانی الله لەسەر کورسییەکەن .

# باب : (٦)

# ماجاء في الصحابة رضي الله عنم

# ئەوەى هاتووە دەربارەى هاوەڵان رضي الله عنهم



**٣٢ \ ٥٧١** - حدثنا أبو معن، قال: حدثنا إبراهيم بن المنذر الحزامي، قال: حدثني محمد بن طلحة بن عبد الرحمن بن طلحة بن عثمان التيمي، قال: حدثني عبد الرحمن بن سالم، عن أبيه، عن جده، قال: قال رسول الله ﷺ إنَّ اللّهَ اختارني، واختارَ لي أصحابي، فجعلَ لي مِنهم وزراءَ وأنصارًا، فَمَن سَبَّهم فعليهُ لَعنةُ اللّه، والملائكةِ، والنَّاسِ أجمعين، لا يقبلُ اللّه منهم صَرفًا ولا عَدلًا .

**٣٢** - رسول الله ﷺ فەرمووى : (اللّه منى هەڵبژارد، وە هاوەڵانى بۆ هەڵبژاردم، وە لەواندا وەزير و سەرخەرى بۆم هەڵبژارد، هەر كەسێک جنێويان پێبدات، لەعنەتى اللّه و فريشتەكان و گشت خەڵكى لێبێت، اللّه نە سوننەت نە فەرزيان لێ قبوڵ ناكات) .

**٣٣ \ ٥٧٢** - قال الخلال: أخبرني حرب، قال: ثنا أحمد بن يونس، قال: ثنا زائدة، عن الأعمش، عن عمرو بن مُرَّة، عن أبي البختري، قال: قال علي رضي الله عنه: يهلكُ فِيَّ اثنان: مُحِبٌّ مُفرِط، ومبغِضٌ مُفترٍ.

**٣٣** - علي رضي الله عنه فەرمووی: دووان لە مندا تووشی لەناوچوون و هەلاکەت دەبن: خۆشەویستێکی زیادەڕەو، وە ڕقلێبوویەکی لاواز و تێکشکاو.

**٣٤ \ ٥٧٣** - قال الخلال: أخبرني حرب الكرماني، قال: ثنا موسى ابن هارون بن زياد، قال: سمعت الفريابي ورجل يسأله عمن شتم أبا بكر؟

قال: كافر.

قال: فيُصلى عليه؟

قال: لا.

وسألته: كيف يصنع به وهو يقول: لا إله إلَّا الله؟ قال: لا تمسوه بأيديكم، ارفعوه بالخشب حتَّى تواروه في حفرته.

**٣٤** - هارون بن زياد ووتی: گوێم لە الفريابي بوو پیاوێک پرسیاری لێ دەکرد دەربارەی ئەو کەسەی جنێو دەدات بە أبوبکر؟

ووتی: کافرە.

ووتم: نوێژی لەسەر دەکرێ؟

ووتی : نەخێر .

وە پرسیارم لێکرد چی لێ بکەین لە کاتێکدا ئەو دەڵێ : لا إله إلا الله؟

وتی : بەدەستتان مەیگرن، بە پارچە تەختەیەک بەرزی بکەنەوە تاوەکو شۆڕی دەکەنەوە بۆ ناو قەبرەکەی .

## باب : (٧)

# في النصيحة للسطان

# دەربارەی ئامۆژگاری کردنی سوڵتان و دەسەڵاتدار



**٣٥ \ ٥٧٤** - حدثنا شاذ بن فياض، قال: حدثنا حماد بن سلمة، عن أبي غالب، عن أبي أمامة، قال أتى رجل رسول الله ﷺ فقال: يا رسول الله أيُّ الجهاد أفضل؟

قال: أفضلُ الجهادِ: كلِمَةُ حقٍّ عِندَ سُلطانٍ جائِر.

**٣٥** - أبي أمامة ووتی: پیاوێک هات بۆ لای رسول الله ﷺ ووتی: ئەی رسول الله ﷺ باشترین جیهاد و تێکۆشان چییە؟

فەرمووی: (باشترین جیهاد: وتەی حەق و ڕاستییە لای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار).

**٣٦ \ ٥٧٥** - حدثنا أبو عمر الحوضي, عن عبيدة بن أبي رائطة, قال : أخبرني معاوية بن إسحاق, قال جاء رجل إلى ابن عباس فقال : يا أبا عباس آمر أميري بتقوى الله؟

قال : إن خِفتَ أن يقتلك فلا, فإن كنت لا بُدَّ فاعِلًا فبينك وبينه .

**٣٦** - معاوية بن إسحاق ووتى : پياوێک هاته لای ابن عباس، ووتى : ئەی ابن عباس، ئايا فرمان بكەم بە پێشەواكەم بە تەقوا و پارێزكاريكردنى الله؟

ووتى : ئەگەر ترسايت بتكوژێ نەخێر، ئەگەر هەر كرديشت، ئەوا با لەنێوان تۆ و ئەودا بێت .

## باب : (٨)

# باب في ذم الخوارج وكيف تكون معاملتهم ومعاملة اللصوص وقطاع الطريق

# دەربارەی زەمكردنی خەواریج و مامەڵەكردنیان چۆنە وە مامەڵەكردنی دز و چەتەكان



**٣٧ \ ٥٧٦** - قال الخلال : أخبرني حرب الكرماني : أن أبا عبد الله قال : الخوارج قوم سُوء، لا أعلم في الأرض قومًا شرًّا منهم .

وقال : صحَّ الحديث فيهم عن النبي ﷺ مِن عشرة وجوه .

**٣٧** - أبو عبدالله ووتی : خەواریج كۆمەڵێكی خراپن، هیچ كۆمەڵێك نابینم له زەویدا لەوان خراپتر بێ .

وە ووتی : حدیث هاتووە بە صحیح ی دەربارەیان لەلایەن رسول الله ﷺ ەوە لە دە ڕووەوە .

**٣٨ \ ٥٧٧ -** قال الخلال : أخبرني حرب الكرماني، قال : قلتُ لأحمد بن حنبل : الرجل يبيع غلامه من الخوارج .

قال : لا .

قلت : فيبيع منهم الطعام والثياب؟

قال : لا .

قلت : فإن أكرهوه؟ فكره ذلك كله .

قلت : فيشتري منهم؟

قال : لا يشتري، ولا يبيع .

**٣٨ -** خلال ووتى : حرب الكرماني هەواڵى پێدام، ووتى : بە أحمد بن حنبل م ووت : پیاوێک کەنیزەکەکەی بفرۆشێت بە خەواریجێک .

ووتى : نەخێر .

ووتى : خواردن و پۆشاک دەفرۆشێ پێیان؟

ووتى : نەخێر .

وتم : ئەی ئەگەر زۆریان لێکرد؟ ئەمانەی گشتی پێ باش نەبوو .

ووتم : ئەی دەکڕدرێت لێیان؟

ووتى : ناکڕدرێت، وە نافرۆشرێت .

**٣٩ \ ٥٧٨** - قال الخلال: أخبرني حرب بن إسماعيل أنه قال لأبي عبد الله: فإن بلدنا بلد يأتيه الخوارج في كل سنة، وإنّ النَّاس يختلفون علينا في المقام في تلك البلدة؟ فذهب إلى التسهيل في ذلك المقام.

**٣٩** - خلال ووتى: حرب بن إسماعيل هەواڵی پێدام، کە بە أبي عبدالله ی ووت: هەموو ساڵێک خەواریج دێت بۆ ناو وڵاتەکەمانەوە، خەڵکیش دەربارەی مانەوەیان لەو وڵاتە جیاوازن - واتە ئایا لەو وڵاتە بمێننەوە یان نا؟ - ؟

بۆیە ڕای درووست لای ئەوە بووە کە ئاسانکاریی بکرێ لەو مانەوەیەدا.

**٤٠ \ ٥٧٩** - قال الخلال: أخبرني حرب، قال: أنا سعيد بن منصور، قال: ثنا حماد بن زيد، عن أيوب، قال: دفع إليَّ محمد خرجًا أبيعه في فتنة ابن الأشعث، أو ابن المهلب، قال: فقلت أبيعه منهم؟

قال: أما إنه ليس بسلاح. ثم قال لي بعد: لا تبعه منهم.

**٤٠** - أيوب ووتی: محمد لە فیتنەی أشعث یان ابن المهلب دا - خرج - یێکی پێدام بیفرۆشم - خرج: وەک قاپ یان دەفر وایە لە پێستە یان موو درووست دەکرێ، لەسەر پشتی ئاژەڵ دادەنرێت و کەلوپەلی تێدا هەڵدەگیرێ -.

ووتی: ووتم: پێیان بفرۆشم؟

ووتی: ئینجا ئەمە خۆ چەک نییە، دواتر ووتی: پێیان مەفرۆشە.

**٤١ \ ٥٨٠** - قال الخلال: أخبرني حرب، قال: ثنا عبد الرحمن بن عمرو النصري، قال: سمعت سوار بن عمارة يُحدث عن أبي يحيى السري بن يحيى، قال: حدثني عبد الكريم بن رشيد، قال: لما كانت الأزارقة بفارس قال: جعل أهل الأهواز يُسيِّرون الخيل، فيحملونها إليهم.

فقال الأحنف بن قيس: ما أعلم أهل الأهواز إلَّا قد حل سباهم.

**٤١** - عبدالكريم بن رشيد ووتى: كاتێك ئەزاریقەکان - خەواریج - لە فارس بوون، وایان لە خەڵکی ئەهواز دەکرد ئەسپەکان بهێنن و بۆیان بەرن.

الأحنف بن قيس ووتى: خەڵكی ئەهوازم نەبينيوە ئيللا بە ئەسير و ديل دەكران.

**٤٢ \ ٥٨١** - قال الخلال: أخبرني حرب الكرماني، قال: سألت أبا عبد الله قلت: إن عندنا حصونًا على طرف المفازة، يرابط فيها المسلمون العدو، وهم الأكراد، وهم من أهل التوحيد، يصلون، ولكنهم يقطعون الطريق، فما ترى في الرِّباط في هذا الموضع؟

فاستحسنه.

وقال: ما أحسن هذا!

قلت: إنهم من أهل القبلة.

قال: وإن كانوا من أهل القبلة، أليس يرد عن المسلمين؟

**٤٢** - حرب الكرماني ووتى : پرسیارم كرد له أبا عبد الله ووتم : چەند قەڵایەكمان هەیە لەلای مفازە، مسوڵمانان تێدا سەنگەریان گرتووە لەگەڵ دوژمن، ئەوانیش كوردەكانن، ئەوان لە ئەهلی تەوحید و یەكخواپەرستن، ئەوان نوێژ دەكەن، بەڵام چەتەیی دەكەن و ڕێگە دەبڕن، ئایا سەنگەر گرتن لەم شوێنەدا چۆن دەبینی؟

ئەویش پێی باشبوو، ووتی : ئەمە چەند باشە! - واتە چ شتێک لەوە باشترە كە سەنگەر بگریت لەو شوێنەدا - .

ووتم : ئەوان لە ئەهلی قیبلەن .

ووتی : با لە ئەهلی قیبلەش بن، ئایا مسوڵمانان ڕەتناكاتەوە؟

**٤٣ \ ٥٨٢** - قال حرب : وسألت أحمد مرَّة أُخرى قلت : موضع رباط، يقال له : بابنيذ، في المفازة يكون فيه المطوِّعة، يبذرقون القوافل والعدوّ، وهم الأكراد، وهم مسلمون؟

فاستحبَّ ذلك، وحسَّنه، وقال : أليس يدفعون عن المسلمين؟

إلَّا أنَّه قال : ما لم يكن قتال .

قلت : إنَّهم ربما بذرقوا القوافل فوقع عليهم الأكراد .

قال : إذا أرادوهم وأموالهم قاتلوهم .

**٤٣** - حرب ووتی : جارێکی تر پرسیارم له أحمد کرد، ووتم : شوێنی سەنگەرگرتنەکە پێی دەڵێن : بابنیذ، لە مەفازە کە سەربازەکانی لێیە، ئەو کاروانانەی بەوێدا دەڕۆن دەیانپارێزین وە دوژمنانیش، وە ئەوان کوردەکانن، وە ئەوان موسڵمانن؟

ئەمەی پێ خۆش بوو، وە بەباشی زانی، وە وتی : ئایا بەرگری لەموسڵمانان ناکەن؟

ئیللا گەر بڵێت : جەنگیان لەگەڵدا ناکەین .

ووتم : لەوانەیە ئەوان کاروانەکانیان پاراستبێ و کوردەکان بەسەریاندا کەوتبن .

ووتی : ئەگەر خۆیان و ماڵ و سامانەکانیان بوێ، ئەوکات جەنگیان لەگەڵدا بکەن .

**٤٤ \ ٥٨٣** - قال الخلال : أخبرني حرب الكرماني، قال : قلت لأحمد : كنت في سفر، وأمامي رجل فوقع عليه العدوّ، فناداني واستغاث بي .

قال : ما أدري لو كان مَالَك لم يكن في قلبي شيء، فأمَّا مال غيرك فما أدري .

**٤٤** - خلال ووتی : حرب الكرماني هەواڵی پێدام ووتی : بە أحمد م ووت : من لەسەفەردام، وە پیاوێک لەپێشمەوەیە دوژمن دەدا بەسەریدا، ئەویش بانگم دەکات و هانام بۆ دێنێت .

ووتى : نازانم ئەگەر ماڵ و سامانى تۆ بوايە ئەوا هیچ شتێک لەدڵمدا نەدەبوو، ئەمما ماڵى غەیرى تۆ نازانم .

**٤٥ \ ٥٨٤ -** قال الخلال : أخبرني حرب الكرماني، قال : قيل لأحمد بن حنبل : رجل دخل دار قوم بسلاح، فقتلوه، فلم يُجبب فيه، فأخبرني زكريا بن يحيى أن أبا طالب حدثهم، قال : سئل أبو عبد الله عن لصوص دخلوا على رجل مُكابرة، يقاتلهم، أو يناشدهم؟

قال : قد دخلوا على حرمته، ما يناشدهم، يقاتلهم، يدفعهم عن نفسه، ولكن لا ينوي القتل .

قال : فيضربهم بالسَّيف؟

قال : يدفعهم عن نفسه بكُلِّما يقدر بالسَّيف وغيره، ولا ينوي قتله، قال: فإن ضربه فقتله، فليس عليه شيء .

قلت له : السُّلطان لا يُلزِمه فيه شيء؟

قال : إذا علم النَّاس، وقتله في داره ما عليه، ليس عليه شيء، إنما يقاتل دون ماله، ودون نفسه وحرمته، قال : فإن ولَّي فليدعه، ولا يَتبعه .

قلت له : فإن أخذ مالًا وذهب أتبعه؟

قال: إن أخذ مَالَك فاتبعه. قال النبي ﷺ: من قتل دون ماله، فهو أنت تطلب مالك، فإن ألقاه إليك فلا تتبعه، ولا تضربه، دعه يذهب، وإن لم يلقه إليك ثم ضربته وأنت لا تنوي قتله إنَّما تريد أن تأخذ شيئك، وتدفعه عن نفسك، فإن مات فليس عليك شيء، لأنك إنّما تقاتل دون مالك، حديث عمران بن حصين في اللصِّ. يعني: لم ير بأسًا على قاتله قد ذكره.

قال: وابن عمر قد دخل لصٌّ فخرج يعدو بالسَّيف صلتًا.

**٤٥** - وترا به أحمد بن حنبل: پیاوێک دەچێتە ماڵی کۆمەڵە خەڵکێکەوە بە چەکەوە، ئەوانیش کوشتیان، ئیمامی أحمد وڵامی نەدانەوە لەمەدا، زکریا بن یحیی هەواڵی پێدام کەوا أبا طالب بۆی گێڕانەوە، ووتی: باوکی عبد الله پرسیاری لێکرا چەند دزێک دەچنە سەر پیاوێک، ئایا شەڕ دەکات لەگەڵیان، یان بەڵێن وەردەگرێ لێیان؟

ووتی: گەر چووتە ناو سنوری ئەووەوە، بەڵێنیان لێ وەرناگیرێ و شەڕ دەکات لەگەڵیان، دووریان دەکاتەوە لەخۆی، بەڵام بەبێ ویستنی کوشتن.

ووتی: ئەی لێیان دەدات بە شمشێر؟

ووتی: دووریان دەخاتەوە لەخۆی بەپێی ئەوەی دەتوانێ، بە شمشێر و جگە لەویش، وە نیەتی نەبێ بیکوژێ، ووتی: ئەگەر لێیدا و کوشتی، ئەوا هیچی لەسەر نییە.

پێم ووت: سوڵتان هیچی لەسەرە بیکات لەوەدا؟

ووتی : ئەگەر خەڵک زانیان، وە لەماڵەکەی کوژرا ئەوا هیچ شتێکی لەسەر نییە، چونکە لەڕاستیدا شەڕی دەکرد بۆ پاراستنی ماڵەکەی، وە نەفسی خۆی و پارێزبەندیەکەی، ووتی : ئەگەر ڕۆیشتیش با وازی لێبێنێ، وە شوێنی نەکەوێت .

پێم ووت : ئەی ئەگەر پارە و ماڵی برد و ڕۆیشت، شوێنی دەکەوێت؟

ووتی : ئەگەر ماڵەکەتی برد ئەوا شوێنی بکەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (هەر کەسێک لەپێناو ماڵەکەیدا بکوژرێ)، ئەو کەسە تۆیت داوای پارە و ماڵەکەت دەکەی، ئەگەر بۆی فڕێدایتەوە ئەوا شوێنی مەکەوە، وە لێی مەدە، لێی گەڕێ بڕوات، وە ئەگەر بۆی فڕێنەدایتەوە و تۆش لێتدا و نیەتی کوشتنت نەبوو و نیەتت وایە شتەکەی خۆت بەریتەوە، وە ئەو دزەش لەخۆت دوورخەیتەوە، ئەگەر مرد ئەوا هیچت لەسەر نییە، لەبەرئەوەی لەڕاستیدا تۆ لەپێناو ماڵەکەت دەجەنگی، حدیث ی عمران بن حصین دەربارەی دز .

واتە : هیچ کێشەیەکی نەبینی لە بکوژەکەدا، کە باسی کرد .

ووتی : وە ابن عمر دزێک چووبووە ژوورەوە، ئەویش چووە دەرەوە ڕایدەکرد بە شمشێرەوە لێدەدا .

**٤٦ \ ٥٨٥ -** قال الخلال : أخبرني حرب الكرماني، قال : ثنا عباس يعني : العنبري قال : قال ابن داود : كان الحسن بن صالح إذا ذكر عثمان سكت، يعني : لم يترحَّم عليه .

وترك الحسن بن صالح الجمعة سبع سنين، فأخبرنا أبو بكر المروذي أن أبا عبد الله ذكر الحسن بن صالح فقال: كان يرى السَّيف، ولا يرضى مذهبه، وسفيان أحبُّ إلينا منه، وقد كان ابن حي ترك الجمعة بآخره، وقد كان أفتن النَّاس بسكوته وورعه.

وذكر أيضًا الحسن بن صالح يعني: مرَّة أُخرى فقال قد كان أبو فلان سمَّاه من أهل الكوفة قد خرج مع أبي السرايا، وأصحابه، وحكى أمرًا قذرًا.

قلت: كيف احتملوه؟ فسكت.

**٤٦** - إبن داود ووتی: ئەگەر باسی عثمان رضي الله عنه بکرایه ئەوا حسن بن صالح بێدەنگ دەبوو، واته: ڕەحمەتی بۆ نەدەنارد.

وە حسن بن صالح حەوت ساڵ نوێژی جومعەی وازهێنا، أبو بكر المروذي هەواڵی پێداین کە أبا عبد الله باسی حسن بن صالح ی کرد، ووتی: حسن بن صالح شمشێری هەڵدەکێشا دژی مسوڵمانان، وە بە مەزهەبەکەی ڕازی نەبوو، وە سفیان لەلامان خۆشەویسترە لەئەو، وە إبن حي لەکۆتاییەکە وازی لە جومعە هێنا، وە خەڵکی تووشی فیتنە کرد بە بێدەنگی و وەرەعەکەی.

بەهەمان شێوە باسی حسن بن صالح ی کرد، واته: جارێکی تر، ووتی: باوکی فلان، ناوی کەسێکی هێنا لە ئەهلی کوفە، لەگەڵ أبي السرايا و هاوەڵەکانی دەرچوو، وە شتێکی پیس و دزێوی باسکرد.

ووتم: ئەی چۆن بەرگەیان گرتووە؟ ئەویش بێدەنگ بوو.

# باب : (٩)

# باب في فضل السنة واتباعها

# فەزڵی سوننەت وشوێنکەوتنی



**٤٧ \ ٥٨٦** - قال حرب بن إسماعيل : حدثنا عباس بن عبد العظيم، قال : حدثنا روح، حدثنا الأوزاعي، عن يحيى بن أبي كثير، قال : السُّنة قاضية على الكتاب، وليس الكتاب بقاضٍ على السُّنة .

**٤٧** - يحيى بن أبي كثير ووتی : سوننەت دادوەرە بەسەر قورئانەوە، بەڵام قورئان دادوەر نییە بەسەر سوننەتەوە .

**٤٨ \ ٥٨٧** - قال حرب بن إسماعيل : حدثنا روح, قال : حدثنا الأوزاعي قال : قال مكحول : القرآن إلى السُّنة أحوج من السُّنة إلى القرآن .

**٤٨** - مكحول ووتی : قورئان پێویستی زیاتر بە سوننەتە وەک لەوەی سوننەت پێویستی بە قورئان بێت .

: لەم دوو ئەثەرە مەبەستی ئەوەیە کە سوننەت تەفسیری قورئان دەکات، هەروەکو ئیمامی أحمد بن حنبل رحمه الله لە کتێبی أصول السنة دا دەڵێت : والسنة تفسِّر القرآن .

واتە سوننەت ڕوونکەرەوە و شیکەرەوەی قورئانە .

**٤٩ \ ٥٨٨** - قال حرب بن إسماعيل : حدثنا محمد بن إسماعيل، حدثنا محمد بن مصعب، حدثنا الأوزاعي، عن حسَّان عطية قال : كان جبريل عليه السلام ينزل بالقرآن والسُّنة، ويعلمه إياها كمَّا يُعلمه القرآن .

**٤٩** - حسَّان بن عطية ووتی : جبريل عليه السلام قورئان و سوننەتی دادەبەزاند، وە رسول الله ی فێری سوننەت دەکرد هەروەکو چۆن فێری قورئانی دەکرد .

**٥٠ \ ٥٨٩** - قال حرب بن إسماعيل : حدثنا أبو بكر، حدثنا عبد الغفار بن الوليد، عن أبي جعفر الرَّازي، عن العلاء بن المسيب، عن أبيه قال : إنا نتبع ولا نبتدع، ونقتدي ولا نبتدئ، ولن نَضِلَّ ما تمسكنا بالآثار .

**٥٠** - العلاء بن مسيب لە باوکیەوە ووتی : ئێمە گوێڕایەڵی دەکەین و بیدعە ناکەین، وە شوێنیان دەکەوین و شتی نوێ داناهێنین، وە گومڕا نابین مادام دەستمان گرتووە بە ئاثار .

**٥١ \ ٥٩٠** - قال حرب بن إسماعيل : حدثنا أبو بكر، حدثنا الفريابي، عن سفيان، عن الأعمش, عن مالك بن الحارث, عن عبد الرحمن بن يزيد، عن ابن مسعود أنه قال : قصد في سُنَّةٍ خير من اجتهاد في بدعة .

**٥١** - إبن مسعود ووتى : پێكان له سوننهتدا چاكتره له إجتهاد كرد له بيدعهدا .

**٥٢ \ ٥٩١** - قال حرب بن إسماعيل : حدثنا أبو معن، حدثنا أبو عامر، حدثنا شعبة، عن عاصم الأحول قال : كان أبو العالية يقول لنا : تعلموا الإسلام، فإذا تعلمتم الإسلام فتعلموا القرآن، فإذا تعلمتم القرآن فتعلموا السُّنة، فإن سُنة نبيكم صراط مستقيم، وإياكم أن تحرفوا الصَّراط يمينًا وشمالًا، وإياكم وهذه الأهواء المؤذية التي تلقي بين الناس العداوة .

**٥٢** - عاصم الأحول ووتى : أبو العالية به ئێمهى دهووت : فێرى ئيسلام بن، ئهگهر فێرى ئيسلام بوون ئهوا فێرى قورئان بن، ئهگهر فێرى قورئان بوون ئهوا فێرى سوننهت بن، چونكه سوننهتى پێغهمبهرتان ڕێگايهكى ڕاست و درووستە، وه ئاگاداربن لهوهى ڕێگاتان بگۆڕن بهلاى ڕاست و چهپ، وه ئاگادارى ئهو ههواو ئارهزووه ئازاربهخشانه بن كهوا دوژمنايهتى دهخهنه نێو خهڵكييهوه .

**٥٣ \ ٥٩٢** - حدثنا أبو الأزهر، قال: حدثنا محمد بن يوسف، عن إبراهيم بن الأدهم، قال: سألت ابن شبرمة عن شيء، فأشرع الجواب.

قال: وكانت عندي مسألة شديدة، فقلت له: انظر فيها، تأنَّ.

قال: إذا وجدت الأثر، ووضع الطريق، لِمَ أحبِسُك؟!

**٥٣** - إبراهيم بن الأدهم ووتى: پرسيارم له ابن شبرمة كرد دەربارەى شتێك، ئەويش كەمێ وەستا له وەڵامدانەوەكەى.

- پاشان - ووتى: وه لەلاى من بابەتێكى زۆر قورس بوو، پێم ووت: سەيرى بكە، وريابە.

ووتى: ئەگەر ئەثەرم دۆزيەوه، وه ڕێگەكە ڕوون بوويەوه، بۆچى بەندت بكەم؟!

---

: والله أعلم واته بۆچى فكرت لەنێوان حەق و باطڵدا بەند بكەم لەكاتێكدا أثر هاتووه لەو بابەتەدا؟!

## باب : (١٠)

# باب ذم الرأي وأهله

# دەربارەی زەمکردنی بیروبۆچوون و ئەهلەکەی



**٥٤ \ ٥٩٣** - قال حرب بن إسماعيل : سُئِلَ أحمد بن حنبل عن النظر في الرَّأي؟

فكَرِهَهُ، ونهى عنه .

**٥٤** - حرب بن إسماعيل ووتی : پرسیار كرا له أحمد بن حنبل دەربارەی تێڕوانینی له بیر و بۆچوون؟ - واته ئەوانەی بەپێی بیر و بۆچوونی خۆیان قسه دەكەن - ڕقی لێبویەوە، وە ڕێگری لێكرد .

**٥٥ \ ٥٩٤** - قال حرب بن إسماعيل : قيل لأحمد بن حنبل : رجل نزلت به مسألة، فلم يجد من يسأله، أيسأل أهل الرأي؟

قال : لا يسأل أهل الرَّأي عن شيء البتَّة .

**٥٥** - حرب بن إسماعيل ووتی : بە أحمد بن حنبل وترا : پیاوێک پرسیارێک یان بابەتێک هاتووەتە لای، هیچ کەسێکی نەدۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی لێی بپرسێ، ئایە لە ئەهلی بیرو بۆچوون بپرسێ؟

ووتی : هەرگیز پرسیار ناکات لە ئەهلی بیرو بۆچوون دەربارەی هیچ شتێک .

**٥٦ \ ٥٩٥** - روى حرب، عن الشعبي قال : قال ابن مسعود رضي الله عنه : إياكم وأرأيت أرأيت، فإنَّما هلك من كان قبلكم بأرأيت أرأيت، ولا تقيسوا شيئًا بشيءٍ فتزِلَّ قَدمٌ بعد ثبوتها .

**٥٦** - ابن مسعود رضي الله عنه ووتی : وریابن لە وام پێم باشە وام پێ باشە، چونکە بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون بەهۆی وام پێم باشە وام پێ باشە، وە هیچ شتێکیش قیاس مەکەن بە شتێکی تر دواجار پێتان بخلیسکێت پاش جێگیربوونی .

---

: واتە خۆتان بەدوور بگرن لەوەی کە لەبابەت و باسەکاندا بڵێن : وام پێ باشە، وام پێ باشە، چونکە بەرەو گومڕای و بەهیلاکچوونت دەبات، والله اعلم .

## باب : (١١)

# باب في ذم الاهواء والبدع والتحذير من أهلها ومن كتبهم

# زەمكردنی ئەهلی هەواو ئارەزوو و بیدعەكان و هۆشداريى دان دەربارەی ئەهلەكەی و كتێبەكانيان



**٥٧ \ ٥٩٦** - قال حرب بن إسماعيل : حدثنا أبو معن، حدثنا محمد ابن موسى، حدثنا كثير بن هشام، حدثنا عيسى بن إبراهيم، عن عبد الغفور بن عبد العزيز، عن أبيه، عن جده، قال : قال رسول الله : لكُلِّ أُمَّةٍ آفةٌ، وآفةُ أُمَّتِي الأهواء .

**٥٧** - رسول الله ﷺ فەرمووی : (هەموو ئوممەتێک ئافاتێكی هەيە، ئافاتی ئوممەتەكەی منيش هەواو ئارەزووەكانە) .

**٥٨ \ ٥٩٧** - حدثنا أبو الربيع الزهراني، قال : حدثنا إسماعيل يعني : ابن زكريا، عن عاصم الأحول، عن محمد بن سيرين قال : لقد أتى على النَّاس زمان، وما يسأل عن

إسناد الحديث، حتى وقعت الفتنة، فسئل عن إسناد الحديث، لينظر من كان من أهل السُّنة ليأخذ حديثه، ومن كان مِن أهل البدعة ترك حديثه .

**٥٨** - محمد بن سيرين ووتى : ڕۆژگارێک هاتووه بەسەر خەڵکیدا، کە خەڵکی پرسیاریان نەدەکرد دەربارەی سەنەدی حدیث و فەرموودەکان، تاوەکو فیتنە کەوتەوە، دواتر پرسیاریان کرد لە سەنەدی حدیث، بۆ ئەوەی سەیربکەن کێ ئەهلی سوننە بێت حدیث ی لێ وەربگیرێت، وە هەر کەسێکیش ئەهلی بیدعە بووایە حدیث ەکەی وازلێدەهێنرا .

---

: ئەهلی بیدەع ئەوانەی کەوا بیدعەکەیان کوفری نەبوبێت ئەوا لێیان وەرگیراوە .

**٥٩ \ ٥٩٨** - قال حرب : قال أحمد : لا تجوز شهادة القدرية، والرَّافضة، وكُلُّ من دعا إلى بدعةٍ، ويخاصم عليها .

**٥٩** - حرب ووتی : أحمد ووتی : شایەتیدانی قەدەریی درووست نییە، وە ڕافیزە، وە هەر کەسێک بانگخوازی بکات بۆ لای بیدعەیەک، یان مشتومڕی کرد لەسەری.

**٦٠ \ ٥٩٩** - قال حرب : ثنا أبو بكر، ثنا يعلى، عن طلحة بن عمرو، قال : لا تجالسوا أهل الأهواء، فإن لهم عرة كعرة الجرب .

**٦٠** - طلحة بن عمرو ووتی : لەگەڵ ئەهلی هەواو ئارەزوو دامەنیشن، چونکە پیسییەکیان هەیە وەک پیسیی گەڕی .

**٦١ \ ٦٠٠** - قال حرب : حدثنا عبد الله بن محمد بن يحيى، حدثنا مُعاوية بن عمرو، حدثنا زائدة، حدثنا هشام، قال : كان الحسن ومحمد يقولان : لا تُجالِسوا أصحاب الأهواء، ولا تسمعوا منهم .

**٦١** - حسن و محمد دەیانووت : لەگەڵ خاوەنی هەوا و ئارەزووەکان دامەنیشن، وە لێشیانەوە مەبیستن .

**٦٢ \ ٦٠١** - قال حرب : سألت إسحاق عن لعنِ أهل البدع؟

قال : يستوجبون اللعنة .

**٦٢** - حرب ووتی : پرسیارم کرد لە إسحاق دەربارەی لەعنەت کردن لە ئەهلی بیدەع؟

ووتی : لەعنەت بۆخۆیان واجب دەکەن .

**٦٣ \ ٦٠٢** - قال حرب بن إسماعيل : سألت إسحاق بن راهويه، قلت : رجل سرق كتابًا مِن رَجُلٍ فيه رأي جهم، أو رأي القدر؟

قال : يرمي به .

قلت : إنَّه أخذ قبل أن يحرقه، أو يرمي به، هل عليه قطع؟

قال : لا قطع عليه .

قلت لإسحاق : رجل عنده كتاب فيه رأي الإرجاء، أو القدر، أو بدعة، فاستعرته منه فلمَّا صار في يدي أحرقته, أو مزقته؟

قال : ليس عليك شيء .

**٦٣** - حرب بن إسماعيل ووتی : پرسیارم کرد له إسحاق بن راهويه، ووتم : پیاوێک کتێبێکی دزی له پیاوێک که بیروبۆچوونی جەهمییەتی تێدایه، یان قەدەریی؟

ووتی : فڕێی دەدات .

ووتم : بردی پێش ئەوەی بیسووتێنێ، یان فڕێی بدات، ئایا لەسەریەتی دەستی ببڕێ؟

ووتی : دەست بڕینی تێدا نییه .

به إسحاق م ووت : پیاوێک کتێبێکی لایه بیروڕای مورجیئەی تێدایه، یان قەدەریی، یان بیدعەیەک، منیش بەقەرز لێم وەرگرت کاتێک گەیشته دەستم سووتاندم، یان دڕاندم؟

ووتی : هیچت لەسەر نییه .

**٦٤ \ ٦٠٣ -** حدثنا أحمد بن سعيد، عن سعيد بن عامر، قال : حدثنا حرب، عن خويل، قال: دخلنا على يونس بن عُبيد، قال : فجاء رجل، فقال : يا أبا عبد الله، تنهانا عن حلقة عمرو بن عُبيد وابنك قد دخل عليه قبل! قال : ابني؟! قال : نعم .

فتغيظ يونس، فبينا نحن كذلك إذ جاء ابن يونس . قال : يا بني، قد عرفت رأيي في عمرو بن عبيد، وأنت تدخل عليه؟!

قال يا أبة، إنما كنت مع فلان، فاعتذر إليه .

فقال يونس : أنهاك عن الزِنا، والسَّرقة، وشرب الخمر، والله لأن تلقى الله بهذا أحب إليَّ من أن تلقاه برأي عمرو بن عبيد، وأصحاب عمرو .

**٦٤ -** خويل ووتى : چووينه لاى يونس بن عبيد، ووتى : پياوێک هات، ووتى : ئەى باوکى عبد الله، تۆ ڕێگريمان لێدەکەى لە ئەڵقەى دانيشتنى عمرو بن عبيد و کوڕەکەى خۆتيش چووەتە ناويەوە پێشتر! ووتى : کوڕى من؟! وتى : بەڵێ، يونس زۆر تووڕە بوو، لەو کاتەدا ئێمە بەوجۆرە بووين کوڕى يونس هاتە ژوورەوە، ووتى : ئەى ڕۆڵەکەم، تۆ دەتزانى بيروڕاى من چۆنە دەربارەى عمرو بن عبيد، دەشچيتە لاى؟!

ووتى : ئەى باوکە، من لەگەڵ فلان بووم، پاشان داواى لێبووردنى کرد .

يونس ووتى : ڕێگريت لێدەکەم لە زينا و دزى و خواردنەوەى عەرەق، والله گەر بە الله بگەيتەوە بەوە - ئەو تاوانە گەورانەى باسى کرد، والله اعلم - خۆشەويستترە لام لەوەى پێى بگەيتەوە بە ڕەئى و بيروبۆچوونى عمرو بن عبيد، وە هاوەڵەکانى عمرو بن عبيد .

**٦٥ \ ٦٠٤** - قال حرب : سمعت أحمد وذكر شعيب بن سهل، قاضي بغداد فقال : أخزاه الله، وهو يرى رأي جهم .

**٦٥** - حرب ووتى : گوێم له أحمد بوو، باسی شعيب بن سهل قازی بغدادی كرد، ووتی : پەستی و تووڕەیی الله ڕیسوای بكات، بیرو بۆچوونی جەهمی هەیە .

**٦٦ \ ٦٠٥** - حدثنا أحمد بن سُليمان قال : ثنا سفيان، عن عَمرو بن دينار، قال : قال لنا طاووس : اخزوا معبدًا .

**٦٦** - عمرو بن دينار ووتی : طاووس پێی ووتین : معبد ڕیسوا بكەن .

**٦٧ \ ٦٠٦** - قال حرب : سمعت أبا عبد الله يقول : كان عبد الوارث التنوري صالحًا في الحديث، وكان رأيه رأي سوء ، يريد : كان مفتونًا بعمر و بن عُبيد .

**٦٧** - حرب ووتی : گوێم له باوكی عبد الله بوو دەیووت : عبدالوارث التنوري كەسێكی باش و چاك بوو لەحدیث دا، بیروڕای بیروڕایەكی خراپ بوو، مەبەستی ئەوەیە كە : تووشی فیتنه ببوو بە عمرو بن عبيد .

**٦٨ \ ٦٠٧ -** قال أبو محمد : وحدثني أبو معن، قال : سمعت حجاج بن المنهال، قال : كان حماد بن زيد، ويزيد بن زُريع، وبشر بن المفضل وعدة من أصحاب الحديث في جنازة، فقالوا لحماد : امض بنا نسأل عبد الوارث عما بلغنا عنه .

فقال حماد : لا أجيء .

قال : فذهب عدة من هؤلاء، فدخلوا عليه، فقالوا : يا أبا عبيد، بلغنا أنك قلت : إن عَمرو بن عُبيد أفقه من علقمة والأسود؟ قال : لو كنت قلت : إنه إفقه من صاحبهما لصدقت .

**٦٨ -** حجاج بن منهال ووتی : حماد بن زید و یزید بن زریع و بشر بن مفضل و ژمارەیەک لە هاوەڵانی حدیث لە جەنازەیەکدا، بە حمادیان ووت : با بڕۆین پرسیار بکەین لە عبدالوارث دەربارەی ئەوەی پێمان گەیشتووە دەربارەی، حماد ووتی : من نایەم .

ووتی : ژمارەیەک لەوانە ڕۆیشتن، چوونە لای، وتیان : ئەی باوکی عبید، پێمان گەیشتووە کەوا وتووتە : عمرو بن عبید فەقیهترە لە علقمة و الأسود؟

ووتی : ئەگەر بموتایە : ئەو فەقیهترە لە هاوەڵەکەی هەردووکیان ئەوە ڕاستگۆ دەبوویت .

**٦٩ \ ٦٠٨** - قال أبو معن : وسمعت النَّاس يقولون : كان عبد الوارث لا يُجَمِّع .

**٦٩** - أبو معن ووتى : گوێم لە خەڵك بوو دەڵێن : عبدالوارث ئامادە نەدەبوو لە نوێژى هەينيدا .

**٧٠ \ ٦٠٩** - قال : قال أبو معن : وحدثني من سمع عبد الصمد بن عبد الوارث يقول : أتيت هشام الدستوائي، فقال : ابن من أنت؟ قال : ابن عبد الوارث . قال : أنت مُعتزلي صغير .

**٧٠** - أبو معن ووتى : بۆى گێڕامەوە كەسێك لە عبدالصمد بن وارث ەوە گوێى لێبووە دەيووت : چوومە لاى هشامى الدستوائي، ووتى : تۆ كوڕى كێيت؟

ووتى : كوڕى عبدالوارث .

ووتى : تۆ موعتەزيلەيەكى بچووكى .

**٧١ \ ٦١٠** - قال حرب : سمعت محمد بن أبي بكر يقول : كان سفيان بن حبيب يحب المعتزلة . قال : وكان عبد الوارث أشد وأشد .

قلت : فعبد الصمد؟

قال : كان ينافق كان يُظهر لأهل السُّنَّة أنَّه منهم، ولهؤلاء أنه منهم .

**٧١** - حرب ووتى : گوێم لە محمد بن أبي بكر بوو دەيووت : سفيان بن حبيب موعتەزيلەى خۆشدەويست .

ووتى : عبدالوارث : سەختتر و سەختتر - واتە عبدالوارث زۆر بە سەختى معتزيلەى خۆشدەويست، والله اعلم - .

ووتم : ئەى عبد الصمد؟

ووتى : دووڕوويى دەكرد، بۆ ئەهلى سوننە وا خۆى دەردەخست كە لەوان بێ، وە بۆ ئەوانيش لەوانبێ .

**٧٢ \ ٦١١** - سمعت أبا معن يقول : كان عبد الوراث التنوري، وأبو على الأسوري، وعباد بن صهيب الكلبي، وبشر بن إبراهيم الأنصاري، وعبد الواحد بن زيد، وحمزة بن نجيح، وسُفيان ابن حبيب، ومهدي بن هلال، وصالح بن عمرو، وعثمان البري، وخليل بن مرة، وعمر .. كل هؤلاء يرون القدر ويتهمون، نسأل الله العافية .

**٧٢** - گوێم لە أبا معن بوو دەيووت : عبدالوراث التنوري و أبو علي الأسوري و عباد بن صهيب الكلبي، وە بشر بن إبراهيم الأنصاري و عبدالواحد بن زيد و حمزة بن نجيح، وە سفيان ابن حبيب و مهدي بن هلال و صالح بن عمرو و عثمان البري، وە خليل بن مرة، وە عمر، ئەمانە گشتيان بيروبۆچوونى قەدەريان بەڕاست دەزانى وە تۆمەتيشيان دەكرد، داواى سەلامەتى لە الله دەكەين .

**٧٣ \ ٦١٢** - حدثنا أحمد قال: حدثنا هشام بن القاسم، قال: محمد بن طلحة, عن سلمة بن كهيل، قال: وصف ذرٌّ الإرجاء، وهو أوَّل من تكلَّمَ فيه ثم قال: إني أخاف أن يُتخَذ هذا دِينًا.

فلمَّا أتته الكتب مِن الآفاقِ، قال: سمعته يقول بعد: وهل أمرٌ غير هذا.

**٧٣** - سلمة بن كهيل ووتى: ذر وەسفى إرجاء ى كرد، وە ئەو يەكەم كەس بوو قسەى تێدا كرد، پاشان ووتى: من دەترسم ئەمە بكرێتە دينێك.

كاتێك لە هەموو لايەكەوە كتێبەكەى بۆ هات، ووتى: بيستم دواى ئەوە دەيووت: ئايا شتێكى تر هەيە جگە لەوە

---

: والله أعلم واتە ئايا هيچ رێبازێكى تر هەيە راست بێ لەدواى ئەوە؟ واتە الإرجاء.

**٧٤ \ ٦١٣** - سمعت أحمد يقول: كان أبو لبيد يرى القدر، وكان صالح الحديث.

**٧٤** - گوێم لە أحمد بوو دەيووت: أبو لبيد بيروباوەڕى قەدەرييەكانى بە ڕاست دەزانى، وە حديث ەكانى چاك بوون.

**٧٥ \ ٦١٤** - حدثنا أحمد قال: حدثنا يحيى قال: حدثنا شعبة بن الحكم قال: كان يحيى بن الجزار يغلو. يعني: في التشيع.

**٧٥** - شعبة بن الحكم ووتى : يحيى بن الجزار غلو و زيادەڕەوى دەكرد، واتە : لە شيعەيى دا .

**٧٦ \ ٦١٥** - قال أبو محمد : وسمعت إسحاق يقول : كان ولد عبيد ثلاثة، كلهم مختلفون : كان محمد بن عبيد صاحب سُنَّة، وكان يعلى شيعيًّا بحتًا، وكان عمر بن عبيد أكبرهم .

**٧٦** - إسحاق دەيووت : كوڕەكانى عبيد سيان بوون، هەموويان جياوازبوون : محمد بن عبيد خاوەن سوننەت بوو، يعلى ش شيعەيەكى توند بوو، وە عمر بن عبيد گەورەكەيان بوو .

**٧٧ \ ٦١٦** - قال أبو عبد الله : إبراهيم بن طهمان صالح الحديث وأثنى عليه ولكنَّه كان يتكلَّمُ في الإرجاء .

**٧٧** - أبو عبدالله ووتى : إبراهيم بن طهمان حديث ەكانى چاك بوون، وە ستاييشى كرد، بەڵام لە إرجاء دا قسەى دەكرد - والله أعلم واتە مورجيئە بووە - .

**٧٨ \ ٦١٧** - وقال : بشير بن مهاجر، يقولون : كان مُرجئًا، ولكنه صالح الحديث.

**٧٨** - ووتی : بشیر بن مهاجر دەڵێن : مورجیئه بووه، بەڵام حدیث ی چاک بووه

.

**٧٩ \ ٦١٨** - .قال أبو محمد : وحدثنا أحمد بن سعيد الدارمي : قال : يقولون : كان حماد، وذر، وعمر بن ذر، يقولون بالإرجاء، ويغلون فيه .

وكان أبو حنيفة يقول به ويغلو .

وكان مسعر يقول به، وليس بذاك الغالي .

وكان علقمة بن مرثد، وقيس بن مسلم، وعمرو بن مرة يقولون بالإرجاء ولا يفرطون .

وكان عبد العزيز بن أبي روَّاد يقول به بمكة ويفرط . وكان سالم الأفطس يقول بالإرجاء .

وإبراهيم التيمي كان يرى الإرجاء بالكوفة .

وطلق بن حبيب بصري، كان يرى الإرجاء .

**٧٩** - أحمد بن سعيد الدارمي ووتی : دەڵێن حماد و ذر و عمر بن ذر، قسەی إرجاء دەکەن، وە غلو و زیادەڕەوی تێدا دەکەن .

وە أبو حەنیفە قسەی پێ دەکرد و زیادەڕەوی دەکرد - به إرجاء - .

وە مسعر قسەی پێ دەکرد، بەڵام زۆر ڕۆنەچووە .

وه علقمة بن مرثد و قيس بن مسلم و عمرو بن مرة قسەی إرجاء یان دەووت وه سستییان تێدا نەدەکرد .

وه عبدالعزيز بن أبي روَّاد له مەککه قسەی پێدەکرد وه زیادەڕەوی دەکرد .

وه سالم بن الأفطس قسەی دەکرد به إرجاء .

وه إبراهيم التيمي إرجاء ی پێ ڕاست بوو له کوفه .

وه طلق بن حبيب بصري، إرجاء ی به درووست دەبینی .

**٨٠ \ ٦١٩** - سئل أبو عبد الله عن علي بن زيد؟ قال : قد روى النَّاس عنه .

قلت : يا أبا عبد الله أليس كان يتشيع؟

قال : نعم، شديدًا، كان يغلي، وكذلك عمار الدهني يغلي، ويونس بن شباب كان أشدهم .

**٨٠** - باوکی عبد الله پرسیاری لێکرا دەربارەی علي بن زيد؟

ووتی : خەڵکی لێیان گێڕاوەتەوه - حديث - .

ووتم : ئەی باوکی عبد الله، ئایا شیعییەتی نەدەکرد؟

ووتی : بەڵێ، به سەختی، زیادەڕۆیی دەکرد، وه بەهەمان شێوه عمار الدهني زیادەڕەویی دەکرد، وه يونس بن شباب لەهەموویان سەر سەختتر بوو .

**٨١ \ ٦٢٠** - قال حرب: سمعت إسحاق يقول: وسمعت أبا وهب عن ابن المبارك أنه ذكر يومًا أبا حنيفة، فقال: لقد كان يتيمًا في الحديث.

**٨١** - حرب ووتى: گوێم لە إسحاق بوو دەیووت: وە گوێم لە أبا وهب بوو لە ابن مبارک ەوە کەوا ڕۆژێک باسی أبو حەنیفەی دەکرد، ووتی: لە حدیث دا هەتیو بوو.

**٨٢ \ ٦٢١** - حدثنا محمد بن يحيى، قال: ثنا أبو قدامة، قال: سمعت سلمة بن سليمان قال: قال رجل لابن المبارك: كان أبو حنيفة عالما بالحديث؟

قال: ما كان خليقًا لذلك ترك نافعًا، وروى عن أبي العطوف.

**٨٢** - سلمة بن سليمان ووتی: پیاوێک بە ابن مبارک ی ووت: أبو حەنیفە زانا بوو بە حدیث؟

ووتی: گونجاو نەبوو بۆ ئەمە، وازی لە نافع هێنا، وە لە أبي عطوف حدیث ی دەگێڕایەوە.

**٨٣ \ ٦٢٢** - قال أحمد: عمرو بن مُرَّة تكلم في الإرجاء في آخر أمره.

**٨٣** - أحمد ووتی: عمرو بن مرة لە إرجاء دا قسەی دەکرد لە کۆتایی کاروبارەکەیدا.

**٨٤ \ ٦٢٣ -** قلت لأحمد: الحسن بن صالح، كيف حديثه؟

قال: ماله! ما أحسن حديثه، ووثَّقه.

قلت: يقال إنَّه يتشيَّع؟

قال: قد كان.

**٨٤ -** به أحمد م ووت: حسن بن صالح، حديث ی چۆنه؟

ووتی: چیەتی! حدیث ەکەی چەندە باشە، وە متمانەی پێدا.

ووتم: دەوترێ ئەو شیعێتی دەکرد؟

ووتی: وابوو.

**٨٥ \ ٦٢٤ -** وسمعت أبا معن، قال: كان سفيان بن حبيب قدريًّا.

**٨٥ -** وە گوێم لە ابا معن بوو، ووتی: سفیان بن حبیب قەدەریی بوو.

**٨٦ \ ٦٢٥ -** حدثنا أبو الربيع قال: حماد بن زيد، عن أيوب، قال رآني سعيد بن جُبير مع طلق بن حبيب، فقال: ألم أرك مع طلق؟ لا تجالسنه.

وقال: ما أدركت بالبصرة رجلًا كان أبر بوالديه منه، ولا أعبد منه.

**٨٦** - أيوب ووتى : سعيد بن جبير منى بينى لەگەڵ طلق بن حبيب، ووتى : ئايا نەمبينيت لەگەڵ طلق؟ لەگەڵيدا دامەنيشن .

وە ووتى : نەگەيشتووم بە هيچ پياوێک لە بەسرە کە چاکەکارتر بێت لەگەڵ دايک و باوکى لە ئەو، وە لەويش عابد و خودا پەرستتر بێت - واتە طلق بن حبيب، والله اعلم - .

**٨٧ \ ٦٢٦** - قال حرب : قلت لأحمد بن سعيد : مالِكٌ، لِمَ ترك حديث عكرمة؟

قال : لرأيه . قلت : وما رأيه؟ قال : شبه كلام الخوراج . فأما الكذب فمعاذ الله .

**٨٧** - حرب ووتى : بە أحمد بن سعيد م ووت : ماليک، بۆچى وازيهێنا لە حديث ى عکرمة؟

ووتى : لەبەر بيروبۆچوونى .

ووتم : بيروبۆچونى چييە؟ لەشێوەى قسەى خواريج ە، ئەمما درۆش پەنا بە الله - واتە نا هەرگيز لەبەر ئەوە نييە وازى لێهێنابێ کە کەسێکى درۆزن بێ - .

**٨٨ \ ٦٢٧** - قال حرب : سألت أحمد عن عثمان أبي اليقظان؟

قال : هو عثمان بن عمير .

روى عنه شريك وسفيان، وروى أحاديث مُنكرة . وكان فيه تشيع .

**٨٨ -** حرب ووتی : پرسیارم کرد له عثمان أبي اليقظان؟

ووتی : عثمان بن عمير ه، شريك و سفيان لێيان گێڕاوەتەوە، وە چەندان حديث ی مونکەری ڕیوایەت کردووە و گێڕاویەتەوە، وە شیعییەتی تێدابوو .

**٨٩ \ ٦٢٨ -** قال حرب : سئل أحمد عن قتادة؟ فلم يصرح، ولكنه يذهب إلى أنه كان يرى القدر . قال : وعامة أصحاب الحسن وهمام وهشام كل هؤلاء يضعفون في القدر .

**٨٩ -** حرب ووتی : پرسیار له أحمد کرا دەربارەی قتادة؟ ڕوونی نەکردەوە، بەڵام بۆ ئەوە چوو کە قەدەریی پێ درووست بووە .

وتی : وە تێکڕای هاوەڵانی الحسن و همام و هشام ئەمانە گشتیان لە قەدەردا لاوازن .

**٩٠ \ ٦٢٩ -** حدثنا عباس، قال : سمعت أبا عاصم، قال : نعيت زفر بن الهذيل إلى سفيان، فقال : الحمد الله عافانا مما ابتلى ناسًا كثيرًا به .

**٩٠ -** أبا العاصم وتی : هەواڵی مردنی زفر بن الهذيل م بە سفيان گەیاند وتی : الحمدلله کەوا الله ئێمەی سەلامەت کردووە لەوەی کەوا خەڵکانێکی زۆری پێ تاقیکردۆتەوە .

## باب : (١٢)

# باب الصلاة خلف القدرية وغيرهم من أهل البدع

# دەربارەی نوێژکردن لە پشت قەدەریی وە جگە لەوان لە اهلی بیدەع



**٩١ \ ٦٣٠ -** سألت إسحاق عن الصَّلاة خلف القدرية؟

قال : لا تصلِّ خلفه عمدًا وأنت تعلم أنه قدري، فإن صلَّيت جاز ذلك، ولا إعادة عليك .

يعني : إذا لم تعلم .

**٩١ -** پرسیارم كرد لە إسحاق دەربارەی نوێژكردن لەپشت قەدەریی؟

ووتی : بە ئەنقەست نوێژ لە دواوەی مەكە ئەگەر زانیت قەدەرییە، ئەگەر نوێژیشت كرد، ئەوا درووستە، وە دووبارەكردنەوەت لەسەر نییە . واتە : ئەگەر نەتزانی .

**٩٢ \ ٦٣١** - حدثنا أحمد بن يونس، قال : سمعت رجلًا قال لسفيان الثوري : رجل يُكذب بالقدر، أُصلِّي وراءه؟

قال : لا تقدِّموه .

قال : هو إمام القرية، ليس لهم إمام غيره .

قال : لا تقدِّموه، لا تقدِّموه .

**٩٢** - أحمد بن يونس بۆی گێڕاینەوە، ووتی : گوێم لە پیاوێک بوو بە سوفیانی ثوري ووت : پیاوێک قەدەر بەدرۆ دەخاتەوە، نوێژ بکەم لەدوایەوە؟

وتی : پێشی مەخەن بۆ پێشنوێژی .

وتی : ئیمامی گوندە، هیچ ئیمامێکی تریان نییە جگە لەو .

ووتی : پێشی مەخەن، پێشی مەخەن .

**٩٣ \ ٦٣٢** - حدثنا سهل بن محمد، قال : ثنا الأصمعي، قال : حدثني عمر بن الهيثم، قال : قيل للثوري: ما تقول في رجل صلَّى خلف قدري؟

فقال : أعِدها ولو أربع سنين .

**٩٣** - عمر بن الهیثم ووتی : وترا بە سفیان ی ثوري : چی دەڵێیت دەربارەی پیاوێک لەپشت قەدەریی نوێژی کردووە؟

ووتی : دووبارەی بکەوە ئەگەرچی چوار ساڵیش بووبێت .

**٩٤ \ ٦٣٣** - حدثنا محمد بن الوزير، قال : ثنا مروان، قال : قال الأوزاعي : لا يُصلَّى خلف القدري إلَّا أن يضطر .

**٩٤** - الأوزاعي ووتی : نوێژ ناکرێ لەپشت قەدەریی ئیللا مەگەر ناچاربێ .

**٩٥ \ ٦٣٤** - حدثنا أبو حفص عمرو بن عثمان، قال : ثنا بقية، قال : سألت الزبيدي : هل يُصلَّى خلف صاحب بدعة، أو مُكذِّبٍ؟

فقال : إن كان واليًا فليس لك من الأمر شيء، وأنت في عذرٍ، وإن لم يكن واليًا فلا تصلِّ خلفه .

**٩٥** - بقية ووتی : پرسیارم کرد لە الزبيدي : ئایا نوێژ دەکرێ لەدوای خاوەن بیدعە، یان بەدرۆخەرەوەیەک - بۆ قەدەر والله أعلم - ؟

ووتی : ئەگەر سەرپەرشتیار و والی بێت، ئەوکات تۆ هیچ کارێکت بە کاری ئەوان نییە، وە تۆ لە عوزردایت، وە ئەگەر والی نەبوو، نوێژ مەکە لەدوایەوە .

**٩٦ \ ٦٣٥** - حدثنا عبدة بن عبد الرحيم، قال بقية بن الوليد : قال الأنصاري، عن أبيه، قال : سمعت واثلة بن الأسقع يقول : لو صلَّيت خلف قدري لأعدت صلاتي .

**٩٦** - واثلة بن الأسقع دەڵێت: ئەگەر لەدوای قەدەرییەوە نوێژ بکەم نوێژەکەم دووبارە دەکەمەوە.

**٩٧ \ ٦٣٦** - حدثنا أبو معن، قال: ثنا الحسن بن حبيب، ثنا نوح ابن جعونة، قال: ثنا عبد الكريم، قال: قال ابن عبَّاس: لأن أُصلِّي خلف جيفة حمارٍ أحبُّ إليَّ من أن أُصلِّي خلف قَدري.

**٩٧** - ابن عباس ووتی: ئەگەر نوێژ بکەم لەدوای لاشەی گوێدرێژێکی مردووەوە، خۆشەویستترە لەلام لە نوێژکردن لەدوای قەدەریی.

**٩٨ \ ٦٣٧** - حدثنا أبو تقي هشام بن عبد الملك، قال يحيى بن سعيد العطار، قال: ثنا عيسى بن صالح، عن حرب بن سريج، قال: قلت لمحمد بن علي: إنَّ لنا إمامًا قدريًّا، ونحن نُصلِّي خلفه؟

قال: مذ كم تُصلِّي خلفه؟

قلت: مذ ثلاث سنين.

قال: أعد صلاتك ولو صلَّيت مُذ ثلاثين سنة.

**٩٨** - حرب بن سريج ووتی: بە محمد بن علي م ووت: ئێمە ئیمامێکی قەدەریی مان هەیە، وە ئێمە نوێژ دەکەین لەدوایەوە؟

ووتی : لەکەیەوە نوێژ دەکەی لەدوایەوە؟

ووتم : ماوەی سێ ساڵە .

ووتی : نوێژەکەت دووبارە بکەوە ئەگەر بۆ ماوەی سی ساڵیش بووبێت .

**٩٩ \ ٦٣٨ -** وسمعت إسحاق يقول : من قال : أنا مؤمن فهو مرجئ . قلت : أيُصلى خلفه؟ قال : لا .

**٩٩ -** گوێم لە إسحاق بوو دەیووت : هەر کەسێک بڵێ : من ئیماندارم ئەو کەسە مورجیئەیە .

وتم : ئایا نوێژ دەکرێ لەدوایەوە؟ ووتی : نەخێر .

**١٠٠ \ ٦٣٩ -** حدثنا إبراهيم بن عبد الله الأنصاري، عن أبي عُبيد، قال : أمَّا الصَّلاة خلف القدري والخارجي والمُرجئ، فلا أحِبُّها، ولا أراها، فإن صلَّى رجل لم أُفسِد صلاته، ولم آمره بالإعادة .

**١٠٠ -** أبي عبيد ووتی : ئەمما نوێژ کردن لەپشت قەدەریی و خەواریج و مورجیئە، من پێم خۆش نییە، وە بە درووستی نابینم، ئەگەر پیاوێکیش نوێژی کرد نوێژەکەی بەبەتاڵ نازانم، وە فەرمانیشی پێ ناکەم دووبارەی بکاتەوە .

**١٠١ \ ٦٤٠ -** حدثنا أحمد بن حنبل، قال: ثنا معتمر بن سليمان، عن ليث، عن نعيم بن أبي هند، قال: قال عمر بن الخطاب رضي الله عنه: من قال: هو مؤمن فهو كافر، ومن قال: هو عالم فهو جاهل، ومن قال: هو في الجنة فهو في النار.

**١٠١ -** عمر بن الخطاب رضي الله عنه فەرمووی: هەر کەسێک بڵێت: کەوا بڕواداره، ئەوا کافره، وه هەر کەسێک بڵێ کەوا زانایه: ئەوا نەزان و جاهیله، وه هەر کەسێک بڵێ: لە بەهەشتدایه، ئەوا لە دۆزەخدایه - واتە ئەو قسانە بەخۆی بڵێت، والله اعلم -.

## باب : (١٣)

## باب في الصلاة خلف من يقدم عليا على أبي بكر وعمر رضي الله عنهما

## دەربارەی نوێژ كردن لە پشت كەسێكەوە كە علي پێش دەخات بەسەر أبوبكر و عمر الله لێیان ڕازی بێت



**١٠٢ \ ٦٤١** - قيل لأحمد بن حنبل : الصَّلاة خلف رجلٍ يُقدِّم عليًّا على أبي بكر وعمر؟

قال : لا يُصلَّى خلف هذا .

**١٠٢** - بە أحمد بن حنبل ووترا : نوێژ كردن لە پشت كەسێكەوە كە علي پێش دەخات بەسەر أبوبكر و عمردا؟

ووتی : نوێژ ناكرێ لە دواى ئەوەوە .

**١٠٣ \ ٦٤٢** - حدثنا أحمد بن يونس، قال : سمعت زائدة يقول : لو كان رافضيًّا ما صلَّيتُ وراءه .

**١٠٣** - زائدة دەڵێت : ئەگەر ڕافیزە بووایە نوێژم لە دواوە نەدەکرد .

**١٠٤ \ ٦٤٣** - حدثنا إبراهيم بن عبد الله الأنصاري، قال : حدثني أبو العباس، قال : سمعت أبا عبيد يقول : ما أُبالي صلَّيتُ خلفَ الجهمي والرَّافضي، أم صَليتُ خلفَ اليهودي والنَّصراني .

قال : وسمعت أبا عُبيد يقول : ولا يُصلَّى خلف من لا يُقدِّم أبا بكر على الخلق أجمعينَ بعد رسول الله ﷺ .

**١٠٤** - أبا عبيد دەڵێت : گوێی پێ نادەم ئەگەر نوێژ بکەم لە دوای جەهمی و ڕافیزە، یان لە دوای جولەکە و گاور .

ووتی : وە گوێم لە أبا عبيد بوو دەیووت : وە نوێژ ناکرێ لە دوای کەسێکەوە کە أبوبکر پێش نەخات بەسەر هەموو درووستکراوەکاندا لە دوای رسول الله وە ﷺ .

## باب : (١٤)

# أهل البدع أيضا

# دەربارەی ئەهلی بیدەع



**١٠٥ \ ٦٤٤** - قال حرب : قلت لأحمد : فتكره الصَّلاة خلف أهل البدع كلِّهم؟

فقال : إنهم لا يستوون .

**١٠٥** - حرب ووتی : بە أحمد م ووت : ڕقت دەبێتەوە لە نوێژ كردن لە دوای ئەهلی بیدەع گشتیان؟

ووتی : بەڕاستی ئەوان یەكسان نابن .

**١٠٦ \ ٦٤٥** - حدثنا سعيد بن منصور، ثنا عبد الله بن المبارك، عن هِشام بن حسَّان، عن الحَسَن، أنه سُئل عن صاحب البدعة الصَّلاة خلفه؟

قال : صَلِّ خلفه، وعليه بدعته صاغرًا صَدِئًا .

**١٠٦** - حسن دەگێڕێتەوە، کەوا پرسیاری لێکرا دەربارەی خاوەن بیدعە، نوێژ کردن لە دوایەوە؟ - واتە ئایە نوێژ لە دوای کەسێکی بیدعەچی دەکرێت؟ والله اعلم - .

ووتی : نوێژ بکە لە پشتیەوە، وە بیدعەکەشی لەسەر خۆیەتی بە بچووکی دابنێ .

**١٠٧ \ ٦٤٦** - حدثنا أبو أُمية محمد بن إبراهيم، قال كثير بن هشام، عن جَعفر بن برقان، قال : سألت ميمون بن مهران، فقلت : كيف ترى في الصَّلاة خلف رجلٍ يُذكر أنه من الخوارج؟

فقال : إنَّك لا تُصلِّي له، إنما تُصلِّي لله، قَدْ كُنَّا نُصلِّي خلف الحجاج وَهُوَ حروريٌّ أزرقي . فنظرت إليه، فقال : أتدري ما الحروريُّ الأزرقي؟ هو الذي إذا خالفت آيةً سمَّاك كافرًا، واستحلَّ دمك، وكان الحجَّاج كذلك .

**١٠٧** - جعفر بن برقان ووتی : پرسیارم کرد لە میمون بن مهران، ووتم : نوێژ کردن چۆن دەبینیت لە دوای کەسێکەوە کەوا باس دەکرێ لە خەواریجە؟

ووتی : تۆ نوێژ ناکەی بۆ ئەو، تۆ نوێژ دەکەیت بۆ الله، ئێمە نوێژمان دەکرد لە پشت حەجاج ەوە کە حروري أزرقي بوو، منیش سەیرم کرد، ووتی : ئایا دەزانی حروري أزرقي چیە؟ ووتی ئەوەیە ئەگەر پێچەوانەی ئایەتێکت کرد ناوت دەنێ کافر، وە خوێنت حەڵاڵ دەکات، وە حەجاج یش بەو شێوەیە بوو .

**١٠٨ \ ٦٤٧** - حدثنا أبو أمية، ثنا قبيصة، قال: ثنا سفيان، عن عقبة الأسدي، عن يزيد بن أبي سليمان، قال: كان أبو وائل يُصلِّي مع المختار، يُجمِّع معه.

**١٠٨** - يزيد بن أبي سليمان، ووتی: أبو وائل نوێژی دەکرد لەگەڵ مختار، نوێژی جومعەی لەگەڵ دەکرد.

**١٠٩ \ ٦٤٨** - وسئل إسحاق عن الصلاة خلف أصحاب الرأي؟

قال: إذا كان صالحًا فلا بأس.

**١٠٩** - وە إسحاق پرسیاری لێکرا دەربارەی نوێژ کردن لە دوای خاوەن بیر و بۆچوون و رأیەکان.

ووتی: ئەگەر صالح و چاکەکاربێ کێشەی نیە.

**١١٠ \ ٦٤٩** - حدثنا إسحاق، قال: سمعت يحيى بن آدم يقول: صلَّيت خلف محمد بن الحسن، فأعدت صلاتي من سوء صلاته.

**١١٠** - إسحاق بۆی گێڕاینەوە، ووتی: گوێم لە يحيى بن آدم بوو دەیووت: نوێژم کرد لە دوای محمد بن الحسن، نوێژەکەم دووبارە کردەوە بەهۆی خراپی نوێژەکەیەوە.

**١١١ \ ٦٥٠** - قلت لأحمد : الصلاة خلف من يجهر بـ﴿**بسم الله الرحمن الرحيم**﴾؟

قال : لا بأس إذا لم يكن صاحب بدعة .

**١١١** - به أحمد م ووت : نوێژ كردن له دواى كەسێكەوە كه به ئاشكرا و دەنگی بەرزەوە ﴿**بسم الله الرحمن الرحيم**﴾ دەكات؟

ووتی : كێشه نيه ئەگەر خاوەن بيدعه نەبێت .

## باب : (١٥)

# باب في غيبة أهل البدع

# دەربارەی غەیبەت کردنی اهلی بیدعە



**١١٢ \ ٦٥١** - قال حرب : سمعت أحمد يقول : الرجل إذا كان صاحب بدعة يظهر ذلك، أو مُعلنًا بفسقه، فليست له غيبة .

**١١٢** - حرب ووتی : گوێم لە أحمد بوو دەیووت : ئەگەر پیاوێک خاوەنی بیدعە بوو بە دیاری خست، یاخود خراپیەکەی ئاشکرا کرد، ئەوا غەیبەتی بۆ نییە - واتە گەر باسیشی بکەیت نابێتە غەیبەت - .

**١١٣ \ ٦٥٢** - سألت إسحاق عن غيبة أهل البدع؟

قال : ليست لهم حرمة .

وذكر عن ابن المبارك قال : ليس لهم غيبة، ولكن أكره أن يعوِّد الرَّجل لسانه .

وكذلك أهل الشِّرك .

وذكر عن ابن سيرين الكراهية .

**١١٣** - پرسیارم لە إسحاق کرد دەربارەی غەیبەت کردنی ئەهلی بیدەع؟

ووتی : ئەوان هیچ سنور و پارێزبەندییەکییان بۆ نییە .

وە بۆ إبن مبارک باس کرا ووتی : ئەوان غەیبەتیان بۆ نییە، بەڵکو ڕقم لێیەتی کە پیاو زمانیان ڕابێنن .

وە بەهەمان شێوە ئەهلی شیرک .

وە ئەو ڕق لێبوونەوەیە لە إبن سیرین ەوە باس کراوە .

**١١٤ \ ٦٥٣** - وسألت محمد بن بشار، قلت : الرجل يغتاب أهل البدع؟

قال : ليست لهم غيبة، ولا يعجبني، وأمَّا قولك : إن فلانًا صاحب بدعة، فليس هذه غيبة .

وكذلك قولك في الحديث : كان فلان يغلط، وفلان كان أثبت من فلان، ونحو هذا، فليس هذا غيبة، ولكنه شيء تُبيِّنُه للنَّاس .

قلت : فإن قال رجل : كان عمرو بن عُبيد رجل سوء، وكان عباد بن صُهيب رجل سوء . فكأنه رخَّص فيه .

**١١٤** - پرسیارم لە محمد بن بشَّار کرد، ووتم : پیاوێک غەیبەتی ئەهلی بیدعە دەکات؟

ووتی : بۆ ئەوان نابێتە غەیبەت، وە حەزیشم لێی نییە، بەڵام ووتەکەت کە ئەڵێی : فڵانە کەس خاوەنی بیدعەیە، ئەوا غەیبەت نییە .

وە بەهەمان شێوە ووتەکەت لە حەدیسدا هاتووە : فڵانە کەس هەڵە دەکات، وە فڵانە شت بۆ فڵان کەس جێگیر بووە، وە هاوشێوەی ئەمانە، ئەمە غەیبەت نییە، بەڵکو شتێکە بۆ خەڵکی ڕوونی دەکەیتەوە .

ووتم : ئەگەر کەسێک ووتی : عمرو بن عبيد پیاوێکی خراپە، وە عباد بن صهيب پیاوێکی خراپە .

وەک ئەوەی نەرمی نواندبێت لەوەدا .

**١١٥ \ ٦٥٤** - حدثنا يحيى بن عثمان، قال : أخبرنا بقيَّة، قال : سألت الأوزاعي قلت : من الذي ينبغي لي أن أكفَّ عنه؟

أرى الرجل يسكر، ويزني، ويعمل عملًا لا يحلّ له؟

قال : إن أسرَّها، فليس لك أن تذكرها .

وإن كان صاحبها لا يبالي من رآه، ولا يستتر، فلا غيبة له .

**١١٥** - يحيى بن عثمان بۆی گێڕاینەوە، ووتی : بقية هەواڵی پێداین ووتی : پرسیارم لە الأوزاعي کرد، ووتم : پێویستە دەستم لە کێ بگێڕمەوە؟

دەبينم پياوێک ئارەق دەخواتەوە، وە زينا دەكات، وە كردەوەيەک دەكات كە حەڵاڵ نييە بۆی؟

ووتی : ئەگەر شاردييەوە، ئەوا نابێت بۆت باسی بكەی .

وە ئەگەر خاوەنەكەی گوێی بەوە نەدەدا كێ سەيری دەكات، وە داشی نەدەپۆشی، ئەوا غەيبەتی بۆ نييە

---

: واتە كەسێک بە ئاشكرا زينا و ئارەق دەخواتەوە و خۆی ناشارێتەوە ئەوا باسی بكەيت نابێتە غەيبەت، والله اعلم .

**١١٦ \ ٦٥٥** - حدثنا أحمد بن نصر، قال : حدثنا عبدالله بن غالب، وعمر بن هارون، عن الربيع بن صبيح، عن الحسن قال : ليس لأهل البدع غيبة .

**١١٦** - الحسن ووتی : بۆ ئەهلی بيدعە غەيبەت نييە - گەر باسيشيان بكەيت - .

**١١٧ \ ٦٥٦** - حدثنا عبد الله بن عبدالوهاب، قال : حدثنا زياد بن الربيع، عن عبد الرحمن بن أذينة، قال : حدثنا أشياخنا قال : ثلاثة لا حرمة لهم ولا غيبة : الوالي الظالم الجائر، والفاسق المُعلن بفسقه، وصاحب البدعة .

**١١٧** - عبد الرحمن بن أذينة ووتی : شێخەکانمان هەواڵیان پێداین، ووتی : سێ شت سنوربەندییان نییە و غەیبەتیان بۆ نییە : والیەکی ستەمکاری خراپەکار، وە فاسقێک کە فاسقێتیەکەی ئاشکرا کردووە، وە خاوەنی بیدعە .

**١١٨ \ ٦٥٧** - حدثنا عبد الله، قال : ثنا أبو عوانة، عن قتادة، عن الحسن قال : ليس بينك وبين الفاسق حُرمة .

**١١٨** - الحسن ووتی : لە نێوان تۆ و فاسق پارێزبەندیی نییە .

**١١٩ \ ٦٥٨** - حدثنا أبو معن، قال : حدثنا معاذ بن هشام، قال : حدثني أبي، عن قتادة، عن الحسن أنه كان يقول : لا حُرمة للفاجر .

قال قتادة : فكأنه يرى إذا اغتيب المصلي الفاجر أنه لا بأس به .

**١١٩** - الحسن دەڵێت : بۆ کەسی تاوانکار پارێزبەندیی نییە .

قتادة ووتی : وەک ئەوەی کە ئەگەر کەسێکی نوێژ کەری خراپەکار غەیبەت بکرێت ئەوا هیچ کێشەی نییە .

**١٢٠ \ ٦٥٩** - حدثنا محمد بن رافع، قال : ثنا الجارود بن يزيد، قال : حدثنا بهز بن حكيم، عن أبيه، عن جده، قال : قال رسول الله ﷺ : أترعوون عن ذكر الفاجر؟ متى يعرفه النَّاس؟ اذكروه بما فيه يحذره النَّاس .

**١٢٠** - رسول الله ﷺ فەرموویەتی : (شەرمەزار دەبن لە باس کردنی خراپەکار؟ کەی خەڵک بیناسن؟ باسی بکەن لەگەڵ ئەو شتانەی تێیدایە بۆ ئەوەی خەڵک ئاگاداری بن) .

**١٢١ \ ٦٦٠** - سألت إسحاق : عن غيبة السُّلطان الجائر؟

قال : لا تكون فيهم، إلَّا ما يكره للإنسان أن يعود لسانه .

**١٢١** - پرسیارم لە إسحاق کرد : دەربارەی غەیبەتی کردنی دەسەڵاتدارێکی خراپەکار؟

ووتی : تێیاندا نابێت - واتە غەیبەتکردنیان - ، ئیللا ئەوە نەبێ کەوا مەکروهە مرۆڤ زمانی خۆی ڕابێنێ لەسەری .

**١٢٢ \ ٦٦١** - حدثنا الأخضر، قال : حدثنا عارم، قال : حدثنا وهيب بن خالد، قال : سمعت عبيدالله يقول في غيبة الخوارج والسُّلطان الذي قد أعلن : لم ير لهم غيبة، فأما من يعلم أنه مذنب، وهو يحب أن يستتر، رأى ذلك منهم غيبة .

**١٢٢** - وهيب بن خالد ووتی : گوێم له عبیدالله بوو دەربارەی غەیبەت کردنی خەواریج و دەسەڵاتدار کە ئاشکرایان کردووە - خراپەکانیان - دەیووت : وای نەدەبینی باس کردنیان ببێتە غەیبەت، ئەمما ئەوەی دەزانێت کەوا تاوانبارە، وە حەزدەکات دایبپۆشێت، ئەوا گەر باسی بکەیت لەوەدا دەبێتە غەیبەت .

**١٢٣ \ ٦٦٢** - سألت إسحاق عن غيبة أهل الشرك؟

قال : ليس أكرهه، ولكن أكره أن يعود لسانه .

**١٢٣** - پرسیارم لە إسحاق کرد دەربارەی غەیبەت کردنی ئەهلی شیرک؟

ووتی : ڕقم لێی نابێتەوە، بەڵکو ڕقم ئەبێتەوە لەوەی زمانی خۆی ڕابێنێ - لەسەر غەیبەتکردنیان - .

**١٢٤ \ ٦٦٣** - حدثنا أبو معن قال : حدثنا معاذ بن هشام، قال : حدثني أبي، عن قتادة، عن محمد بن سيرين : أنه كان يكره أن يغتاب النصراني .

**١٢٤** - محمد بن سيرين ڕقی لەوە دەبوویەوە کە غەیبەتی نصرانی بکرێت .

## باب : (١٦)

## باب مناكحة الفساق وأهل الأهواء

## دەربارەی هاوسەرگیری کردن لەگەڵ کەسی فاسق و ئەهلی هەواو ئارەزوو



**١٢٥ \ ٦٦٤ -** قال حرب : وسئل أحمد عن مُناكحة الفاسق والذي يشرب المسكر، وأصحاب الأهواء، فكره ذلك شديدًا، وسمعته يقول : إذا كان يتكلَّم بهذا الكلام الذي هو كُفر، فإنه لا ينكح .

**١٢٥ -** حرب ووتی : پرسیار کرا لە أحمد دەربارەی هاوسەرگیری کردن لەگەڵ کەسی فاسق ەوە ئەو کەسەی ئارەق دەخواتەوە، وە خاوەنی هەواو ئارەزووەکان، زۆر بەتوندی ڕقی لەمە دەبوویەوە، وە گوێم لێی بوو دەیووت : ئەگەر قسەی دەکرد بەو قسانەی کە کوفرن، ئەوکات کچی لێ مارە ناکرێت .

**١٢٦ \ ٦٦٥** - حدثنا أحمد بن العباس الأهوازي، قال : أخبرني عبد الله بن أبي الأسود، قال : سمعت عبد الرحمن بن مهدي يقول : لو خطب إليَّ رجلٌ من الجهمية أَمَةً لم أزوِّجه .

**١٢٦** - عبد الله بن أبي الأسود ووتی : گوێم له عبد الرحمن بن المهدي بوو دەیووت : ئەگەر پیاوێک له جەهمییەکان بەندەیەکم لێ مارە بکات ئەوا هاوسەرگیری لەگەڵدا ناکەم .

**١٢٧ \ ٦٦٦** - قلت لأبي بكر محمد بن بشار : أزوِّج القدرية، وأتزوج إليهم؟ قال : معاذ الله .

**١٢٧** - ووتم بە أبي بكر محمد بن بشار : قەدەریی بدەم بە شوو وە لێیان بخوازم؟ ووتی : پەنا بە الله .

**١٢٨ \ ٦٦٧** - حدثنا علي بن عثمان، قال: حدثنا عون، عن موسى قال : كان معاوية بن قُرَّة ينهانا أن نمشي من الخاطب إذا لم يكن مرضيًّا .

**١٢٨** - موسى ووتی : معاوية بن قرَّة ڕێگریی لێ دەکردین لەگەڵ خوازبێنیکاردا بڕۆین ئەگەر جێی ڕەزامەندیی نەبوو .

## باب : (١٧)

## باب في من سب الله تعالى أو نبيه ﷺ

## دەربارەی کەسێك جنێو دەدات بە الله تعالى يان پێغەمبەرەكەی ﷺ



**١٢٩ \ ٦٦٨** - روى حرب في مسائله عن ليث بن أبي سليم، عن مجاهد، قال: أتي عمر برجل سبَّ النبي ﷺ فقتله، ثم قال عمر : من سبَّ الله، أو سبَّ أحد من الأنبياء، فاقتلوه .

قال ليث : وحدثني مجاهد، عن ابن عباس، قال : أيما مسلم سب الله، أو سب أحدًا من الأنبياء، فقد كذّب رسول الله ﷺ, وهي رِدَّة يستتاب، فإن رجع وإلَّا قتل، وأيما معاهد عاند فسبَّ الله، أو أحدًا من الأنبياء، أو جهر به، فقد نقض العهد فاقتلوه .

**١٢٩** - دەگێڕنەوە لە مجاهد : پیاوێک هێنرا بۆ لای عمر رضي الله عنه جنێوی دابوو بە رسول الله ﷺ عمریش کوشتی، پاشان عمر رضي الله عنه فەرمووی : هەرکەسێک جنێویدا بە الله، یان یەکێک لە پێغەمبەران بیکوژن .

ليث وتى : وه مجاهد بۆى گێڕامەوە، لە إبن عباس ەوە کە وتویەتی : هەر مسوڵمانێک جنێو بە الله بدات، یان جنێو بە یەکێک لە پێغەمبەران بدات، ئەوا پێغەمبەری ﷺ بەدرۆ خستۆتەوە، کە ئەمەش هەڵگەڕانەوەیەکە - لە دین - کە داوای تەوبەی لێدەکرێت، ئەگەر گەڕایەوە ئەگینا دەکوژرێت، وە هەرکەسێکی معاهد - ئەو مشرک و هاوەڵبڕیاردەرانەن کە لە وڵاتی خۆیان نیشتەجێن بەڵام عهد و بەڵێنیان لێ وەرگیراوە کەوا جەنگ نەکەن بەرامبەر مسوڵمانان و مسوڵمانانیش جەنگ نەکەن بەرامبەریان - پێچەوانەی ئەمە بکات و جنێو بە الله بدات، یان جنێو بە یەکێک لە پێغەمبەران بدات، یاخود بەمە دیار بوو - واتە بەوەوە دیار بوو لەناو خەڵک کە جنێو بە الله و پێغەمبەران دەدات، والله اعلم -، ئەوا بەڵێنەکەی هەڵوەشاندووەتەوە بیکوژن .

**١٣٠ \ ٦٦٩** - وعن خليد : أن رجلًا سبَّ عمر بن عبد العزيز، فكتب عمر : إنَّه لا يُقتل إلَّا من سبَّ رسول الله ﷺ، ولكن اجلده على رأسه أسواطًا، ولولا أني أعلم أن ذلك خيرٌ له لم أفعل .

**١٣٠** - خليد دەگێڕێتەوە : کەوا پیاوێک جنێویدا بە عمر بن عبدالعزیز، عمریش نووسی : بەڕاستی ناکوژرێ ئیللا کەسێک جنێو بدات بە رسول الله ﷺ، بەڵام چەند جڵدێک بە قامچی دەدەم لە سەری، وە ئەگەر بزانم ئەوە باشترە بۆی نەمدەکرد .

## باب : (١٨)

## هل للمشرك من ولاية

## دەربارەی ئایە کەسی مشرك ویلایەتی بۆ هەیە [ولایة : لێرە بە مانای ئەو کەسە دێت کە حەقی بەسەر کچەوە هەیە کە بەشووی بدات، والله أعلم]



**١٣١ \ ٦٧٠** - قال حرب : قلت لأحمد : امرأة أبوها نصراني وأخوها مسلم، من يزوِّجها؟

قال: الأخ .

قلت : فهل للمشرك من الولاية شيء؟

قال : لا، بتة .

**١٣١** - حرب ووتی : بە أحمد م ووت : ئافرەتێك باوکی نەسڕانیە و براکەشی مسوڵمانە، کێ بەشووی دەدات؟

ووتی : براکەی .

ووتم : ئایا موشریك و هاوەڵ بڕیاردەر بۆ الله هیچ شتێكی بۆ هەیە لە ویلایەتدا؟

ووتی : نەخێر، هەرگیز .

**١٣٢ \ ٦٧١ -** قال حرب : وسألت إسحاق قلت : رجل مجوسي له بنت مسلمة، هل يزوِّجها الأب؟

قال : لا يزوِّجها الأب، ولكن يزوِّجها بعض قرابتها المسلمين، بنو العم وغيرهم .

**١٣٢ -** حرب ووتی : وە پرسیارم كرد لە إسحاق، ووتم : پیاوێكی مەجووسی و ئاگرپەرست كچێكی مسوڵمانی هەیە، ئایا باوكەكە بەشووی دەدات؟

ووتی : باوكەكە بەشووی نادات، بەڵكو خزمەكانی بەشووی دەدەن، كوڕی مام و جگە لەوان .

**١٣٣ \ ٦٧٢ -** حدثنا أبو هشام، ثنا حسان بن إبراهيم، قال : قال سفيان في رجل مشرك زوج بنته وهي صغيرة برضى منها، وأبي أولياؤها من أن يجيزوا النكاح؟

قال : إذا زوجها أبوها، وقد بلغت برضى منها كفوًا، كان النكاح جائزًا، ولم يكن لأوليائها أن يردوا ذلك، وإن زوجها وهي صغيرة جاز ذلك .

**١٣٣** - حسان بن إبراهيم ووتی : سفیان ووتی دەربارەی پیاوێکی موشریک کە کچەکەی بەشوو داوە و بچووکە و بەڕازی بوونی کچەکە خۆی، وە وەلی امرەکانیشی نکۆلییان کردووە لە جائیز بوونی هاوسەرگیرییەکە؟

ووتی : ئەگەر باوکی بەشووی دابێت، وە کچەکە باڵغ بووبێت بە ڕازی بوونی خۆشی و هاوتای خۆی بێت، ئەوا هاوسەرگیرییەکە جائیزە، وە اولیائەکانی - واتە کەسە نزیکەکانی - بۆیان نیە ئەمە ڕەتبکەنەوە، وە ئەگەر بچووکیش بووبێت و بەشووی دابێت جائیزە .

**١٣٤ \ ٦٧٣** - حدثنا محمد، ثنا حسان، قال: قال سفيان في مشرك زوج بنته وهي مسلمة برضا منها، وأبي أولياؤها من المسلمين أن يجيزوا النكاح .

قال : إذا زوجها أبوها، وقد بلغت برضا منها كفوًا، كان النكاح جائزًا، ولم يكن للأولياء أن يردوا ذلك .

**١٣٤** - حسان ووتی : سفیان ووتی دەربارەی موشریکێک کچەکەی بەشوو داوە کە مسوڵمانە و بەڕازیبوونی خۆی، وە وەلی امرەکان لە مسوڵمانان نکۆڵییان کردووە لەوەی جائیز بێت ئەو هاوسەرگیرییە .

ووتی : ئەگەر باوکی بەشووی دابێت، وە کچەکە باڵغ بووبێت بەڕازی بوونی خۆشی و هاوتای خۆشی بێت، ئەوا هاوسەرگیرییەکە جائیزە، وە اولیائەکانی بۆیان نییە ئەمە ڕەتبکەنەوە .

**١٣٥ \ ٦٧٤** - حدثنا أبو معن، قال: ثنا أبو بكر الحنفي، قال: حدثنا سعيد، عن قتادة، قال: المسلم أحقُّ، ونكاحه أجوز، وإن كان النصراني زوجها قبله .

**١٣٥** - قتادة ووتی : مسوڵمان شایستەترە، وە هاوسەرگیرییەکەشی جائیزترە، ئەگەرچی پێشتر نەسرانیش بەشووی دابێت .

**١٣٦ \ ٦٧٥** - سألت إسحاق: عن مشرك أراد أن يزوج ابنته، فجلس رجل مسلم، فخطب لهم زوج؟

قال: لا ينبغي أن يعانوا على شهادة، ولا على شيء .

**١٣٦** - پرسیارم کرد لە إسحاق دەربارەی مشرکێک ویستی کچەکەی بەشوو بدات، پیاوێکی مسوڵمانیش دانیشت، قسەی بۆ کردن - واتە دەربارەی شایەت قسەی بۆ کردوون - ؟

ووتی: پێویست ناکات یارمەتیان بدەیت لەسەر شایەت، وە نە لەسەر هیچ شتێک .

## باب : (١٩)

# طلاق أهل الشرك

# تەڵاقدانی أهلی شیرك و هاوەڵ بڕیاردان



**١٣٧ \ ٦٧٦** - سألت إسحاق عن طلاق أهل الشرك؟

فقال : جائز .

**١٣٧** - پرسیارم کرد لە إسحاق دەربارەی تەڵاقدانی ئەهلی شیرک؟

ووتی : جائیزە .

**١٣٨ \ ٦٧٧** - حدثنا المسيب بن واضح، قال : ثنا ابن مبارك، عن سعيد، عن الحكم وحماد في المشرك يطلق امرأته في شركه؟

قال : جائز .

**١٣٨** - ابن مبارک دەگێڕێتەوە لە سعید، لە حکم و حمادەوە دەربارەی مشریک خێزانەکەی تەڵاق دەدا لە شرکیدا؟

ووتی : جائیزه - واته لەبەر ئەوەی مشریکە تەڵاقیدا، واللە اعلم - .

## باب : (٢٠)

# باب في أطفال المشركين

# دەربارەی منداڵی موشریكان



**١٣٩ \ ٦٧٨** - سألت إسحاق عن أطفال الكافرين؟

فقال : خلِّ أمرهم إلى الله، الله أعلم بما كانوا عاملين .

قال : وأطفال المسلمين هم في الجنَّةِ .

قال إسحاق : ولا يشهد أحدكم لصبي يموت : إني أشهد أن هذا في الجنَّة .

قال : وسئل ابن عباس عن الولدان : أفي الجنَّة هُم؟

قال : حسبك ما اختصم فيه موسى والخضر .

**١٣٩** - پرسیارم كرد له إسحاق دەربارەی منداڵی كافران؟

ووتی : كاروباریان لێگەڕێ بۆ الله، الله زاناترە بەوەی دەیانكرد .

ووتی : وە منداڵی مسوڵمانان لە بەهەشتن .

إسحاق ووتی : وه هیچ كەسێكتان با شايەتی نەدات لەسەر منداڵێک كە دەمرێ و بڵێ : من شايەتی دەدەم كە ئەوه لە بەهەشتە .

ووتی : وه پرسيارکرا لە إبن عبَّاس دەربارەی منداڵان، ئايا ئەوان لە بەهەشتن؟

ووتی : ئەوەندەت بەسبێ كە موسى و خضر ناكۆک بوون تێيدا .

**١٤٠ \ ٦٧٩ -** حدثنا إسحاق، قال : أخبرنا بقيَّة بن الوليد، قال : حدثني محمد بن زياد، قال : حدثني عبد الله بن أبي قيس، قال : حدثتني عائشة زوج النبي ﷺ وسألتها عن ذراري المشركين والمؤمنين فقالت : سألت رسول الله ﷺ عنهم؟

فقال : مع آبائهم .

قالت : قلت : يا رسول الله، بلا عملٍ؟

قال : الله أعلم بما كانوا عامِلين .

**١٤٠ -** عبد الله بن أبي قيس ووتی : عائشة رضي الله عنها خێزانی رسول الله ﷺ بۆی گێڕامەوه و من پرسيارم لێكرد دەربارەی نەوەكانی مشریكان و بڕواداران، ووتی : پرسيارم كردووه لە رسول الله ﷺ دەربارەيان؟

ئەويش فەرمووی : (لەگەڵ باوانييانن) .

ووتی : ووتم ئەی رسول الله بەبێ كردەوه؟

فەرمووی : (اللّٰه زاناترە بەوەی ئەوان دەیانکرد) .

**١٤١ \ ٦٨٠** - حدثني إسحاق، قال : أخبرنا جرير، قال : حدثنا العلاء ابن المسيّب، عن الفضيل بن عَمرو الفقيمي، عن عائشة بنت طلحة، عن عائشة أم المؤمنين قالت : توفى صبيٌّ من الأنصار، فقلت : طوبى له، عُصفورٌ من عَصَافِيرِ الجنَّةِ .

فقال رسول الله ﷺ : يا عائشةُ، أَوَلَا تدرِينَ أنَّ اللهَ خَلَقَ الجنَّةَ وخَلَقَ النَّارَ، فخَلَقَ للجَنَّةِ أهلًا، وخَلَقَ للنَّارِ أهلًا .

**١٤١** - عائشەی دایکی بڕواداران رضي الله عنها فەرمووی : منداڵێک لە ئەنصار مرد، منیش ووتم : خۆشبەختی بۆ ئەو، باڵندەیەکە لە باڵندەکانی بەهەشت .

رسول اللّٰه ش ﷺ فەرمووی : (ئەی عائیشە، ئایا نازانی اللّٰه بەهەشتی درووست کردووە وە جەهەننەمی درووست کردووە، بۆ بەهەشت خەڵکانێکی درووست کردووە، وە بۆ جەهەننەمیش خەڵکانێکی درووست کردووە) .

## باب : (٢١)

## باب في وسوسة القلوب

## دەربارەی وەسوەسەی دڵەکان



**١٤٢ \ ٦٨١** - سمعت إسحاق يقول في حديث النبي ﷺ وأصحابه والتابعين في الوسوسة : إنَّه محضُ الإيمان، أو صريح الإيمان .

قال إسحاق : إذا نفي الوسوسة عن نفسه، فنفيه محض الإيمان، ليس الوسوسة محض الإيمان، ولكن نفيه، فأما الوسوسة إذا وقع في القلب فلم ينفه فهو الهلاك .

قال : وأمَّا ما رُوي عن أصحاب النبي ﷺ : أنهم كانوا إذا فقدوا الوسوسة عدّوه نقصًا، فليس أن يكونوا عدوّا فقد الوسوسة نقصًا، ولكن كانوا إذا أصابهم ذلك نفوها عن أنفسهم، فإذا لم يصبهم ذلك عدوه نقصًا، لأن نفي ذلك عندهم فضيلة . أو كما قال .

**١٤٢** - گوێم لە إسحاق بوو دەیووت دەربارەی قسە کردنی رسول الله ﷺ و هاوەڵان و تابعین دەربارەی وەسوەسە : (ئەوە ئیمان و باوەڕی پوخت و پاکە یاخود ئیمانی ڕوونە) .

إسحاق ووتی : ئەگەر وەسوەسەکەی لە خۆی نەفی کرد - واتە نەیهێشت کاری تێبکات - ، ئەو نەفی کردنەی ئیمانی پاکە، وەسوەسە ئیمانی پوخت و پاک نیە، بەڵکو نەفی کردنەکەی، ئەمما وەسوەسە ئەگەر بکەوێتە دڵەوە و نەفی نەکرد ئەوە بەهیلاک چوونە .

ووتی : وە ئەمما ئەوەی لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ گێڕدراوەتەوە : بەڕاستی ئەوان کاتێک وەسوەسەیان بەدی کردبا ئەوا بە نەقس و کەموکوڕی هەژماریان دەکرد، ئەوە نەبێت کە نەمانی وەسوەسەکە بە کەموکورتی هەژمار کرابێ، بەڵکو کاتێک تووشی دەبوون نەفییان نەکرد لە خۆیان، وە کاتێک تووشیان نەدەبوو بە نەقسیان هەژمار دەکرد، لەبەر ئەوەی نەفی کردنی ئەوە لە لای ئەوان فەزیلەت و گەورەییە، یان وەک ئەوەی ووتی .

**١٤٣ \ ٦٨٢** - حدثنا أبو سهل بشر بن معاذ، قال : حدثنا يوسف ابن عطية، قال : حدثنا ثابت البناني، عن أنس بن مالك، أن بعض أصحاب النبي ﷺ شكوا إليه ما يجدون من هذا الوسواس في صدورهم، قال : فقال النبي ﷺ : الله أكبر، الله أكبر، ذاك محضُ الإيمان .

**١٤٣** - أنس بن مالك دەگێڕێتەوە، كە هەندێك لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ شەكوای ئەوەیان كرد لای رسول الله ﷺ كە بەدییان دەكرد لەو وەسوەسەیە لە سینگیاندا، ووتی : پێغەمبەریش فەرمووی : (الله أكبر، الله أكبر، ئەوە ئیمانی پاك و پوختە) .

**١٤٤ \ ٦٨٣** - قال أبو سهل : قلت للعتبي : إن عبد الرحمن وأثنى عليه خيرًا ما عنى بقوله : ذاك محض الإيمان؟

فقال : عنى به : الخوف الذي شكوه إلى النبي ﷺ الذي وجدوه في صدورهم، ذاك محض الإيمان .

**١٤٤** - أبو سهل ووتی : بە العتبي م ووت : عبد الرحمن زۆریش ستایشی كرد بە چاكە، مەبەستی چی بوو لەو قسەیەی : ئەمە ئیمانی پوخت و پاكە؟

ووتی : مەبەستی لەو قسەیە ئەوەیە كە : ئەو ترسەی كە شەكوایان كرد بۆ لای رسول الله ﷺ كە لە دڵیاندا بەدییان دەكرد، ئەمە ئیمانی پوخت و پاڵفتەیە .

# باب : (٢٢)

# الجامع



**١٤٥ \ ٦٨٤** - أخبرني حرب بن إسماعيل بن خلف الحنظلي أبو محمد الكرماني قال : سمعت أحمد يقول : في حديث أنس أن رجلًا قال للنبي ﷺ : يا خير البرية . قال : ذاك أبي إبراهيم .

قال: قد روي غير هذا أنه قال : أنا أول من تنشق عنه الأرض .

وقال الله عزوجل : ﴿**كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ**﴾ [**آل عمران : ١١٠**], وذهب فيه إلى أن النبي إنّما أراد التواضع به .

**١٤٥-** گوێم له أحمد بوو دەیووت : له حديث ی أنس کەوا پیاوێک ووتی به رسول الله ﷺ : ئەی باشترینی درووستکراوەکان .

ئەویش فەرمووی : (ئەوە باوکمە إبراهيم) .

ووتی : جگە لەوە گێڕدراوەتەوە، کەوا فەرموویەتی : (من یەکەم کەسم کەوا زەوی شەق دەکرێت بۆی - واتە یەکەم کەسە زیندوو دەکرێتەوە والله أعلم - .

وه الله دهفهرموویّت : ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ [آل عمران : ١١٠]، واته : ئێوه بهڕاستی چاكترین ئوممهتێكن كه - بۆ سوودی - خهڵكی هێنراونهته سهر ئهم زهویهوه .

وه تیایدا ڕای بۆ ئهوه چووه كهوا رسول الله ویستوویهتی تهوازع و خۆ بهكهمزانی نیشان بدات پێی .

**١٤٦ \ ٦٨٥** - روى حرب, عن عبد الرحمن بن غنم، قال : كتب لعمر بن الخطاب حين صالح نصارى أهل الشام : هذا كتاب لعبد الله أمير المؤمنين من مدينة كذا و كذا, إنكم لما قدمتم علينا سألناكم الأمان لأنفسنا و ذرارينا وأموالنا على أن لا نحدث, وذكر الشروط إلى أن قال : ولا نظهر شركًا, ولا ندعوا إليه أحدًا, وقال في آخره : شرطنا ذلك على أنفسنا, وأهلينا, وقبلنا عليه الأمان, فإن نحن خالفنا عن شيء شرطناه لكم وضمناه على أنفسنا فلا ذِمَّة لنا, وقد حلَّ لكم منَّا ما حلَّ من أهل المعاندة والشِّقاق .

**١٤٦** - حرب دهگێڕێتهوه، له عبد الرحمن بن غنم، ووتی : كاتێك گاورهكان صوڵحیان كرد خهڵكی شام بۆ عمر بن الخطاب یان نووسی : ئهم نووسینه بۆ بهندهی الله ئهمیری بڕواداران عمر بن الخطاب ه له شاری فڵان و فڵان، ئێوه كاتێك هاتنه سهرمان ئێمه داوای سهلامهتییمان لێ كردن بۆ خۆمان و وهچهكانمان و ماڵ و سامانمان لهسهر ئهوهی كه قسه نهكهین، باسی مهرجهكانی كرد تاوهكو ووتی : هیچ شیركێك به دیار ناخهین، وه بانگهوازیی هیچ كهسێك ناكهین بۆ لای ئهو شیركه، له كۆتاییهكهی ووتی : ئهوهمان لهسهر خۆمان وهكو مهرج دانا، وه

لەسەر ئەهلەکەشمان، وە لەسەر ئەوە سەلامەتیمان قبوڵ کرد، جا ئەگەر ئێمە شتێکمان کرد پێچەوانەی ئەوەی کە بە مەرج دامانناوە و گرەنتیمان کردووە لەسەر خۆمان ئەوا ئەو کات هیچ پاراستنمان بۆ نییە - ذمة - ، وە ئەو کات ئەوەتان بۆ حەڵاڵە لێمان کە بۆتان حەڵاڵە لە ئەهلی دوژمنداری و دژایەتی و جیابوونەوە .

---

: والله اعلم، واتە ئەگەر مووخالەفەی ئەو مەرجانەمان کرد لەسەر خۆمان دانرابوو بۆ ئەوەی بپارێزرێین، ئەوا ئەو کات پاراستنمان بۆ نییە و ئەوەی لە دوژمن و دژایەتیکارەکان بۆتان حەڵاڵە لە ئێمەش بۆتان حەڵاڵە .

**١٤٧ \ ٦٨٦** - قال حرب بن إسماعيل الكرماني : قلت لإسحاق يعني : ابن راهويه ما معنى قوله : لا يكون أحدكم إمعة؟

قال : يقول : إن ضلَّ النَّاسُ ضللت, وإن اهتدوا اهتديت .

**١٤٧** - حرب بن إسماعيل الكرماني ووتی : ووتم بە إسحاق واتە : ابن راهويه، واتای ئەم ووتەیە چیە : با یەکێک لە ئێوە إمعة نەبێت؟ - واتە ئەو کەسەی لەسەر بیر و بۆچونی کەسێکی ترە و کوێرانە شوێن کەسانی تر دەکەوێت، والله اعلم - .

ووتی : دەڵێت : ئەگەر خەڵکی گومڕا ببن منیش گومڕا دەبم، وە ئەگەر خەڵکی هیدایەت وەرگرن منیش هیدایەت وەردەگرم .

**١٤٨ \ ٦٨٧** - قال حرب : قلت لإسحاق : الرجل يقول للمشرك : إنّه رجل عاقل.

قال لاينبغي أن يقال لهم، لأنَّهم ليست لهم عقول .

**١٤٨** - حرب ووتی : ووتم به إسحاق : پیاو به موشریک دەڵێ : بەڕاستی پیاوێکی عاقڵە .

ووتی : نابێ وا بووترێ پێیان، چونکە بەڕاستی ئەوان عەقڵیان نییە .

**﴿اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ, كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ, إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ, اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ, إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ﴾**

الحمدلله کۆتایی هات

https://t.me/KitabSalaff

ئیمام حرب الكرماني رحمه الله ئەڵێت :

الله ڕەحم بكات بە بەندەیەک کە بە حەق قسە بکـــــات، وە شوێن أثــر بکـــــەوێت، وە دەستبگــرێت بــە سوننەتەوە، وە صالحین و پیاو چاکان بکاتە پێشەنگ و قدوە، وە خۆی لابدات لە ئەهلی گومڕایی، وە وازبهێنێت لە دانیشتن و قسەکردن لەگەڵیان، وەک احتساب و داواکردنێک بۆ نزیکبوونەوە لە الله عزوجل و ڕێزلێگرتنی دینەکەی، وما توفيقنا إلا بالله .